کتێبی ژمارە (17) لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی نوێ

# مەملەکەتی شەیتان

## کتێبی سێیەم

نوسینی: ماکوان کەریم

٢٠٢٠

کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە

ناوی پەرتوك:
مەملەکەتی شەیتان-کتێبی سێیەم
نوسەر: ماکوان کەریم
پێداچونەوە و خاڵبەندی: شەوبۆ جلال
هەڵەبڕ: عبدالله ئازاد
دیزاینەر: ئیبراهیم ساڵح
بڵاوکار: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
چاپخانە:جەنگەڵ ، تهران
نرخ: ٤٠٠٠
تیراژ: ١٥٠٠
چاپی یەکەم: ٢٠٢٠




ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە
گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٨٤)ی
ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە.

**ئەگەر خوداوەند تۆوی ئارەزوویەکی لە دڵت دا ڕواند،**
**دڵنیابە توانایی بە دەست هێنانی ئارەزووەکەشی پێ بەخشیویت!**

پێشەکی و وەبیر هێنانەوەیەك:
بەناوی ئەو خوایەی کە هەورێك دەگریەنێت، تا خونچەیەك پێ بکەنێت

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار کە کتێبی سێیەمی مەملەکەتی شەیتان بە کۆتا گەیشت و کەوتە بەردیدی خوێنەرانی.
مەمەلەکەتی شەیتان زنجیرە کتێبە و لە ئێستادا سێ کتێبی لێ چاپ کراوە و بە پشتیوانی خوای گەورە کتێبەکانی تریش چاپ دەکرێت ئەگەر تەمەن باقی بێت.
کتێبی مەملەکەتی شەیتان یەکێکە لە کتێبەکانی نوسەر ماکوان کەریم، کە ئەم شاکارەی یەکێکە لە شاکارە نایابەکانی و خوێنەرێکی یەکجار باشی هەیە و خوێنەرانی بە پەرۆشەوە چاوەڕێی چاپی ئەم کتێبەیان کردووە.
ئامانجی نوسەر لە نوسینی ئەم پەرتوکە ئەوەیە کە چەواشەکاری و درۆو خورافیات لە سیحر و جادوبازی و کاری شەیتانەکان جیا بکرێتەوە.
لە کتێبی یەکەمی مەملەکەتی شەیتان دا نوسەر زیاتر باسی ئەو ڕوداوانە دەکات کە چۆن ئاشنا بووە بە جیهانی جنەکان و چۆن پەیوەندی دروست بووە لە نێوانیان دا.
لەبەشی یەکەم دا ئێمەی خوێنەر ئاشنا بووین بە شێوازی چونە ناو لاشەی جنەکان و چۆنێتی دەرهێنانی، هەروەها باسێکی کورتی ئەو گروپ و ڕێکخراو و مەزهەبانەی کە لە پەرتوکەکەدا ناویان هاتووە ڕونبکاتەوە و فێرمان بکات ئەوانە کێن و خەریکی چین لە ڕابردوو ئێستاشیان دا.
لەوبەشەی کەباسی جنۆکەو چوونە ناولاشەی مرۆڤ دەکات، نوسەر هەوڵی داوە زانستیانە و واقیعیانە لەڕووی مەیدانیەوە کە خۆی ئەزمونی هەبووە تێیدا و ڕاوبۆچونی زانایان و پسپۆرانی لەسەر وەرگیراوە و گونجاوە لەگەڵ قورئان و سونەتدا باس بکات.
لە کتێبی دووەمی مەملەکەتی شەیتان دا نوسەر هەوڵی ئەوەی داوە کە جۆری سیحر و جادوو ڕوونبکاتەوە و شێوازی بەتاڵ کردنەوەکەی باس بکات، تا خوێنەر سودی لێ ببینێت و لەڕووبەڕووبونەوەی هەر حاڵەتێکی لەو شێوەیەدا بزانێت چۆن چارەسەری بکات.
لەم کتێبەی کە ئێستا لەبەردەستی خوێنەراندایە نوسەر هەوڵی تەواوەتی داوە کە ئەو کەموکوریانەی لە کتێبی یەکەم و دووەمدا هەبووە پڕ بکاتەوە و

واقیعیانە تر و زیاتر لە ڕووی مەیدانیەوە کە خۆی بەشێك بووە لە ڕوداوەکان و نیشانەکان و شێوازی چونە ناولاشەی جنەکان و دەرهێنانیان و ئەو ئەزێت و ئازارەی کە مرۆڤەکان دەیبینن بە دەستی ئەوان ڕوون کراوەتەوە، هەروەها لەم کتێبەدا باسی ئەو کۆمەڵ و ڕێکخراوانە کراوە کە لەگەڵ جنەکان دا کار دەکەن و موسەخەریان کردوون بۆ ئیش و کاری مرۆڤەکان و زیاتر دەوڵەمەند کردنی سەرمایەدارە بەناوبانگەکانی جیهان و سیاسیەکان.

باران ئاریایی
فرێدریکستاد-نەرویج
١٦-ژانویە- ٢٠٢٠

پێشەکی:

بەناوی خودای گەورەو میهربان

لەوەتەی ئادەم دروستکراوە و پەیامی ئاسمانی پێ سپێردراوە، دوژمنێکی سەرسەخت بریاری دوژمنایەتی بۆ ئەو و نەوەکانی داوە، ئەویش شەیتانی نەفرەت لێکراوە!

ئەم زنجیرە ی بەردەستت یەکێکە لەشاکارە نایابەکانی مامۆستا ماکوان کریم، باس لەو ململانێ قوڵە دەکات کە لەم ژیانەدا بەشێوەیەکی بەردەوام لەئارا دایە .

یەكێك لەو باس وخواسانەی رۆژانە لەناو كۆمەڵگەدا جێگای مشت و مڕە ئەویش جیهانی نادیاری ( جن)ە، نوسەر بەزمانێكی ئەدەبی سادەو بەشێوەی ڕۆمانێكی واقیعی توانیوتی پەنجە بخاتە سەر ئەو دیاردەیەی لەكۆمەڵگەدا بەشێوەیەكی بەرچاو ڕەنگی داوەتەوە .
جیهانی جن چییە؟ دەسەڵاتیان لەسەر مرۆڤ چەندە؟ لەچ كاتێك دەتوانن كار لە بڕوادار بكەن؟ مرۆڤ چۆن دەتوانێ رووبە ڕووی پیلانەكانی شەیتان ببێتەوە؟
وەڵامی ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری تر لە خوێندنەوەی ئەم كتێبەدا بەردەست دەكەوێت. جێگای داخە خەڵكانێك ئەو بابەتانەیان بەجۆرێك وێنا كردووە، لەلایەك هۆكارێكە بۆ دەستخستنی سەروەت و سامانێكی زۆر، لەلایەكی تر بووەتە هۆی ترس و تۆقاندنی خەڵكێكی سادەو بێئاگا، ئەوەندە بەسە بەكەسێك بڵێی جن چووەتە ناو لەشت بۆ ئەوەی كێشەو نەخۆشییەكانی چەند جار ببێتەوە، بۆیە لەم كتێبەدا خوێنەر ڕۆشنبیرییەكی تەواو وەردەگری بۆ ئەوەی نەكەوێتە فێڵ و تەڵەكەی ئەو كەسانەی چەواشەی كۆمەڵگە دەكەن و بەدوای كۆكردنەوەی سەروەت و سامانن و بەناوی ئاین .
لە كۆتاییدا هیواداریین نوسەر بەردەوام بێت لەنوسینی ئەو جۆرە كتێبانە، وە بتوانێت خزمەتێكی زیاتر بەخوێنەرانی گەلەكەمان بكات، بەتایبەت نوسەر توانیویەتی شێوازێكی نوێ پیادە بكات بۆ گەیاندنی پەیامی پیرۆزی ئیسلام، بەهۆیەوە بەتایبەت توێژی گەنج زۆر تامەزرۆی بەرهەمەكانی بن و بەردەوام لە چاوەڕوانی نوسراوەكانی دا بن.

كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی
هەولێر_ كوردستان ١٣_١_٢٠٢٠

## ماكوان و نوستراموس

لە ئەڵمانیام بە خاولیەكەوە لە هوتێلدام، دوای ئەوەی كە خوا حافیزیم كرد لە شێخ برقان چوومە دەرەوە لە شاری نۆیس بۆ نان خواردن. لە نزیك

هوتێلەکەم دۆنەر کەبابێکی کوردەکانی تورکیای لێبوو بەناوی ئانا دۆنەر، منیش بەخۆشی ئانای کچم دەڕۆشتمە لای ئەوان، هەرچەندە ئاناکەی ئەوان مەبەستی دایك بوو.
لەکاتی نان خواردندا کۆمەڵێك پرسیار مێشکی وروژاندم وە بیرم لەوە دەکردەوە باشە ئەم جنۆکانە لەپڕ دێن و دەڕۆن، کێ ناڵێت برقان هەمان ویرسان نییە و حەزقیلیش سەسیل نییە؟
ئاخر خۆ من نان و پیازم لەگەڵ ئەم جنۆکانەدا نەخواردووە.
لەدڵی خۆمدا دەمووت خۆ ئەمانە برای باوك و ئامۆزام نین، باشە کێ ناڵێت حەنانە خودی شەیتان نییە؟ بەئارەزووی خۆیان شێوەیان بگۆڕنە سەر شێوازی یەکتر.
بە تەنها لەسەر شەقامەکانی نۆیس لە شاری ئەڵمانیا پیاسەم دەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە ئەم سەیارەی سورکێو لەپڕ سووتا و نەما، من چۆن دەمبینی و کابرای ئەڵمانی کە بۆی شەحن کرد ئەویش بینی، بەڵام دوایی لە پڕنەما! نە پۆلیس بینی نە من ئاسەوارێکم بینی، هیچ دیار نەما.
ئەوەندە بیرم کردەوە ناچار لەسەر لێواری شەقامەکان دانیشتم، خەڵکی وایان دەزانی سەرخۆشم.
ماوەیەك بێدەنگی ڕووی تێکردم و لە پشتی سەرمەوە گۆرانی و دەنگە دەنگ بوو منیش ڕۆچوو بووم لە بیرکردنەوە، کە ئاوڕمدایەوە تەماشا دەکەم دوو حۆری بەسەر سەرمەوەن.
لەدڵی خۆمدا ووتم: تۆ بڵێی مردبێتم، ئەم حۆریانە ئامادە کرابن بۆ من؟ زوو خۆم ناسی زانیم ئەوەندە کەسێکی باش و پاك نیم و بیرم هاتەوە ئەمانە جنۆکە نەبن دیسان هاتبنەوە لام؟
تەماشای دەستیانم کرد بیرە بەدەستیانەوە بوو وە جگەرەشیان دەکێشا و دوو بەدوو گۆرانیان دەووت، بەڵام تابلۆیەکی زۆر جوانی فاحیشە بوون.
ئای دڵ کە مایلی بۆ تاوان، جوانی ئەوان خەریك بوو سۆفیەتی و سەلەفێتی و هەموویم لە بیر بەرێتەوە، بە ئەڵمانی دایان بەیەکدا.
منیش بە ئەڵمانی ووتم: «ئیش نیش گود شپرێخن دۆیچ» دایانە قاقای پێکەنین و بەئینگلیزی دایان بەیەکدا، وەکو وابێت منیش برازای (تۆم کروزم).
لەدڵی خۆمدا ووتم: لە خوا بترسە! ناسکە ڕیشێکت بۆ خوا هیشتۆتەوە جێی بهێڵە و بگەڕێوە بۆ هوتێلەکە، یەکێکیش ئەچپێنێت بە گوێمدا و ئەڵێت: هوتێل کەسی لێ نییە هەرخۆتی، بانگێشتیان بکە بۆ ئەوێ کێ ئاگادارە! سەیری ئەو جوانی و لاشە و دەم چاوە و ناسکەیان بکە، بۆ ئەو ڕزقە لەدەست خۆت دەدەیت!
لەلایەکی ترەوە دەیان چپاند بەگوێمدا دەیووت: لە خوا بترسە تۆ لای خۆی موسوڵمانیت و ناوت بە بانگخواز دەرکردووە، لەم هاتووچۆیەدا بووم لەگەڵ دڵ و ئەقڵ و ناخمدا، لەپڕ جێمهیشتن و سێ جار ووتم استغفرالله.

گەڕامەوە بۆ هوتێلەکە، بەڵام لەو کاتەوە بۆم دەرکەوت کە تەنهایی بەشێکی گەورەیە لە خودی شەیتان، بۆیە مرۆڤ پێویستە هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵ و خێزان و کەسوکاریدا بێت و هەوڵنەدات بۆ تەنهایی.
گەڕامەوە بۆ هوتێلەکە داوای قاوەیەکم کرد لە پرسگە لەوکاتەدا کەسێك هاتە لام ووتی: یارمەتی هەیە دابنیشم، چونکە زۆربەی کورسیەکان گیراون؟
ووتم: فەرموو دانیشە!
کەسەکە دیار بوو خەڵکی ڕۆژهەڵات بوو! بە ئینگلیزی ووتم خەڵکی کوێیت؟
- خەڵکی عێراقم
ماکوان: کەواتە خەڵکی وڵاتێکین، منیش خەڵکی کوردستانم.
بە عەرەبی دەستمان کرد بە قسەکردن، کتێبێکی بەدەستەوە بوو دەیخوێندەوە، ئەویش داوای قاوەی کردبوو.
هەر کەس کتێبی بەدەستەوە بێت و خەریکی خوێندنەوەی بێت هەر کەسێک بێت زۆر ڕێزی لێدەگرم، سەرەتا قاوەکەیان بۆ من هێنا بۆیە بە سێرڤیتۆرەکەم ووت بیدە بەو من چاوەڕێ دەکەم.
بەتەمەن لە من گەورەتربوو زۆر خۆشحاڵی دەربڕی کە ڕێزم گرت و قاوەکەم پێدا، هەندێك موجامەلەی کردم و ووتی: پێویست ناکات چاوەڕێ دەکەم بۆم بهێنن، جەختم کرد هەر دەبێت بیخۆیت.
ووتی: ناوم موئەیەدە و خەڵکی بەغدادم و ماوەی چەند ساڵە لە ئەڵمانیام، لە عێراق ئەفسەری موخابەرات بووم، ئەمە یەکەم جارە لەگەڵ کوردێک دا دابنیشم و ئاوا ڕێزم بگرێت.
ماکوان: من ڕێزم گرتی لەبەر ئەوە نەبوو کە عەرەبیت، وە نە لەبەر ئەوەش کە زانیومە ئەفسەری هەواڵگری عێراقی بوویت، بەڵکو ڕێزی ئەو کتێبەم لێگرتی کە بەدەستەوە بوو دەتخوێندەوە.
موئەیەد: دیارە حەز بە کتێب دەکەیت؟
ماکوان: زۆر
موئەیەد: زیاتر حەز بە خوێندنەوەی کام کتێب دەکەیت؟
ماکوان: مێژوو و فیکر .
موئەیەد: چییە کە وتم ئەفسەری هەواڵگری عێراق بووم هەستم کرد دەم و چاوت گۆڕا و سارد بوویتەوە لەگەڵمدا، وایە؟
ماکوان: بەدڵنیاییەوە وایە، خۆ ئەوەندە ناڕەحەتی و ئەشکەنجەمان بەدەست ئێوە چەشتووە خۆ بەنیاز نین فەرشی سورتان بۆ ڕاخەین، وایە؟
موئەیەد: بەشێك لە قسەکانت تەواون دڵنیام لەوەی کە گەلی کورد ئازاری زۆری چەشتووە بەدەست ڕژێمی بەعسەوە، بەڵام ئەوەش بزانە من دایکم کوردە و وەك تۆ کوردم خۆش دەوێت و هەست بەئازارەکانیان دەکەم.
ماکوان: ئەوەی ئێوە کردتان لە کیمیابارانکردن لە بالیسانەوە تاکو هەڵەبجە، ئەنفال و کۆمەڵکوژی دنیاتان کرد، تازە باسی ئەوە دەکەیت کە کوردت خۆش دەوێت؟

موئەیەد: ڕوا بکە لە ناڕەحەتیەکانت تێدەگەم، بەڵام ئەوەش بزانە گەلانی عێراق هەر هەمان دەرد و ناسۆری کوردیان هەبووە.
ماکوان: چاکەتان کەمە بەسەر کوردەوە بۆیە ناڕەحەتین لە دەستان.
موئەیەد: حەز دەکەم ئەم کتێبەی دەستی خۆمت پێشکەش بکەم وەك یادگاریەك لە نێوانماندا هەبێت.
ماکوان: بەخۆشحاڵیەوە زۆر سوپاس بۆ دیاریەکەت.
موئەیەد: ئەم کتێبە باسی پێشبینی و پێشگۆیەکانی نوستراداموس دەکات، کتێبێکی زۆر باشە هیوام وایە سودی لێوەربگریت و لەسەر کتێبەکە دەنوسم دیاری منە بۆ جەنابتان.
ماکوان: زۆر سوپاس بۆ دیارییەکەت دووبارە بەدڵنیاییەوە هەر سودی دەبێت، بەڵام ڕوام بەو قسانەی نوستردامۆس نییە بەهیچ شێوەیەك.
موئەیەد: چۆن وادەڵێیت؟ پێشبینی زۆر سەرنج ڕاکێشی کردووە، بۆ نموونە باسی جەنگی کوێت و عێراقی کردووە، باسی ١١ی سێپتەمبەری کردووە، باسی لاوازی بەریتانیای کردووە، باسی جەنگی جیهانی سێیەمی کردووە، هەروەها باسی جەنگی جیهانی دووەم و باسی هیتلەریشی کردووە.
ماکوان: باوەڕناکەم وابێت! ئەم کتێبە لە چ زمانێکەوە وەرگێردراوە بۆ عەرەبی؟
موئەیەد: ئینگلیزی بۆعەرەبی، ئەو کەسەی وەریگێڕاوە ئەمریکیە.
ماکوان: باشە، بزانە لە پێشەکیەکەیدا لە کام زمانی ترەوە وەرگێڕدراوە؟
موئەیەد: لە پێشەکیەکەی نەنوسراوە.
ماکوان: ئەی لە کۆتاییەکەیدا بزانە هیچ نوسراوە؟
دوای کەمێك تەماشاکردن موئەیەد: هیچ نەنوسراوە.
ماکوان: جەنابت دەزانی کە میشێل نوستراداموس لە بنەڕەتدا خەڵکی فەڕەنسایە و کتێبەکەی لە شێوەی چوارینەدا داڕشتووە، کتێبەکەی ناوی سەدەکانە، بەڵام ئەم پەرتوکەی جەنابت ناوی سەدەیە، تەنانەت هەڵە لەناوی کتێبەکەیدا کراوە، ئاخۆ ناوەرۆکەکەی چۆن دەستکاری کرابێت بۆ بەرژەوەندی موخابەراتەکانی جیهان.
موئەیەد: جا ئەمە چ پەیوەندیێکی هەیە بەسەر کاری موخابەراتیەوە؟
ماکوان: بەلامەوە سەیرە خۆت لەو خەتە کارت کردیێت و وا بەمن بڵێیت یاخود لە قسەکانم تێنەگەیت، لە کاتێکدا دەزگاو ئاژانسە هەواڵگریەکان چەندین کەسایەتی مردوو زیندوو دەکەنەوە بۆ مەرامی سیاسی دەسەڵاتی خۆیان.
موئەیەد: مردوو زیندوو دەکاتەوە سەیرە قسەکانت، چۆن مردوو زیندوو دەکەنەوە؟
ماکوان: مەبەستم ئەوە نییە کە مردووەکە لەناو گۆڕەکەیدا زیندوو بکەنەوە، بەڵکو مەبەستمە بڵێم کە کەسایەتیەکانیان زیندوو دەکەنەوە بۆ مەرامی خۆیان بەکاری دەهێنن، لە عێراق، ئێران، سوریا، میسر و زۆرێکی تر لە وڵاتانی جیهان. کاتێك بەریتانیا داگیر و ئیستعماری کردن ئەو کارەی ئەنجامداوە.

موئەیەد: بەڵێ، ئەوەی وتت ڕاستە لە سەدەی ڕابردوو زۆرێك لەو کەسایەتیانە کرانە بەری کۆمەڵە کەسانێك کە لە دەزگا و ئاژانسە هەواڵگریەکانی بەریتانیادا کاریان دەکرد، بۆ گەیاندنی پەیامی ئینگلیز و پاراستن و سەقامگیری ناوچەکان، نازناوی شێخ و پیاوانی ناوداری کۆمەڵایەتی سیاسیان بەکاردەهێنا، بەڵام ئەمە چ پەیوەندیەکی هەیە بە نوسترادامۆس؟
ماکوان: بەلامەوە جێگای سەرنجە کە کتێبی ئەو دەخوێنیتەوە پیشەکەشت کاری هەواڵگری بووە، بەڵام دەڵێیت پەیوەندی نییە!
بەهەرحاڵ شیکاریەکت بۆ دەکەم لەسەر دکتۆر میشێل نوسترادامۆس کە لەبنەڕەتدا خەڵکی فەڕەنسایە لە ساڵی ١٥٠٣زاینی لەوێ لەدایك بووە و لەساڵی ١٥٦٦زاینی کۆچی دوای کردووە. لە ساڵی ١٥٤٦زاینی نەخۆشی طاعون ڕوویکردە ئەو وڵاتە و خەڵکێکی زۆر لە ناوچوون، میشێل نوسترادامۆس لە هەوڵی ئەوەدابوو کە دەرمانێك بدۆزێتەوە بۆ لەناوبردنی ئەو نەخۆشیە کوشندەیە، بەڵام بەداخەوە نەیتوانی تا کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی منداڵ و ژنەکەی لەبەرچاویدا بەو نەخۆشیە مردن. پاشان لە وڵاتی فەڕەنسا و بەگشتی لە ئەوروپادا بڵاوبوویەوە کە جولەکە گەلێکی مەلعون و پیسن، پێویستە دەربکرێن تا خودا و مەسیح چیتر ڕقیان لێ هەڵنەگرن.
ئەویش ناچار ماوەیەك خۆی شاردەوە تا ئەوکاتەی پاشای فەڕەنسا هێنری، بڕیاریدا جولەکەکان یان دەبێت ئەوروپا جێبهێڵن یاخود ببن بە مەسیحی یان دەکوژرێن. نوسترادامۆس لە بنەماڵەیەکی جولەکە بوو ناچار بووە مەسیحی و ئاینی نەسرانی هەڵبژارد، وازی لە کار و پیشەی دکتۆری هێنا و بوو بەفاڵ گرەوە و عەڕاف و خەریکی پێشبینی و پێشگۆیی بوو بۆ خەڵك.
دووان لە پێشبینیەکانی ناوبانگێکی زۆری دەرکرد لە نێو خەڵکیدا، یەکێکیان ئەوەبوو کە بە شوانێکی وت کە ئەو دەبێتە پاپای کاتۆلیکەکان و هەموو پادشا و ئیمپراتۆرەکان کڕنوشت بۆ دەبەن، قسەکەی لەماوەیەکی کورتدا هاتەدی.
ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی هێنری دووەم بانگی بکات و لێی بپرسێت دەربارەی ژیانی خۆی و وڵاتەکەی ئەویش لە وەڵامدا وتی: بەدەست سەربازێکی خۆت دەکوژرێیت و دەسەڵاتەکەت دەبات.
نیوەی پێشبینیەکەی ڕاست بوو.
موئەیەد: واتای چی کە نیوەی پێش بینیەکەی ڕاست بوو؟
ماکوان: واتا نیوەی هاتە دی، ئەویش ئەوە بوو کە لە ئاهەنگی بەشودانی کچەکەیدا لەکاتی یاریکردن سوارچاکی و ڕم بازیدا بە هەڵە ڕمێك بەر چاوی هێنری دووەم دەکەوێت کاریگەری لە سەر مێشك و مۆخی دروست دەکات و پەکەوتە دەبێت و دەمرێت.
ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی زیاتر ناو و ناوبانگی دەرکەوێت، پاشان گەڕانێکی زۆر بەناو وڵاتانی ئیتالیا و یۆنان و تورکیادا گەڕا، زۆرێك لە قوتابخانە کۆنەکانی ئەو سەردەمەی بەسەر دەکردەوە، توانایەکی زانستی زۆر باشی هەبوو لە

بوارەكانی پزیشكی و ئەندازیاری و گەردوناسیدا. ئەو كتێبەی كە نوسی زۆربەی زۆری لەسەر بوارەكانی ئەو سەردەمەدا نوسی، بەڵام لە دوایدا لە هەر سەردەمێكدا تەفسیر و شیكردنەوەی جیاوازیان بۆ دەكرد، لەڕاستیشدا جێی گومانە كتێبێكی لەم شێوەیە لە زانكۆكاندا هیچ گرنگیەكیان پێنەدابێت.

موئەیەد: هەر بۆم ڕوون نەبوویەوە بۆچی لە پێشبینیەكانی درۆیە ڕاستی تێدا نییە؟

ماكوان: وابزانم بەڕێزت دەرەنگ تێدەگەی، پێویستت بەڕوونكردنەوەی زیاترە، گەڕۆكی ئەو زانایە و ناڕەحەتی و ئەشكەنجە و ناسۆری زۆر توانایەكی پێبەخشیووە، ئەمەش بووەتە هۆكاری ئەوەی كە بتوانێت بنوسێت و بدوێت لە بوارەكاندا.

موئەیەد: بۆ هەر كەس ناڕەحەتی و ئازارو ئەشكەنجە بچێژێت زیرەك دەبێت؟

ماكوان: بەدڵنیاییەوە بەتوانا و زیرەك دەبێت، حاڵەتی دووەمیشت بۆ باس دەكەم، دەشێت پەیوەندی لەگەڵ جن و شەیتانەكاندا هەبووبێت و تا ڕادەیەكی باش توانیبێتی هەندێك كاری سیحر و جادوو ئەنجام بدات و خەڵكی زیاتر باوەڕی پێبكەن، هەردوو بوارەكە بوونیتە هێزیك زیاتر ناوی بۆ دروست كردبێت، چونكە لەڕاستیدا كتێبەكەی هیچ سەرنجڕاكێشانی تێدا نییە، بۆ نموونە لە كتێبەكەیدا بەناوی سەدەكان (Centuries) بەهیچ شێوەیەك باسی ١٠٠ ساڵ ناكات، بەڵكو باسی سەد چوارینەی شیعری دەكات یاخود لە باسی هێستر (Hester) بەمانای هیتلەر لێكدراوەتەوە، كە لەڕاستیدا ئەو مەبەستی پادشا ناسكەكانی ئەوروپای شەرقی بووە، یاخود هەموو ساڵێك لە مانگی دوانزەدا یادی لە دایكبونی دەكەنەوە و پێشبینی ساڵ بەساڵی دەخوێننەوە، لەكاتێكدا هەموو كتێبەكەی پێك هاتوە لە ١٠٠٠ چوارینەی شیعری كە بە ١٠ سەدە جیای كردۆتەوە، دەڵێن گوایە باسی ساڵەكانی ٣٠٠٠ی كردووە و دونیا كۆتای دێت، لە ساڵی ٢٠١٢ یەكێك لە پێشگۆیەكانی ئەوە بووە كە دونیا كۆتای دێت، یاخود لەم ساڵەی كە من و تۆی تێدا دەژین ساڵی ٢٠١٧ جەنگی جیهانی سێیەم ڕوو ئەدا بۆ ماوەی ٢٧ ساڵ درێژە دەكێشێت، كە هەمووی درۆ دەرچوو هیوام وایە تێگەیشتبێتی.

موئەیەد: تاڕادەیەك قسەكانی جێگای پروا پێكردنە، واتا مەبەستت ئەوەیە كە ئەمانە زۆربەی دروستكراوە بەناوی نوستراداموس و خۆشی بەشێك لەو توانایەی هەبووە، بۆیە زانیارییەكان بەناویەوە كراوە.

ماكوان: بەڵێ بەدڵنیایەوە، چونكە جگە لە كتێبی سەدەكان خاوەنی چەند كتێبێكی پزیشكی و دەرمانسازیە و هاتۆتە وڵاتی ئەندەلوس لە قورطوبە لەگەڵ زاناكانی ئەو سەردەمەی موسوڵماناندا ژیاوە و لە زانكۆی قورطوبە خوێندویەتی. كەسێكی بەتوانا بووە، لە كۆتای تەمەنیدا كە ژنێكی بێوەژنی خاوەن شەش منداڵی هێناوە زۆر دەوڵەمەند بوو لەدوای ماوەیەكی زۆر محاكمی تەفتیش بە شوێنیەوە بوون توانی خۆی بەوە دەرباز بكات كە ووتی

من سیحر ناکەم، بەڵکو لە ئینجیل دەریدەهێنم و پەیوەندی هەیە بە حیساباتی ئەستێرەکانەوە.
موئەیەد: ئەی چۆن باسی سوتاندنی شاری لەندەن دەکات و لەهەمان کاتدا شاری لەندەن دەسوتێت؟!
ماکوان: پێم وایە فەڕەنسییەکان هەمیشە دژایەتی ئینگلیزیان دەکرد، لێرەدا بەهۆکاری ئەو جەنگ و ئاژاوانەی کە ڕوویداوە لە نێوانیاندا هەمووی بە شێوازی تانە و تەشەر و زیاتر لە شێوەی ڕق لێبونەوە نوسراوە پاشان تەفسیرکراوە لەگەڵ واقیعەکەدا.
موئەیەد: شۆڕشی فەڕەنسا کەباس دەکات دژی کڵێسا ئەی بۆ ئەوەیان چی دەڵێیت؟
ماکوان: هەر ئەوە دەڵێم کە نوستراداموس ڕەوشە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکەی خوێندبووەوە، کە وورده وورده خەڵك دژی کڵێسا و بەگزادە و پاپاکان بوو، ئیتر پێشبینیەکی سیاسی ناکەتە ئەوەی ئەم کەسە زانستی پەنهانی زانیبێت (علم الغيب).
موئەیەد بێدەنگبوو، چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کتێبکەم پێ بدات و بڕۆم، چونکە خەوم دەهات و ماندوو بووم، بەڵام دۆش دامابوو منیش سەرم بەسەر تەلەفونەکەم دا شۆڕکردەوە، لەپڕ دوو کچە جوانە ئەڵمانیە سەرخۆشەکە خۆیان کرد بەناو هوتێلەکەدا و ڕووە و موئەید هاتن و بەئەڵمانی دەستیان کرد بە قسەکردن.
ڕووی تێکردم و ووتی: ماکوان وەرە ئەمانە میوانی منن دەچینە ژورەکەی من، من هەر خۆمم و ئەوانیش دوانن با ئێمەش ببین بە دووان.
ماکوان: ببورە من خاوەن ماڵ و خێزانم و کاری واناکەم.
موئەیەد: منیش خاوەن ماڵ و خێزانم، خۆ لێرە نین وەرە سەرەوە.
ماکوان: ئەی خودای پەروەردگار و ئیسلام ؟ زینا ناکەم ببورە.
موئەیدە: یەك تەوبەیە و پاك دەبینەوە!
ماکوان: گرەنتی ژیانم ئەدەیتێ تا فریای تەوبە دەکەوم؟
موئەیەد: بڕۆ کاتی ئەوە نییە، حەز دەکەم دەعوەتی من بیت.
ماکوان : ببورە من ئەو کارە ئەنجام نادەم و تۆش ئەگەر موسوڵمانیت لە خوا بترسە!
هەڵسام جێمهێشتن و هاتمەوە ژورەکەی خۆم، دەست بەجێ دەستنوێژێکم هەڵگرت و چوومە سەر بەرماڵ بۆ ئەوەی شەیتان هیچ مەجالێکی لە دڵ و دەروونمدا نەمنێت.
دوای تەواو بوونم لە نوێژ دیسان خۆم سەرقاڵ کردەوە بە تەلەفونەکەمەوە لە پڕ لە دەرگا درا
ووتم کێیە و چیت دەوێت؟
دەنگەکە: ماکوان من موئەیەدم دەرگاکە بکەرەوە.

# کۆبوونەوەی جنۆکەکان لە هوتێل ئێمپایەر

لەدەرگا درا چووم کردمەوە موئەیەد بە شۆرتێکەوە وەستابوو لەبەر دەرگای ژوورەکەمدا و وتی: حەز دەکەم بێیت بۆ لامان کچەکان داوات دەکەن.
ماکوان: باشە تۆ بڕۆ من جلەکانم دەگۆڕم و دێم بۆ لاتان لە کام ژووریت؟
موئەیەد: ژووری من سویت ڕوومە ژمارەی نییە، تایبەتە لەنهۆمی کۆتاییە لەسوچەکەدایە، کە تەواو بوویت پاش چەندی تر دەڵێیت خۆم دێمەوە بە شوێنتا.
ماکوان: زۆر باشە دوای ١٠ خولەکی تر وەرەوە بە شوێنمدا.
دەست بەجێ جلەکانم گۆڕی و ڕۆشتم بۆ پرسگەکە و پێم ووتن کە چۆن ژمارەی ژووری من ئەدەن بەخەڵکی تر بەبێ ئەوەی من بناسێت؟

ئەو کەسەی کە لە پرسگەکە بوو وتی: شتی وا ڕووی نەداوە ناوی تۆ نەدراوە بەکەس لای ئێمەوە نەبووە، دواتر گومانم بۆ ئەوە چوو کە ژمارەی ژوورەکەمی بە کلیلەکانەوە بینیبێت.
لەسەرکەوتنم بۆ ژوورەکەم بیرم کەوتەوە کە کلیلەکانم پێ نەبووە، ئەو پێش من هەڵساوە من دوای ئەو کلیلەکانم وەرگرتووە، کەواتە ئەمە نهێنیەکی تێدایە.
گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم و وام دانا کە ئەگەر بێتەوە بەدوامدا لێی ئەدەم. چاوەڕێم دەکرد بێت بەڵام ١٥ خولەك تێپەڕی و دیار نەبوو، چوومە دەرەوە بۆ ناو کۆری دۆرەکە و لە صالۆنەکەیدا پیاسەم دەکرد چەند خولەکێکی تر چاوەڕێم کرد نەهات، گومانەکەم زۆرتر بوو.
گەڕامەوە ژوورەکەم تەماشام کرد حەزقیل دانیشتووە!
لەخۆشی حەزقیل هیچم بیر نەما وتم: حەزە گیان چۆنی، دەنگوباستان، بیستوومە برینداری، خۆ وتیان ناتوانیت هەڵسیتەوە چۆن هاتوویت بۆ ئێرە؟
شێخ برقان پێی ووتم کە نایەینەوە بۆ لات بەم زووانە ئیتر بێ هیوابووم لە دیدارتان.
حەزقیل: وەڵڵا ماکوان ئەوە شێخ لێرەیە و سەسیل و هەمووومان هاتووینەتەوە لات. هەر وای وت شێخ برقان وتی کاکە باشی؟ السلام علیکم.
ماکوان: وعلیکم السلام باشی یاشێخ گیان، خێر چی بووە خۆ هیچ ڕووینەداوە؟
شێخ برقان بەتووڕەیەوە قسەی لەگەڵم دەکرد: چۆن ڕووینەداوە! ئەوەی پێم ووتی نەتکرد، تەنانەت لەماوەیەکی کەمدا لەبیرت چووە.
ماکوان: هیچ نازانم ئاگام لە هیچ نیە.
سەسیل خۆی دەرخست وتی: ماکوان ئەی خەریکبوو تێکەویت لەگەڵ ئەو دوو ئافرەتە و موئەیەدا.
ماکوان: ئەو دوو ئافرەتە ئەڵمانیە کێن و چین؟ موئەیەد کێ بوو؟
شێخ برقان: ئەوانە  لە جەماعەتی ویرسانن کە تۆ لێت ببوون بە حۆری، موئەیەدیش جنێکی ترە ناوی (ئەعور)ە لەگەڵ ویرسان ئیش دەکات، ویستیان تۆ بخەنە تاوانەوە بە ئاسانی دەست بگرن بەسەرتد بۆ زانیاریت بە کامێرەی ڤیدۆش وێنەکەیان نیشانی خۆت ئەداو دەیانکردە ماڵ بەسەرتەوە.
ماکوان: جا شتی وا چۆن دەکەم کە هات بە شوێنمدا بۆ ئەوە خۆم ئامادە نەکرد بڕۆم، بەڵکو بۆ ئەوە بوو لێی بدەم سەروچاوی هەر لە (دەیوث) دەچوو ڕقم لێی بوو.
حەزقیل: کوا کتێبەکەی؟
ماکوان: ئەوەتا خستمە ئەو چەکمەجە.
حەزقیل: نیشانمان بدە؟
ماکوان: هەڵسام چەکمەجەم کردەوە هیچی تێدا نەبوو!

ئەوە چییە نەماوە!
حەزقیل: ئەوە تەلیسم بوو، ئەو تەلیسمەی بەناوی ئەو کتێبەوە ویستی پێتی بدات، هەمووی هاندانی مرۆڤە بۆ کاری فاحیشەو سێکسی.
ماکوان: بەخوا حەزەی برام ئەگەر بڵێم دڵم نەجولاوە درۆ دەکەم، بەڵام سوپاس بۆ خوا خۆڕاگر بووم هەر بەخەیاڵشمدا نەهات.
سەسیل: ئاگادار بووین بە تواناکانت، ئەوە زیاتر کاریگەری دەست نوێژەکەت بوو دەنا زۆر فێڵبازانە و بە پلانێکی نوێ هاتنە لات.
ماکوان: کورە سەسیل کچەکان زۆر جوان بوون، ئەم هەموو جوانە لەکوێ بوون لای ئێوە؟
سەسیل: ئەو دوو کچە مرۆڤن ٦ ساڵ لەمەوبەر مردوون لاشەکەیان بە کاردەهێنن.
ماکوان: باش بوو ئەم قسەیەت کرد، شتێکم بیرهاتەوە چۆن بزانم ئێوە خۆتانن و ئەوان نین؟ گرەنتی چیە بۆ ناسینی تۆ و حەزەی برام و شێخ برقان و ڕاقی...هتد.
شێخ برقان: ئێمە ناتوانین هەموو کات، یاخود هەر کاتێك بمانەوێت خۆمان بگۆڕین لەسەر شێوەی تر بۆ جۆرە شێوەیەکی جیاواز، سەرەتا چۆن خۆمان بە تۆ نیشانداوە هەر بەو شێوەیە دەمێنینەوە، خوای پەروەردگار هەر لەسەر ئەو شێوەیە ڕێگای پێداوین کە یەکەم جار خۆمان نیشان ئەدەین دواتر ناتوانین بیگۆڕین.
ماکوان: یاشێخ ئەشێت خۆتان نیشان بدەن لەسەر شێوەی ئاژەڵ وایە؟
شێخ برقان: بەڵێ دەشێت، بەڵام موسوڵمانەکانمان ئەوە ناکەن، زیاتر یەهودی و ئەوانەی کەپاسەوانی دەکەن لاشەیان زۆر جار وەك مرۆڤە و سەریان وەکو تانجی و سەگ، یاخود بە لاشە وەك مرۆڤ بەسەر وەك تیمساح و مارمێلك وەکو مرۆڤیش قسە دەکەن و خۆیان نیشانی خەڵك دەدەن. بەیەك مەرج ئەوانە دەبینرێن، ئەو مەرجەش ئەوەیە ئەو کەسە خۆی مەسی جن بوویێت و جنۆکەکان چوبێتنە لاشەیەوە، ئەوانە دەستیان زۆر قورسە بۆ لێدان خوێن لە مرۆڤ دەهێنن!
ماکوان: چۆن دەتوانن لە ئێمەی مرۆڤ بدەن؟
شێخ برقان: هەموویان ناتوانن لە مرۆڤەکان بدەن تەنها لەو مرۆڤانە ئەدرێت کە مافیان دەخۆن، یاخود پاسەوانی گەنجینەیەك یان ئاسەوارێکن، یاخود هەر شتێکی گرانبەها کە زیاتر یەهودیەکان خاوەنی بن، یان ساحیرەکان و جنەکان و ئەوانەی خەریکی کاری سیحرن بۆیان دەپارێزن، هەر مرۆڤێك لە کاڵای ئەو مرۆڤە یەهودی و جادووبازانە نزیك بێتەوە خراپ ئازاری ئەدەن.
ماکوان: شێخ زۆر جار پرسیان پێکردووم کە هەندێك ئاسەوار هەیە دەیانەوێت دەربهێنن بەتایبەت لە ئێران و عێراق و ئەفغانستان، ئەوانیش هەمان قسەی جەنابتیان کردووە و دەڵێن کە دەچینە ناو گەنجینەکە

یەکسەر پیاماندا دەکێشن و خوێنێکی کڵۆ کڵۆ لێمان دێتە دەرەوە یاخود دەکێشن بەسەرماندا.
کۆمەڵێك ئەفغانی پەیوەندیان پێوە کردم کە زیاتر لە ١٠٠ پارچە ئاڵتونی شاهەنشاهی بوو لە ئەفغانستان، وتیان: ناتوانین دەری بهێنین منیش هەرئەوەندەم زانی کە پێم وتن، بەڵام چارەیان نەما هەر نەیانتوانی دەریبهێنن تا وازم لێهێنان هیچ چارەیەکم بۆ نەدۆزرایەوە.
شێخ بەرقان: ئەگەر پێت خۆشە هاوکاریت دەکەین سودێکی لێ وەرگرە وەکو ماددی چارەسەری دەکەین بۆیان.
ماکوان: جا پەلە مەکە با تەلەفونێکیان بۆ بکەم بزانم هەر ماون یان نا؟
شێخ برقان: شوێنیان بزانە، سەسیل با بڕوات لەگەڵ ڕاقی هاوکاریان بکەن!
ماکوان: تەلەفۆنم کرد بۆ کەسێك بەناوی ئاغا ئەشرەف، دوای هەواڵ پرسین لێم پرسی چیتان کرد بۆ کارەکەتان گەنجینەکەتان دەرهێنا؟ هەڵبەت بە فارسی قسەمان کرد ئەوان زمانیان دەرییە نزیکە لە زمانی فارسیەوە.
ئەشرەف: نەوەڵڵا کاکە ماکوان دوو کەسمان زۆر ئازاری پێگەیشتووە وازمان لێهێناوە، بەڵام جێگاکەمان بەکەس نەوتووە لەبەر حوکومەت، چونکە بزانێت خۆی دەیبات و مەترسیداریشە. ئەوە کاکا الله بەخش و کاکا ئیقباڵ دەیانەوێت قسەت لەگەڵ بکەن.
ماکوان: با بفەرمون لەخزمەتیاندام.
دوای هەواڵ پرسین الله بەخش: کاکە ماکوان چووینەتە لای هەرچی ساحیر و شێخ و مەلا و سۆفیە هیچیان بۆ ناکرێت، ئێمەش یەك دێهاتین لەو ناوچەیەدا زۆر دەست کورتین من خۆم ئاڵتونەکانم دۆزیەوە، ئیقباڵ جنسیەی فەڕەنسای هەیە هەر دەری بهێنن ئەینێرم خۆت بیفرۆشە و شەریك بە لەگەڵماندا.
ماکوان: باشە بەسەرچاو، مادام بۆ خەڵکی هەژار و کەم دەرامەتە من پارەشم بەرنەکەوێت کارەکەتان هەر بۆ دەکەم بە پشتیوانی خوا.
ناوی ناوچەکەتان چیە؟ با هەندێك جنۆکەی هاوڕێم بنێرم بۆ لاتان، با ئەوان سەیری بکەن و دواتر دێنەوە قسە و باسی لەسەر دەکەین.
الله بەخش: ئێمە لە بادغیس-ین لە ناوچەیەك نزیکە لە قەڵای ئانو، دێکەمان ناوی برادوە.
ماکوان: دەست خۆش نوسیم، ئاگادارت دەکەمەوە جارێ خواتان لەگەڵ.
ناونیشانم وەرگرت، خاڵە سەسیل بفەرموو وەکو ناڤیگراشن و گوگڵ بۆم ئاشکرا بکە چی لێیە.
سەسیل: ئاسانە، هەر شێخ برقان ئەمر بکات دەچم، پێویست ناکات ڕاقیش بێت خۆم دەچم.
ماکوان: نەوەڵڵا سەسیل تۆ زۆڵی با ڕاقی بێت لەگەڵتان دوای نەوەك تەماع بتگرێت و بچیت بیەیت بە ویرسان!

سەسیل: ئێمە وەك مرۆڤ تەماشا مەکە، چونکە خۆتان خیانەتکارن وادەزانن لە نێو ئێمەشدا کاری وا هەیە.
شێخ برقان: نا- دڵنیابە سەسیل پیاویکی باشەو تازە لێی مەترسە ماکوان.
ماکوان: یاشێخ ئەم سەسیلە داخی زۆری کرد بەدڵی مندا و ئازاری منی زۆرداوە بەدەست خۆم نییە نایەتە دڵمەوە، حەزەی برام زوو زوو فریام دەکەوت دەنا ئەم سەروگوێلاك سپیە منی دەخوارد.
شێخ برقان: عفا الله عما سلف، ئەوەی چوو بیری لێمەکەرەوە.
ماکوان: باشە با تاقی بکەینەوە بەم کارە بزانین بەجوانی دەیکات؟
حەزقیل: ماکوان کوا پیاوباشان هاوڕێکانی خۆیان تاقی دەکەنەوە؟
ماکوان: ئەمە چیە حەزەی برام فێری فەلسەفە بوویت.
سەسیل: ماکوان زۆر جار دەستم لێ پاراستووی، دەنا ئاسان بوو ئازاردانت.
ماکوان: ئەوە نیت، بۆ حەلاوی باسکە، فشە فش بەسەر مندا مەکە.
شێخ برقان: واز لەم قسانە بهێنن با بگەڕێینەوە، ماکوانیش ماندووە با بخەوێت.
ئەوان ڕۆشتن و دەست نوێژم هەڵگرت و سێ ڕکعات نوێژی ویترم کرد و خەوم لێکەوت بە ئارامی و زۆر ئاسودەیی.
بەیانی چوومەوە بەلای کاری خۆمەوە لە بازاڕ جوملەی نۆیس بەناوی ئیمۆتێکس خەریکی کڕینی جلو بەرگ و پێڵاو بووم بۆ دوکانەکەم لە نەرویج.
لەپڕ موئەیەدم بینی لای کەسێکی چینی کەلوپەلم دەکڕی دامنا و ڕووەو ئەو چووم بەتەمای پیاداکێشانی بووم لە دڵی خۆمدا ووتم: ئەگەر پۆلیسیش هات دەڵێم ویستوویەتی پارەم لێ بدزێت، هەر چاوم دەگێڕا خۆم لە کامێراکان بەدوور بگرم و بەرەو ڕووی ڕۆشتم لەپڕ نەما.
هیچم پێنەکرا تۆزێك بەدەوری خۆمادا هەڵسوڕام گەڕامەوە بۆ لای کابرای چینی، ناوەکەیم بۆ لەبەر نەدەکرا پێم دەوت جاکی شان، داوام لێکرد ئەو جلوبەرگانەی لێم کڕیویت، لە دوکانەکەت بمێننەوە، چونکە چەند ڕۆژی شەحنیان دەکەم بۆ نەرویج.
ماوەی دوو ڕۆژێك سەرقاڵ بووم بە کڕینی شتومەك، کاتیشم لەلایەن کۆمپانیای مارسێدیس بێنزەوە گرتبوو بۆ ئەوەی سەیارەکەم سەرڤیس بکەم.
چاوەڕێم دەکرد کارەکانم کۆتای بێت و بگەڕێمەوە بۆ وڵاتی نەرویج لەم کەین و بەینەدا بووم شەوێك لە پڕ گیزە و هاژەو هوژی حەزقیل پەیدابوو لەگەڵ سەسیل هاتنەوە بۆ لام.
حەزقیل: ماکوان جێگاکەمان دۆزیوەتەوە بیرێکە، دەزانین چی لێیە و کێن ئەوانەی خۆیان نیشان ئەدان و چۆن تەلیسماوی کراوە. هەوڵبدە کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکە، بەڵام بیکە بە مەرج بەسەریانەوە کە هاوکاری بانگەوازی ئیسلامی بکەن بە پارەکەی، یاخود ماڵی هەتیو و هەژاران تێر بکەن.
ماکوان: ئەوان وتیان گۆڕە، بیری چی و چۆن چارەسەریان بۆ بکەم؟

حەزقیل: جا گۆڕ یاخود بیر هەر ناوێکی لێدەنێن ئارەزووی خۆتانە، جێگاکە زۆر کۆنە وە کەرەستەی باشی تێدایە زۆرێك لە ساحیرەکان بەشوێنیدا دەگەڕێن. شەیتانەکانیش ئەوانەی کە بۆ کاری سیحر خۆیان تەرخانیان کردووە دایاناوە بۆ ئەو کەسانەی کە دەبنە ساحیر جێگاکەیان نیشان بدەن، لەو ناوچەدا کەسێکی وا ساحیری تێدا نییە بتوانێت بیهێنیت، بەڵام زۆر لە هیندەکان هەوڵیانداوە پڕۆن ئەوەندەی ئاگادارکراینەوە لە برا موسوڵمانەکانمان لەو ناوچەیە لەترسی ئەوەی ئەو ناوچە هەمووی موسوڵمانن و پابەندن بە دین بۆیە هیندەکان ناوێرن پڕۆن دەزانن ئەفغانەکان ئازاو بوێرن دەست ناپارێزن لە کوشتنی کەس بۆیە تەلیسماوی کراوە و هەندێك لە جنە شەیتانەکان پاسەوانی دەکەن.
ماکوان: چارەسەرەکەی چییە و دەبێت چی بکەم؟
حەزقیل: با شێخ برقان بێت ئەو چارەسەرەکەیت پێ دەڵێت.
ماکوان: ئەی ئێوە نایزانن؟
حەزقیل: با دەیزانین، بەڵام بێ پرسی ئەوکار ناکەین. خۆ تۆ ساحیر نیت تا کارمان پێبکەیت و ئێمەش داوای کوفر و شتی ناپەسەند بکەین، ئێمە بەیعەتمان داوەتە شێخ برقان لەقسەی دەرناچین، تۆش هاورێمانیت وەکو برا بەیەکەوە کار دەکەین.
ماکوان: دەی خۆ من بەیعەتم پێنەداوە تا پابەندبم بە بیعەتەکەمەوە، هەروەکو هاوڕێ و برای ئاینی مامەڵەی لەگەڵ دەکەم.
سەسیل: ئاخر خۆ بەیعەتی تۆ قەبوڵ نییە بۆ شێخ برقان، ئێمە ئەتوانین بەیعەت بدەین بە مرۆڤ، بەڵام لە ڕووی شەرعەوە دروست نییە مرۆڤ بەیعەت بدات بە جنۆکە.
ماکوان: سەیرە! هەرچەندە سەسیل کە تۆ قسە دەکەیت من تورە دەبم هەموو گیانم دەبێت بە بورکان، بەڵام قسەکەت سەرنج ڕاکێش بوو، ئەکرێت حەزەی برام ڕوونکردنەوەیەکم بدەیتێ، سەسیل تکایە قسە مەکە.
حەزقیل: ئێ ڕاست دەکات ئێوە خەلیفەن لەسەر زەوی خودای پەروەردگار خەڵات و شەرەفی ئەوەی بە مرۆڤ بەخشیووە سەردار و ڕێبەری مەخلوقاتەکانی تر بکەن، هەر ئەمەشە وای کردووە جنە شەیتانەکان ڕقیان لە ئێوەی مرۆڤ بێتەوە، ئەو ململانێ و جەنگەی ڕوودەدات لەو نێوانەدا ئیبلیس خۆی دانابوو بێتە خەلیفە و ئاوەدانی زەوی بکاتەوە خۆی لە ئێوە پێ باشتربوو فەرمانەکەی خودای پەروەردگاری شکاند.
سەسیل: ئەی نازانی جنۆکە هەموو کێشەی لەگەڵ مرۆڤ ئەوەیە.
ماکوان: با دەزانم، نەموت تۆ قسە مەکە؟
لەدوامەوە شێخ برقان پەیدابوو وتی: ماکوان هیچ شارەزایت هەیە لە کتێبی "بەلهان"ی عەبدولحەسەنی ئەصفاهانی؟
ماکوان: نەوەڵڵا شێخ ئەوە یەکەم جارە بیبیستم.

شێخ برقان: تەلیسمی ئەو گۆڕە بەو کتێبە کراوە پڕیەتی لە ئاڵتون و کەرەستەی زۆر گرانبەها لە جۆرەکانی گەوهەر و دوڕو زیو، نەخشی جوان لەسەر قاپ و قاچاخ و جلو بەرگ وە زۆر شتی گرانبەها، ئەگەر ئەوانە بگاتە ئەوروپا پارەیەکی خەیاڵی دەکات.
ماکوان: جا شێخ گیان بە ئێمە چی؟ نە دەست ئێمە دەکەوێت و نە کیسەشم بۆ هەڵدووریوە، وەکو کوردەواری لای ئێمە دەڵێن.
شێخ برقان: ئاسانە ئەوان ناتوانن لە ئەفغانستان بیفرۆشن، هەر دەیهێنن بۆ ئەوروپا کەسیش شك نابەن لە تۆ زیاتر بۆیان ساغ بکەیتەوە.
ماکوان: جا من چۆن ئەوکارە دەکەم یاشێخ ئەوە زۆر قەدەغە و یاساغە لە ئەوروپادا.
شێخ برقان: نا یاساغ نییە، لە بەلجیکادا کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرێت لە مەزاد دا، لەنەمسا و لە سویسرا لە ئەڵمانیاش.
ماکوان: ئەمە نوێ بوو بۆ من، پڕوام نییە شتی وا هەبێت.
شێخ برقان: وەرە با جارێ فێرت بکەم چۆن بەتاڵی دەکەیتەوە هاوکاریان بکە، ئەوکات خودای گەورە ئاسانی دەکات.
ماکوان: ناشێت شێخەی برام تەماعت تێیدا هەبێت؟
شێخ برقان: ڕاستی بەڵێ تەماعمان تێدا هەیە، ئەویش بۆ هاوکاری برایەکمانە بۆ ئەوەی پشتی بگرین چاوەڕوان دەکرێت زۆر ناڕەحەتی بەسەر بێت و ئازار و ئەشکەنجە و زەرەری زۆر بەسەریدا بێت.
ماکوان: ئەم برایەتان کێیە؟
شێخ برقان: ماکوانە
ماکوان:من؟
شێخ برقان: وەرە با فێرت بکەم و بەوانیش بڵێ.

## لەچاوەڕوانی هاتنی ئیقباڵ و سەلامو الله و ئاڵتونەکان

لەگەڵ شێخ برقان دانیشتم و یەکە یەکە بۆی شەرح کردم، هەندێکی پێشتر لەلایەن عەلی یەمەنیەوە خوای گەورە لێی خۆش بێت بۆم باس کرابوو، هەندێکیشیان نوێ بوون بۆ یەکەم جار بوو ببیستم.
فێری کردم بۆ ئەوەی دواتر من بەوان بڵێم و کاتێك دابنێین کە حەزقیل و سەسیل و ڕاقی هاوکاریان بکەن.
بۆ بەیانی تەلەفونم کرد بۆ الله بەخش و پێم ووت خۆتان حازربکەن تا فێرتان بکەم، با چەند خوێندەوارێکتان لەگەڵدا بێت و بینوسن بۆ ئەوەی زوو کارەکانتان ڕاپەڕێت و دوو جنۆکەش لە هاوڕێکانی خۆم دێن هاوکاریتان دەکەن، هەرچەند من نەموتووە ئەوان خۆیان بۆ هاوکاریتان دێن، چونکە کارکردن بە جنۆکە حەرامە، من نەموتووە پێیان بۆیە ڕوونی دەکەمەوە حاج الله بەخش بۆ ئەوەی وا تێنەگەیت کە من ساحیرم.
دوای سەعاتێك حاجی الله بەخش تەلەفۆنی بۆ کردمەوە: کاك ماکوان ئێمە ئامادەین.
ماکوان: زۆر باشە، هەوڵبدەن ئەوانەی کە دەچن بۆ ئەو جێگایە دەست بە دەستنوێژبن، هیچ جۆرە شتێکی ناشەرعیان پێنەبێت.
پاشان دوعاکە بخوێنن بەدەمی بیرەکەدا یان ئەشکەوتە یاخود گۆرە هەرچیەك هەیە بەم شێوەیە بیخوێنن بە دەرچەکەیدا، ئەگەر دووکەسیش بیخوێنێت ئەوا باشترە، لە دوانیش زیاتر بن هەر زۆر باشترە، بۆ زانیاریتان

ئەگەر ماڵێك جنی تێدابێت هەر هەمان کردار دەکرێتەوە، حاج الله بەخش هەوڵبدەن جوان بینوسن کاتم نابێت جارێکیتر بیڵێمەوە پێتان.
حاج الله بەخش: بڵێ بێخەم بە دووکەس دەنوسن.
ماکوان: سێ جار ئەم دوعایە بخوێنن بڵێن: ئەی جنۆکەو شەیتانەکان لەم ناوچەیە بڕۆن لێرە مەمێنن، داواتان لێدەکەم بەو پەیمان و وەعدەی کە لەنێوان ئێوە و جەنابی پێغەمبەر سولێمانی کوڕی پێغەمبەر داود "سەلامی خوایان لێبێت" بەرقەرارە و لەسەری ڕێککەوتوون نە ئازارمان بدەن نە بتانبینین تکایە دەرچن لەم ناوچەیە.
دەقەکەی بە عەرەبی بخوێنن باشترە، چونکە وەك شێوەی دوعا کراوە و هەموو جن و شەیتانەکان لێی تێدەگەن.
(يا معشر الجن أناشدكم بالعهد الذي أخذه عليكم سليمان بن داود إن لا تظهروا لنا ولا تؤذونا)
ئەم شێوەیە تاقی کراوەتەوە کاریگەری هەبووە، ئیبن قەیم ئاماژەی بۆ کردوە لە کتێبی (الوابل الصيب من الكلم الطيب)، ئەگەر چی فەرموودەکە شێخی ئەلبانی بە لاواز دایناوە بەم شێوەیە هاتووە (أخرجه أبو داود في "سننه" (٥٢٦٠) ، والترمذي في "سننه" (١٤٨٥)، والنسائي في "عمل اليوم والليلة" (٩٦٨)، وابن أبي شيبة في "مصنفه" (١٩٩١٤)، والطبراني في "المعجم الكبير" (٧٩/٧) ، والبيهقي في "الآداب" (٣٦٤) ، جميعا من طريق ابْن أَبِي لَيْلَى، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ، عَنْ أَبِيهِ : " أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، سُئِلَ عَنْ حَيَّاتِ الْبُيُوتِ ، فَقَالَ:( إِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُنَّ شَيْئًا فِي مَسَاكِنِكُمْ ، فَقُولُوا: أَنْشُدُكُنَّ الْعَهْدَ الَّذِي أَخَذَ عَلَيْكُنَّ نُوحٌ ، أَنْشُدُكُنَّ الْعَهْدَ الَّذِي أَخَذَ عَلَيْكُنَّ سُلَيْمَانُ ، أَنْ لَا تُؤْذُونَا !)
پاشان سێ جار بانگ بدەن لەو جێگایەدا ڕووە و قیبلە بوەستن ئەگەر بزانن قیبلە لە کوێوەیە.
ئاوی دەریا واتا ئاوی سوێر یاخود خوێی زبر لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بکرێت و لەگەڵ ئەو ئایەتانە کە ئاماژەی پێدەکەم بخوێنرێت بەسەریدا بیپرژێنن بە چواردەور و دەرگا و هەموو ئەو ناوچەیەدا، ئەگەر کاریگەری نەبوو خوێیەکە بە جیاواز بکە بەجێگاکەدا و لەگەڵ ئاوی باران یاخود ئاوی کانی...هتد.
ئایەتەکان ئەمانەن:
* أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ
وَالصَّافَّاتِ صَفّاً(١) فَالزَّاجِرَاتِ زَجْراً (٢) فَالتَّالِيَاتِ ذِكْراً (٣) إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ (٤) رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ (٥) إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ (٦) وَحِفْظاً مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ (٧) لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ (٨) دُحُوراً وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ (٩) إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ (١٠)الصافات
سوێند بە فریشتە ڕیز بووەکان(١) بەو فریشتانەش کە دەخوڕن بەسەر ستەمکاراندا(٢) بەوانەش (کە پەیامە ئاسمانیەکان) دەگەیەنن بە پێغەمبەران و بەسەریاندا دەیخوێننەوە(٣) بەڕاستی و بێگومان خوای ئێوە تاکەو یەکێکە (٤) پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیانە، پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتیشە (٥) ئێمە ئاسمانی دنیامان ڕازاندۆتەوە بە جوانی و ڕۆشنی ئەستێرەو هەسارەکان (٦) (ئاسمانمان) پاڕاستووە لە (پیلان و شەڕی) هەموو

شەیتانێکی سەرکەش (٧) )شەیتانەکان ناتوانن هەواڵی ئەو نەخشەو بەرنامانەی کە بە فریشتە پایەبڵندەکان دەسپێردرێت، بیزانن) و بیبیستن، چونکە لە هەموو لایەکەوە (پارچە ئەستێرە) بۆیان دەکشێ و (لەناویان دەبات) (٨) (یان) ڕاودەنرێن و سزای سەخت و پڕ ئێشیش لە قیامەتدا بۆیان ئامادەیە (٩) (ئەوەش کە هەواڵێک) بفڕێنێت و بیەوێت بۆی دەربچێت ئەستێرەیەکی کونکەر شوێنی دەکەوێت و (لەناوی دەبات) (١٠)

وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ حِجَاباً مَّسْتُوراً (٤٥) الإسراء

هەرکاتێ قورئان دەخوێنی ئێمە بەربەستێکی (نادیارو شاراوە) دەخەینە نێوان تۆو ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە.. (چونکە سوودی لێ وەرناگرن).

وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْراً وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ وَلَّوْا عَلَى أَدْبَارِهِمْ نُفُوراً (٤٦) الإسراء

(چونکە مەبەستیان نیە تێبگەن) ئێمەش پەردە دەنێین بەسەر دڵیاندا تا هەر تێی نەگەن، وە گوێشیان سەنگین دەکەین، جا کاتێ کە لە قورئاندا تەنها ناوی پەروەردگارت دەبەیت (وە باسی بت و بەرنامەیان ناکەیت) پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێرن و بێزاریی دەردەبڕن و دەڕۆن.

إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلاً (٦٥) الإسراء

بەڕاستی بەندەکانی من (ئەی شەیتانی نەفرین لێکراو) هیچ دەسەڵاتی تۆیان لەسەرە نابێت و هەوڵ و کۆششی تۆ کاریان تێناکات، وە پەروەردگاری تۆ (ئەی ئیماندار) بەسە بۆ پارێزگاریی و پاڕاستنت.

فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْباً (٩٧) الكهف

ئەوسا ئیتر (یەئجوج و مەئجوج) نە توانیان سەربکەون، نە توانیان کونا دەری بکەن.

وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ (٥٤) سبأ

(ئەوسا ئیتر) لەنێوان ئەمان و ئارەزوکانیاندا (بەربست دانرا)، هەروەکو پێشتر بە هاوشێوەی ئەمان کرا، بەڕاستی ئەوانە هەمیشەو بەردەوام لە گومان و دوودڵیدا بوون (بەرانبەر ئیمان و خۆیان بۆ دینداری یەکلایی نەدەکردەوە).

وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدّاً وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدّاً فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ (٩) يس

هەروەها بەربەستمان لە بەردەمیانەوە و لە پشتیانەوە داناوە، پەردەشمان هێناوە بەسەر چاویاندا (مەبەست ئەو بەربەستانەشە کە لە دەروونیاندا هەیە و نایەڵێت ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە) ئیتر ئەوانە حەق و ڕاستی نابینن.

پاشان سورەتی بەقرە لەو جێگایەدا بخوێنن كاتژمێرێكی دەوێت هەوڵ بدەن بە جوانی بیخوێنن.
ئینجا بچنە ناوەوە پشت بەخودای پەروەردگار بیهێننە دەرەوە.
ئەوكاتەی كە دەچن هاوڕێكانی منی لێیە لەگەڵ هاوڕێكانتان بە دەنگی بەرز بیلێن بۆ ئەوەی ئەوانیش بزانن و هاوكاریتان بكەن.
حاج الله بەخش: جزاك الله خیرا كاكە ماكوان.
ماكوان: خوای گەورە كارتان بۆ ئاسان بكات، خواتان لەگەڵ.
منیش سەرقاڵ بووم لەئەڵمانیا بە ئیش و كاری خۆمەوە چووم بۆ بازاڕ لە كۆڵن، چوومە مۆڵێكی گەورە بۆ كڕینی هەندێك دیاری بۆ ماڵ و منداڵ و خاوخێزان.
پیاسەم دەكرد لەم دوكان بۆ ئەو دوكان، بەدوای خواردنێكی خۆشدا دەگەڕام كە بیخۆم و خۆم كرد بە دۆنەر كەبابێك دا دانیشتم، دەستمكرد بە نان خواردن یەكێك بە پرتەوە خۆی كرد بە ژووردا دیار بوو بەدوای شەڕدا دەگەڕا، چووە پشتی من و كردی بە دەنگە دەنگ لەگەڵ دووكوڕی تردا كە بەئەڵمانی قسەیان دەكرد، دوو كەسی تر لە دوای منەوە بۆی هەڵسان خاوەنی دۆنەرەكە لەگەڵ چەند شاگردێك كردیانە دەرەوە، بەڵام شەڕ ڕووینەدا هەر دەنگە دەنگ بوو بەئەڵمانی دایان بەیەكدا و پاشان خاوەن دۆنەرەكە بە توركی قسەی كرد لەگەڵ دوو كوڕەكەی تردا و ئەویش لەدەرەوە ئەسوڕایەوە، گوێم لێبوو بەكوردی جنێوی ئەدا.
منیش نانەكەم بە پەلە تەواوكرد كە گوێم لە جنێوەكانی بوو چووم بۆ لای وتم كاكە چیە، ئەو توركانە تەعەدا دەكەن؟
بە دەم جنێوەوە ووتی: ئەمانە كوردن تورك نین، ئەو دوانە قاچاخچین و پارەیان خواردم، بڕیاربوو لە توركیاوە خێزانەكەم بۆ بهێنن، بەڵام خێزانەكەم سنورداش كراوەتەوە پارەكەم بۆ ناگەڕێننەوە.
ماكوان: ناوت چیە برا، خەڵكی كوێیت؟
- وەڵڵا خەریكە ناوی خۆشم لە بیر دەچێتەوە، ناوم سامانە خەڵكی سلێمانیم.
ماكوان: من چیم پێدەكرێت لەخزمەتاندا بم؟
سامان: سوپاس، چاوەڕێ دەكەم بێنە دەرەوە لەهەردووكیان بدەم یان دەیانكوژم یان دەمكوژن. ماكوان: نا؛ برا وا نابێت، چەندیان پارە لایە؟
سامان: ٥٠٠٠ ئێورۆم خەواندووە، دەڵێم ١٠٠٠ بۆ ئێوە باقیەكەم بدەنەوە.
ماكوان: بۆ خاوەنی ئەم جێگایە بەرگریان لێ دەكات؟
سامان: خاوەن ئەم دوكانە خزمیەتی.
ماكوان: كرمانجی دەزانن؟
سامان: بەڵێ بەكرمانجی قسە دەكەن لەگەڵ من، ئێستا كردوویانە بە توركی.

ماکوان: باشە هیچ مەڵێ و لەگەڵ مندا وەرە ژوورەوە، هیچ قسە مەکە ئەگەر باڵیان گرتی و تۆیان کردە دەرەوەش، بەس چاوەڕێی من بکە و هیچی تر باشە برا.
سامان: چی دەکەیت؟
ماکوان: حەقت نەبێت؛ بە پشتیوانی خوا حەل دەبێت بەس وەعدم بدەرێ لە قسەم دەرنەچیت و تورە نەبیت، ئەگەر من شەڕمکرد لەسەرت تۆش هەڵبدەرێ، تا دەست نەوەشێنن هیچ نەکەیت.
سامان: ئاخر زۆرن لێمان ئەدەن؟
ماکوان: کوڕی باش تۆ ئێستا ئەو کوشتن، خەمت نەبێت.
چوومە ژوورەوە لەسەر کورسی دانیشتم چوومە پشتیانەوە پشتم نا بە دیوارەکەوە و بانگم کرد سەیدا کەرەمکە تا لای ئێمە وەرە.
هەر بۆ بچوکردنەوەی وتم: دوو چایمان بۆ بێنە و لەگەڵ دوو پاقلاوە.
خۆی نەیهێنا داوای کرد بۆمان بهێنن.
سەیدا من ناوم ڕێبوارە لە فەڕەنساوە هاتووم حیزب ناردوومی، ئەم کوڕە شکاتی لێکردوون لای ئێمە منیان ناردووە کە ئاگادارتان بکەمەوە، جا دواتر هەرچی ڕوویدا لە بازاڕ و دوکانەکەت گلەییمان لێمەکە، چەند ڕۆژە من چاودێری ئێوە دەکەم و بەشوێن ئێوە و ئەو دوو هەڤاڵەی ترەوەین خۆم عەمدەن بێدەنگ بووم وتم بزانم ڕاست دەکات ئەم کاك سامانە جا تکایە پارەکەی بۆ بگەڕێننەوە. هەڤاڵ سالم- یش سەلامی لێدەکردی دەیوت دەمێکە هاوکار نەبووە.
لەدڵی خۆمدا ووتم ئێستا یەك شینە جڕطم بۆ لێ دەدات و دەڵێت هەستە بۆ دەرەوە. منیش بەشەق و بە بۆکس دەکەومە ناویان و چی لە دوکانەکەیدا هەبێت دەیشکێنم و خۆشم تێروپڕ تێهەڵدان دەخۆم و دەگیرێم.
وتی سەیدا سەرچاوێ مە ئەز خزمەتکاری سالمیمە.
ئێستا قسەیان لەگەڵ دەکەم بەسەرچاو.
ڕۆشت قسەیان لەگەڵ بکات، منیش بە سامان-م وت: پێبکەنە لەگەڵمدا و قاقا لێبە با دەنگی پێکەنینەکەت ببیستن.
سامان وا پێدەکەنی من ڕقم لێبوو وەکو وابێت بگری.
وتم دەمت داخە خەڵك وا پێئەکەنێ.
ماکوان: سامان جگەرەت پێیە؟
سامان: جگەرە ناکێشم.
ماکوان: پڕۆ پاکەتێك بکڕە.
سامان: چی دەکێشی؟
ماکوان: نازانم هەرچی بێت، دالاس!
سامان: کاکە ئێرە ئەڵمانیایە دالاسی چی؟
ماکوان: هەرچیەك بێت بیهێنە و هەڵسە لەبەرچاوم، کەهاتیتەوە زۆر بە ویقار و ڕێزەوە بمدەرێ باشە؟

خۆم مەبەستم بوو ئەو جوڵەیە بکات، چوو پاکەتێکی مارلیبۆرۆی بۆ هێنام و جگەرەیەکی دامێ و چوومە بەردەم دوکانەکە کێشام و خەریك بوو ئەخنکام ئەوەندە ناخۆش بوو بەس تفم دەکردەوە.
منیش وتم ئەگەر کاتتان پێویستە دەڕۆم دواتر دێینەوە.
یەکێکیان هاتە لام وتی من ناوم حسێنە ئێستا ٣٠٠٠ ئێورۆ ئامادەیە تا دەچن ئەوی تر دەهێنن دوو کاتژمێری تری دەوێت.
ماکوان: کێشە نییە، سامان ڕۆ ئەوە وەرگرە و دوو سەعاتی تر بێرەوە لێیان وەرگرە. بە تورەیەوە بەسامانم وت لاچۆ ئیشم بە سەیدا حوسێنە! سامان ڕۆشت چپاندم بە گوێیدا و وتم زۆر درەنگ کەوتوویت گلەییان لێتە.
سەیدا حوسێن: ئەز ل خزمەت ئێوەدام.
ماکوان: من دەڕۆم نایەمەوە تا دوو سبەی لەگەڵ جەماعەت دێینەوە لات، بەڵام پارەکەی سامان بدەنەوە خوات لەگەڵ.
لەگەڵ سامان هاتین و ٣٠٠٠ ئێورۆم بۆ وەرگرتەوە.
وتم وەرە ڕۆین بۆ قاوە خانەیەك تا دوو کاتژمێری تر بەسەیارەکەی خۆم ئەتهێنمەوە بەردەم دوکان، دابەزە و خێرا سەرکەوە باشە؟ پلانم بۆ دانا و دوای دوو کاتژمێر بە سەیارەکەی خۆم بردمە بەردەم دوکانەکە، هەرچەندە زۆر قەدەغە بوو سزای لەسەر بوو لەویا وەستان.
سامان دابەزی و لەدوورەوە جامەکەم دایەوە هاوارم کرد سەیدا دوو سبەی باشە؟
حوسێن: زۆر باشە، خواحافیز.
ماکوان: هەموو پارەکەت وەرگرت؟
سامان: عەیبی نیە، هەتا ماوم بیرم ناچێتەوە کاك ڕێبوار گیان.
ماکوان: من ناوم ڕێبوار نییە، ناوم ماکوان-ە، ئەگەر ئیشێکت نییە دەڕۆم.
سامان: بۆ کوێ؟
ماکوان: من لە نەرویجەوە هاتووم نەك فەڕەنسا ئەو جەماعەتە ئەحمەق بوون ئەگەر ئاقڵ بوونایە بەتۆشەوە دەتانزانی ژمارەی سەیارەکەی من فەڕەنسا نییە (بەپێکەنینەوە) لە هوتێلم لە شارێکی نزیك ئێرە.
سامان: کاکە ناهێڵم ڕۆیت تۆ فریشتە بوویت چۆن دەهێڵم ڕۆی بەخوا داوەتی منی، ماڵم لێرەیە هوتێلی چی چۆن شتی وا دەبێت.
ماکوان: کێشە نییە، دێم چایەك دەخۆینەوە لە ماڵتان و دوایی دەڕۆم با یەکتر بناسین.
سامان: تۆ وەرە خوا گەورەیە.
چوومە ماڵیان هەر دەرگا کرایەوە بتڵێ بیرەم بینی، دوای ئەوە دانیشتم لە جیاتی چا بیرەیەکی بۆ هێنام گوایە زۆر بەڕێزە و خزمەتم دەکات، منیش هەڵسام وتم دەڕۆم.
سامان: بەسەرسورمانەوە بۆ کاکە؟!

ماکوان: من ویستم داوای بەرماڵ بکەم، لەماڵێکدا مەشروبی تێدا بێت دانانیشم، بەڕاستی خۆم تاوانبار ناکەم. برا ماڵی خۆتە تۆ ئازادی چی دەکەیت تێیدا، بەڵام من دانانیشم لەماڵێکدا مەشروبی تێدا بخورێتەوە، خێرا ٦ بیرەی هەبوو لەماڵەکەیدا هەڵی چڕی و کردی بە دەستشۆری چێشتخانەکەیدا.

ماکوان: نوێژم نەکردوە بەرماڵت هەیە؟

سامان: بەخوا شازی بەرماڵم هەیە، دایکم لە حەج بۆی هێناوم نوێژم لەسەر نەکردووە هەر بیبە بۆ خۆت، ڕۆ دەست نوێژەکەت بگرە.

ماکوان: "بە پێکەنینەوە" کوا توالێت و حەمام باپڕۆم دەست نوێژەکەم بگرم؟

دەست نوێژم گرت و هەندێك موجاملەمان کردو تەلەفونەکەیم وەرگرت و ١٠٠٠ ئێورۆی بۆ هێنام کە بیبەم بۆ خۆم، هەڵسام پارەکەم دایەوە و وتم: ئەگەر منت خۆش دەوێت ئەوە بدە بە خێزانی بەڕێزت و ڕوبکەرە خودا دڵنیابە خوای گەورە کارەکانت بۆ ئاسان دەکات.

خواحافیزمان لەیەك کرد و تەلەفونمان گۆڕیەوە، دیاربوو کوڕێکی بە وەفاش بوو زۆر ڕێزی گرتم تەمنمان زۆر جیاواز نەبوو، پێدەچوو من چەند ساڵێك لەو گەورەتر بم. ئامادەی پیشەسازی سلێمانی تەواو کردبوو بەشی کەرەبا.

هاتمەوە بۆ هوتێلەکەو ماوەی ٣ ڕۆژ لە نۆیس مامەوە ئەو کەلوپەلانەی کڕیبووم هەموویم ڕەوانەی نەرویج کردەوە. دوو ڕۆژم مابوو سەرقیسی سەیارەکەم بۆ بکەن. کۆتا ڕۆژ کە ویستم بگەڕێمەوە حاج الله بەخش تەلەفونی بۆ کردم و وتی: کاکە ماکوان لەکوێیت؟

ووتم: لە ئەڵمانیام بەیانی دەگەڕێمەوە نەرویج.

حاج الله بەخش: مەڕۆ بەیانی کاتژمێر ١:٣٠ ئیقباڵ و سەلامو الله کوڕی دێنە شاری دوسلدۆرف شارەزانین، بەڵکو هاوکاریان بکەیت. ئەمانەتیان پێیە هاوکاریان بکە تا دەگەڕێتەوە فەڕەنسا، شارەزانییە لەئەڵمانیا.

ماکوان: سەرکەتوو بوون الحمد الله؟

حاج الله بەخش: ئەرێ وەڵڵا؛ هیچمان تێدا نەهێشت بەشێکی کەممان لێ ناردووە ساغی بکەرەوە پێم وتووە کە بەشی تۆ لە بەرچاو بگیرێت خەمی هیچت نەبێت، بەڵام تا لە فڕۆکەخانەی کابول دەرمانکرد زۆر ناڕەحەت بووم.

ماکوان: ئەی لە ئەڵمانیا کێشەی نیە؟

حاج الله بەخش: بۆ دابەزین لێپرسینەوەی نییە ئاساییە ئەگەر بشگیرێت زۆر گرنگ نیە لامان، چونکە بەس نموونەم ناردووە پرسیاری زۆریشم کردووە یاساغ نییە لە ئەوروپا.

ماکوان لەدڵی خۆمدا وتم شێخ برقان شارەزابوو ئەویش وای وت، باشە حاجی گیان لەخزمەتام، ئەمشەویش دەمێنمەوە تا دەگەڕێنەوە فەڕەنسا. شەو بیرم دەکردەوە لە خۆشیدا ووتم بەخوا خودای گەورە دەوڵەمەندی کردی بە بۆنەی ئەفغانیەکانەوە. بیرم دەکردەوە پرۆژەم دادەنا و یارمەتی

خەڵکم ئەدا لە خەیاڵ پڵاوێکی زۆر خۆشدا بووم، زەنگی تەلەفونەکەم لێیدا سەیرم کرد سامان بوو.
سامان: کاك ماکوان براکەم وەڵڵا زۆر مەمنونی جەنابتانم هەر حەزمکرد قسەت لەگەڵ بکەم، زۆر حەز دەکەم بێمە خزمەتت برا ئەگەر ئیجازە هەیە با ئەم شەو پێکەوە بین ئیشم نییە لەخزمەتام.
ماکوان: لەخزمەتام کاك سامان گیان لە هوتێل ئێمپایەر لە نۆیس، سێ چارەك دوورم لە کۆڵن تەشریف بێنە.
سامان: ئێستا دێمە خزمەتت، نانت خواردووە؟
ماکوان: وەرە بەیەکەوە نان دەخۆین، خواحافیزیمان کرد لەوکاتەیا حەزقیل دەرکەوت بێ سەلام و کەلام وتی: ئەوە چیت کرد بەدبەخت؟
ماکوان: چی بووە حەزەی برام؟
حەزقیل: ڕاکە لێرە نەمێنیت ئەدرەسی خۆتت خستە بەردەستی ئەو کرمانجانە زۆریان داوە لە سامان بەدوای تۆشدا دەگەڕێن، لێرە نەمێنیت.
ماکوان: ئەی چی بکەم ڕاکەم؟
حەزقیل: ئەی خۆ مقاوەمە ناکەیت؟
ماکوان: ئێ ئاخر بۆ کوێ ڕاکەم؟
حەزقیل: چارە هەیە؟
ماکوان: وەرە با بیر کەینەوە چی بکەین.

## شەڕێکی سەخت و بێ زیان

حەزقیل هات بەپەلە وتی: هەرچی ناونیشانی خۆت بوو خستتە بەردەستیان ئەوان دەیانەوێت لێت بدەن، زانیویانە بە فیڵ پارەکەت بۆ سامان وەرگرتۆتەوە جا تا زووە ڕاکە لێرە مەمێنە.

ماکوان: ئاخر چۆن ڕاکەم؟ بۆ کوێ ڕاکەم؟ باشە گریمان من ڕامکرد بە بۆنەی منەوە ساماان کەوتۆتە دەستی ئەوان، بۆیە ڕاکردن چارە نییە. وەرە با بیر بکەینەوە حەزە گیان چی بکەین؟
حەزقیل: بە سامانەوە دێن بۆ ئێرە ٣ ئۆتۆمبێلن ١٠ کەس زیاترن، چی دەکەیت؟
ماکوان: تەلەفۆن بکەین بۆ پۆلیس بێن؟
حەزقیل: جا چی دەڵێیت بە پۆلیس؟ بەشی ئەوە زمانت باشە قسە بکەیت بە ئەڵمانی؟
ماکوان: ئەڵمانی نازانم، مەگەر بە ئینگلیزی تێیان بگەیەنم کە ئەویش قورسە، بەس چی بڵێین بە پۆلیس باشە؟
حەزقیل: بەخوا بەتەمایی پۆلیسی ئەڵمانی مەبە بەئینگلیزی قسە بکەیت و بێن بەدەمتەوە، پاشان چی دەڵێیت؟
ماکوان: ئەوەش پرسیارەکەی منە چی بڵێین؟
حەزقیل: بەقسەمکە بڕۆ لە هوتێلەکە بەرەو شارێکی تر یان برادەرێك بدۆزەرەوە لە هاوڕێکانت بچۆ بۆلایان و دوای هەوڵبدە سامان لەدەستیان دەربهێنن.
ماکوان: ئێستا سامانیان نیوە گیان کردووە، ئەوە دڵنیام سامان وتوویەتی پارەکەم داوە بە ماکوان، هەڵبەت ئەمە بۆچونی خۆمە بۆ ئەوەی لێی نەسێنن.
حەزقیل: کاتی ئەم تەحلیل و شیکارییە نییە بەقسەم بکە بڕۆ، زۆرن دەرەقەتیان نایەیت و ئازارت ئەدەن.
ماکوان: نازانم، سەرم داخست و بێدەنگی ڕووی تێکردم ویستم بیربکەمەوە. تۆزێك بێدەنگ بووم سەرم بەرزکردەوە سەسیل وەستابوو پاڵی دابوو بەدیواری ژوورەکەوە وەك ئەوەی چاوەڕێی من بێت، منیش وتم هەر لە تۆم کەم بوو.
سەسیل: من ئەتوانم وایان لێبکەم کە بترسن و نەیەن بەلاتدا.
ماکوان: بەڕاستە؟ ئاخر دوایی نەمکەیت بەپەند وەکو تۆپی بالەم لێبێت بە بۆکس و شەق لە نێوانیاندا یاری بکەم.
حەزقیل: چی دەکەیت سەسیل؟
سەسیل: شملالۆۆخ، فەنەستقانا و ئەرزحابیج.
ماکوان: ئەوە دەڵێن چی؟
حەزقیل: دەڵێت لەبەر چاویاندا شتی ناشرین و زەبەلاح نیشان ئەدات تا بترسن!
ماکوان: ئەی بۆ وانالێیت سەسیل ئیتر ئەم قسانە چییە دەیکەیت؟
سەسیل: ئاخر ئەو جۆرە شێوەی کارەکەیە، بەس چەند خولەکێکم بدەرێ ئێستا دێمەوە بۆلاتان.

ماکوان: فەرموو پرۆ، حەزقیل پێت وایە سەسیل توانای هەبێت و ڕاست بکات؟
حەزقیل: ئەتوانێت زیاتریش بکات! ئەوە ڕۆشت ئیزن لە شێخ برقان وەرگرێت.
ماکوان: دڵنیا بم حەزە؟ دوایی نەمدەن بە شوو، کەرامەتیشم بشکێنن.
حەزقیل: خۆم هەواڵەکەم بۆ هێناوی بزانم درۆ دەکات ئەموت پرۆ، بەس تەنها شێخ برقان بڵێ بیکە ئەبینیت چی ڕوودەدات.
ماکوان: حەزە گیان، خراپ نییە بۆ دڵ؟
حەزقیل: من پێم باشە بەپەردە چاوت داپۆشن نەوەك بەرگە نەگریت.
ماکوان: مەمترسێنە لەئێستاوە دەترسم ڕاکردنەکە مەسڵەحەت تربێت و لە بەرژەوەندیمان بێت.
حەزقیل: بێخەمبە خۆم لەگەڵت دەبم.
ماکوان: بێخەمی چی بم ئێستا ئەتوت ڕاکە، کوێرا بەم ڕستەیە ئاوا ئارام بوویت، بەڕاست ئەمە چیە (شملالۆۆخ، فەنەستقانا و ئەرزحابیج)؟ لەم قسانەدا بووم سەسیل هاتەوە.
سەسیل: ماکوان خۆت بگۆڕە زۆر بەجوانی پرۆ ئەوبەری شەقامەکە بوەستە، کە هاتن بانگیان بکە بۆ ئەو پارکەی ئەوبەر با دوور بن لە هوتێلەکە، چونکە شوێنەکە بچوکە بوعدەکان جوان دەرناچن.
ماکوان: بوعدی چی؟
سەسیل: ئێوەی مرۆڤ تەنها بوعدی یاخود ڕەهەندی سێ دانەییتان هەیە کە ناسراوە بە ڕەهەندی سیانی چاو(بعد الثلاثي)، بەڵام ئێمە ڕەهەندی چوارینەییمان هەیە و توانامان هەیە بە کاردانەوەی تیشك شتی زۆر نایاب نیشانی ئێوەی مرۆڤ بدەین کە تەنها تیشکێکە لەڕێگای مادەی ڕەشەوە بەشەودا دەکرێت لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم دەیکەین وەك ئاهەنگێك وایە بۆ ئێمە پێشکەشی دەکەین بۆ تۆ، بۆ ئەوەی نێوانمان باش بێت و چاوبەستێکیشە لە ئێوەی مرۆڤ و ئەو کۆمەڵەت بۆ ئاقڵ دەکەم ئەم شەو.
ماکوان: وەڵڵا موهیمی سەسیل، ڕەهەندی سێدانەیی مەبەستت(3D) نیە؟
سەسیل: با خۆیەتی، ئێمە (4D,5D) بە چاوی خۆمان دەبینین، ئێوە تەنانەت (3D)بە چاویلکەی تایبەت دەبینن.
ماکوان: کە چوومە ئەوێ چی بکەم؟
سەسیل: تۆ حەقی هیچت نەبێت داینێ بۆ خۆم، ئەیانخەمە دۆڵ و شاخی واوە کە لەژیانیاندا نەیەنە دەرەوە، پەلی سامان بگرە و بیهێنە دەرەوە بە سامان بڵێ تەلەفون بکات بۆ پۆلیس کە ئەوانە لە تلیاك خۆرو شتی وادەچن، باشە؟
ماکوان: سەسیل ئەم شتە چیە دەیکەیت بۆ فیکرەیەکم لێ نادەیتێ شتێکم بۆ باس بکە، نەکو ئەوان توانایان هەبێت و ئێمە توانامان نەبێت و بماندەنە بەرشەق، دوایی تۆش یەك جرطی موحتەرەممان بۆ لێبدەیت. هەر بیرۆکەیەکم بدەرێ بۆم باسکە چی دەکەیت.

سەسیل: تەلەفونەكەت دەربێنە و بنوسە(3D street art painting) بزانە چی دەبینیت؟
ماكوان: تەماشام كرد شتی زۆر جوان بوو لەوێنەی سریدی و هونەری وێنەكێشان.
سەسیل: شتێكی لەو بابەتە دەكەین، بەڵام زۆر بەترسناكی.
ماكوان: باشە، دەستم دایە تەلەفۆنەكەم و زەنگم لێدا بۆ سامان، یەكەم جار هەڵینەگرت حەزقیلیشم نارد چاوی لێیان بێت و جاری دووەم زەنگم بۆ كردەوە هەڵیگرت، بەڵام زۆر ماندوو دیار بوو.
ماكوان: سامان كە وەستایت لەدەرەوە لەوبەر چاوەڕێت دەكەم ئەتوانیت سەیارەكەت تا كاتژمێرێك پارك بكەیت لەبەردەم هوتێلەكە و مەچۆ ژورەوە چاوەڕێتم لەوبەر هوتێل ئێمپایەر و برسیمە یەكسەر دەچین نان دەخۆین.
سامان: باشە كاك ماكوان گیان، بەڵام بەدەنگێكی زۆر خەمبار و بێزارەوە قسەی لەگەڵ دەكردم.
ماكوان: زۆرت ماوە بگەیت مامە سامان؟
سامان: چارەكێكی تر دەگەین.
ماكوان: بۆ چەند كەسن وادەگەن؟ سامان هەر دەیویست تێمبگەیەنێ كە خۆی نییە نەیدەزانی چۆن پێم بڵێت، لەوەدابوو قسەیەك بكات و داخرایەوە، منیش زانیم دەردەكەی چیە گوێم پێنەدا و ووتم سەسیل بزانم چی دەكەیت. ئەو كوڕە گوناحە ئاوای لێدەكەن.
سەسیل: ئەگەر پێت خۆشە وایان لێدەكەم پێش ئەوەی بگەنە ئێرە ئۆتۆمبێلەكەیان توشی ڕووداوێك دەكەم.
ماكوان: خەریك بوو ڕازی بم.
سەسیل: خراپ نییە؟
هەر وام ووت شێخ برقان ئامادەبوو!
شێخ برقان: نابێت شتی وا ئێمە پەیمانمان هەیە لەگەڵ حەزرەتی سولەیمان لەبەردەست كەس موسەخەر نابین.
ماكوان: باشە یا شێخ گیان مادام تۆ هاتی خۆتان چی دەكەن من ڕازیم، ئەوە سەسیلی برام چی دەكات من ڕازیم.
شێخ برقان: بە پێكەنینەوە" سەسیل بوو بە برات؟ خۆ تۆ ئەت وت باقسە نەكات!
ماكوان: شێخە گیان (عفا الله عما سلف)
سەسیل: زۆریان نەماوە خۆت بگۆرە.
ماكوان: باشە خۆم گۆڕی و وردە وردە چوومە خوارەوە كلیلی ژورەكەم دایەوە بە پرسگە و لەوبەر شەقامەكە وەستام و چاوەڕێم دەكردن، لەپڕ سێ سەیارە هاتن دوو ئاودی و ڤۆگزڤاگنێك. كە سامانم بینی پلانەكە وا بوو هاوارم كرد سەیدا حوسێن خۆت وەرە با جەماعەتەكەت نەیەتە ئەمبەر. با

سامانت لایێت، بەڵام خۆت وەرە ئیشم پێتە ئاگاداریان کردوومەتەوە کە دێیت ئەوەندە پیاویت دێیتە سەر من.
شەڕ لە هوتێلەکە دوور بخەرەوە وەرە بەیەکەوە بچینە ناو ئەو پارکە بەیەکەوە دوو بەدوو، کەوام ووت هەموو سەریان سوڕما وەك ئەوەی کارەبا لێیان بدات وشك بوون، بەڵام حوسێن هات دوو کەسی لەگەڵدا بوو من دەستم لە گیرفانم دابوو دەرمنەهێنا دەم و چاوم دابوبەیەکدا و وەکو مۆرە مۆرەم لێدەکردن.
حوسێن هات و بەرەو ڕووم ڕاستەخۆ وتی: پارەکەمان بدەرەوە لەگەڵ پارەی ئەو کەسانەی هێناومە، هیچ ناکەین و دەڕۆین لەشەڕ هەردولامان تیادەچین، تۆ درۆت کرد نە حزب ناردوویتی و نە کەس.
ماکوان: ئەی چۆن زانیم ئێوە دێنە ئێرە؟
حوسێن: خودێ نازانم.
ماکوان: وەرە بابچینە ئەو پارکەی ئەوبەر، ئەگەر شەڕیشمان کرد ئێمە کوردین با کەس نەزانێت و پۆلیس نەمانگرێت، باشە؟
حوسێن: جنێوێکی دا بە پۆلیس و وتی ئەوە کێشەی من نییە.
ماکوان: باشە وەرن بۆ ئەو پارکە با جەماعەتەکەشت بێن، سامانیش بهێنن بۆ ئەو بەر من پارەکەتان بدەمەوە.
کە وام وت هەموو هاتن، منیش زۆر بە نەرمی دەڕۆشتم لەبەر دەم خۆمەوە دەموت سەسیل کوایت؟
نزیك بوومەوە لەسەر کورسی دانیشتم و حوسێن دانیشت و هەموو ئەوانی تر چواردەوریان گرتم، ووتم فەرموون چیتان دەوێت؟
حوسێن: پارەکەمان بدەرەوە، بەڵام دەبێت دوو ئەوەندە بێت! واتا ١٠٠٠٠ ئێورۆ.
ماکوان: ئەی ئەگەر نەتان دەمەوە چی دەکەن؟
حوسێن: وەکو مریشك لێرەدا سەرت دەبڕین!
ماکوان: هیچ ڕووینەدا؛ لەدڵی خۆمدا ووتم بە خوا سەسیل دامی بەشوو! بەناچاری ووتم ئاخر ئەوەتان بیر بێت چاوەڕێم ئێستا جەماعەتی حیزب دێن خۆت دەبێت بەرپرسیارێتی هەڵگری!
حوسێن ئاقڵ بەو شەڕ مەکە با سامانیش بڕواتەوە، ئەگەر نەشهاتن ئەوا من بەیانی پارەکەت لە بانك بۆ دەردەهێنم ئێستا ناتوانم ئەو هەموو پارە لە بانك دەربهێنم.
حوسێن: باشە ٥٠٠٠ هەزارەکەمان بدەرێ سامان وتی لای ماکوانە.
ماکوان: ڕاست دەکات لای منە خستوومەتە سەر حسابەکەم، مەگەر بەیانی ئەویش دەربهێنم. پەلە مەکەن تا بەیانی ئەگەر جەماعەتی حیزب نەهاتن ئەوە بەسەر چاو.
حوسێن: کارت و کۆدەکەیمان بدەرێ.

ماکوان: لە هوتێلەکەیە ڕێگام بدەن بچم بیهێنم، لەدڵی خۆشمدا هەر جنێو بە سەسیل ئەدەم و دیار نییە. دڵم خەریکە ئەتەقێت، هیچ مەجالی ڕاکردنیشم نییە ١٠ کەس دەوری گرتووم.
حوسێن: با ئەو زەلامانە بێن لەگەڵتدا.
ماکوان: باشە؛ هەرچۆن بێت لەدڵی خۆمدا وتم ئەتوانم لە دەستی دوان ڕابکەم، هەر هەڵسام هەموویان دەستیان گرت بە چیمەنی پارکەکەوە ئەیان قورسکاند وەکو سەگ. منیش لەدڵی خۆم دا وتم بەخوا کەوتە ئیش خاڵە سەسیل گیان، سوك دەستی سامانم گرت و هانیمە لای خۆم و ووتم تەلەفونت پێیە؟
سامان: نا پێم نییە، لای ئەو هەتیوەیە بردویەتی چی ڕوویداوە؟ ئەوە بۆ وا دەکەن؟ کاك ماکوان ڕاکە قوربانت بم، خەجاڵەتی لای تۆم.
ماکوان: دانیشە هەتیو خەریك بوو بمکوژیت بۆ کوێ ڕاکەم، من فێری ڕاکردن نەبووم بەس خەڵکم ڕاوناوە، تەلەفۆنەکەت لای کامیانە پڕۆ بیهێنە.
سامان: ئاخر ئەمگرن، ئەوە بۆ ئەقیژێنن؟
ماکوان: ئەوە جەماعەتی حیزب هاتن بۆ لایان، کوا تەلەفۆنەکە لای کامیانە نیشانم بدە خۆم دەریدەهێنم.
سامان ئەلەرزی و وتی لای ئەو کوڕە زلەیە ناوی موستەفایە.
ماکوان: جا ناویم بۆچیە، خۆ بایەعی بۆ دەرناهێنم. چووم دەرم هێنا دەستی وا توند گرتبوو بەو چیمەنەوە پەنجەی کردبووە ناو قوڕەکەش، منیش ووتم دەستەکانت خۆش خاڵە سەسیل گیان، تەلەفونەکەم دەرهێنا و دوورکەوتینەوە بە سامانم وت تەلەفۆن بکە بۆ پۆلیس بڵێ کۆمەڵێك خەڵك لای هوتێل ئێمپایەر نائاسایین و پێدەچیت کاری کریمیناڵ بکەن تکایە بەزووترین کات وەرنە ئەو جێگایە.
سامان تەلەفۆنی کرد و ئەوی پێم ووت بە تەواوەتی بە پۆلیسی ڕاگەیاند، منیش چوومەوە ئەوبەر شەقامی هوتێلەکە و چاوەڕێی پۆلیسم دەکرد و ووتم سامان زۆریان لێداوی؟
سامان: کاك ماکوان زۆر ئازاریان دام.
ماکوان: هیچ جێگایەکت نەشکاوە پڕۆین بۆ نەخۆشخانە؟
سامان: نا یەکجار وانەبووە.
ماکوان: پارەیان لێسەندی؟
سامان: نا هیچیان نەبرد، پێم ووتن پارەکەم داوە بە ماکوان!
ماکوان: باشە کوڕی باش چۆن وا دەڵێیت فێڵ لە من دەکەیت، لە دوای پیاوەتی من دەخەیتە داوەوە، دەبوو بشتکوژن ناوی من نەبەیت.
سامان: کاك ماکوان بەتەمای ئەوە نەبووم کە لە ئەڵمانیادا مابیتەوە وا هەستم کرد دەرچوویت لە ئەڵمانیا و گەڕاویتەوە بۆ نەرویج، بۆیە ئەو کارەم ئەنجامدا دەنا بەخوا لە برای خۆم خۆشترم دەوێیت.

ماكوان: كێشە نییە با چاوەڕێ بكەین پۆلیس بێت دوای ئەوە دەڕۆین، دێم بۆ ماڵی تۆ لە كۆڵن دەخەوم ئەم شەو بەیەكەوە دەبین. دانەویەوە دەستم ماچ بكات ووتم استغفرالله قبوڵم نەكرد، برای منی كاكە سامان گیان عەیبە وامەكە تۆ كەسی منیت.
لەم قسانەدا بووین پۆلیس گەیشت هەموویانی كۆكردەوە ئەوانی بردو منیش چوومە هوتێلەكە و سەسیل لەژوورەكەدا بوو، هەستم كرد سامان نایبینێت.
ماكوان: مامە سامان بچۆ دەرەوە لە پرسگەكە دابنیشە دێمە لات.
هەستم كرد ئەترسێت بۆیە پێم ووت مەترسە تەواو كۆتاییان هات. هەڵسا ڕۆشت و منیش لەخۆشیدا خەریكبوو باوەشكەم بەسەسیل دا ووتم ئەی كوری باش ئەو فیلم و سینەمایەت بۆ نیشانی ئێمە نەدا؟
سەسیل: حەزم نەكرد ئازاری تۆ و هاوڕێكەت بدەم، بەڵام ئەوان هیچیان لەسەر نییە هەر ئەم شەو ئازاد دەكرێن و بەیانی لەگەڵ سامان پرۆن بۆ دۆنەرەكەیان نان بخۆن، باشە؟
ماكوان: هەروا بەئاسانی بچین هیچمان لێناكەن؟
سەسیل: تۆ بڕۆ، هەرچیان كرد لەگەڵتام خراپتریان لێدەكەم.
ماكوان: ئاخر سەسیل زۆر درەنگ دەست بەكار دەبیت، خەریكبوو دڵم بوەستێت.
سەسیل: بێخەمبە!
خواحافیزمان كرد لەگەڵ سەسیل و جانتاكەم بردە خوارەوە، سامان خێرا دەستی دایە جانتاكەم نەمهێشت، ووتم بابە یەكێك دەبێت خۆت بكاتە كوڵ.
سەیارەكەم لە پاركینگ دەرهێنا و چێك ئاوتم كرد، هاتمە دەرەوە و بەرەو كۆڵن چووین بۆ ماڵی سامان.
بەسامانم وت بڕۆ دوش بگرە و خۆت بشۆ منیش دوای تۆ دەڕۆم، پیتزایەك داوا بكە نانمان خوارد و تا نوێژ نەخەوتین نوێژمان كرد و ئەویش لەگەڵمدا نوێژی كرد، خەوتین تابەیانی و من زۆر ماندوو بووم، تا كاتژمێر ١١ی بەیانی خەوتم. لە خەو هەڵساین سامان وتی نان و چای بەیانی بخۆین؟ وتم سامان دەڕۆین بۆ دۆنەرەكەی سەیدا حوسێن نان دەخۆین.
سامان: برا بیكە بەخاتری خوا تۆ چیت؟ من لەشەوەوە چەندە لەوان ترساوم سێ ئەوەندە لەتۆ كاك ماكوان! بەڕاست تۆ مرۆڤ و شتی وایت؟
ماكوان: نا من لە جەماعەتی حەزقیل و سەسیلم نیوەم جنۆكەیە و نیوەم مرۆڤە! كورە هەڵسە باپڕۆین قسەی زل مەكە وەكو تۆ بەشەرم.
لەم قسانە دابووین ئیقباڵ تەلەفونی بۆ كردم وتی: ماكوان لە توركیاین دوای چەند سەعاتێكی تر دەگەینە دۆسلدۆرف چاوەڕێمان دەكەیت لەوێ؟
دڵنیام كردەوە كە لە خزمەتیاندا دەبم.،لەگەڵ سامان چووین بۆ دۆنەرەكە من كە چوومە ژوورەوە بەدەنگی بەرز ووتم ڕۆژباش! یەك دووانێكی لێبوون نەیان ناسیم لە شاگردەكانی.

وتیان: ڕۆژ باش!
سەیرێکی حوسێنم کرد ماندوو دیار بوو، سەیدا السلام علیکم ورحمة الله وبركاته!
حەپەسابوو بەدیارمەوە بە توورەی ووتم بۆ وەڵام نادەیتەوە؟
وتی: سەرچاڤا
ماکوان: سەیدا برسیمە دوێنێ شەو زۆر ماندوو بووین، بەدەستی خۆت دوو دۆنەرمان بۆ دروست بکە، ئاگام لە سامان بوو شڵەژابوو. وتم پڕۆ دانیشە
سامان: لە کوێدا دانیشم؟
ماکوان: لەسەر کۆشی حوسێن! لەکوێ دادەنیشی دانیشە.
ئەو دانیشت و منیش چوومە بەردەم دوکانەکە هەڵوێستەیەکم کرد و تۆزێك تەماشای ئەملاولام کرد، حوسێن هات بۆ لام.
جگەرەیەکی دامێ وتی سەیدا من تەسلیم تۆ عەزیزی ئێمەیت، پارە هەموو بۆ خۆت باشە؟
ماکوان: ئەی کێ پارەی دۆنەرەکە ئەدات؟
حوسێن: میوانی منیت.
ماکوان: باشە؛ چووم دانیشتم و نانمان خوارد و دواتر هەڵسام ٢٠ ئێورۆم دانا و چوومە دەرەوە، حوسێن هات پارەکەم بداتەوە، ئەملاولام ماچ کرد و وتم گەردنم ئازاکە.
حوسێن: گەردنت ئازابێت سەیدا ماکوان، حەزدەکەم جارێکی تر قسە بکەین.
ماکوان: بەدڵنیاییەوە سەیدا حوسێن، تکایە زوڵم مەکەن هەوڵبدەن پیاوەتی بکەن.
بەرەو دۆسڵدۆرف ڕۆشتین سامانیش هات لەگەڵمدا، وتم میوانم هەیە دێینە ماڵەکەی تۆ.
سامان: ماڵی خۆتە و خاوەن ماڵ نیم.
ماکوان: سوپاسیم کردو بەرەو فڕۆکەخانەی دۆسڵدۆرف کەوتینە ڕێ و چاوەڕێی ئیقباڵ و سەلامو للە و ئاڵتونەکانم.

## ڕفاندنی سەلامو الله و ئاڵتونەکان

لەگەڵ سامان بەرەو فڕۆکەخانە چووین و لە هۆڵی چاوەڕوانی، چاوەڕێی ئیقباڵ و سەلامو الله مان دەکرد.
سامان: دەمێکە دەیانناسیت؟

ماکوان: من لە ژیانمدا نە ئیقبالٚم دیووە نە سەلامو الله، تەنها لە ڕێگەی الله بەخشەوە دەیانناسم.
سامان: ئەی الله بەخش کێیە؟
ماکوان: نازانم کێیە، بەڵام لە ڕێگای کوڕێکی ئەفغانیەوە دەیناسم لە نەرویج ڕەفیقمە.
سامان: جێگای متمانەن؟
ماکوان: بۆچی متمانەیان پێبکەین، ئەوان ئیشیان بە ئێمەیە و داوای یارمەتیمان لێدەکەن، لە بنەڕەتدا ئەوان متمانە بە ئێمە دەکەن و شتی خۆیان خستۆتە بەردەستی من.
سامان: چییان خستۆتە بەردەستی تۆ؟
ماکوان: ئاڵتون و ئاسەواری کۆن و دێرین.
سامان: جا ئەوە قاچاغ نییە؟
ماکوان: با، زۆر قاچاغە لە خودی وڵاتەکەدا ئەگەر تەسلیم بە دەزگای ئەو وڵاتە نەکرێت، کە هاتە دەرەوەی وڵاتەکە بازاڕی ئازادی هەیە.
سامان: ئێستا کەل و پەلەکانیان لایە؟
ماکوان: بەڵێ، ئەترسی سامان؟
سامان: تۆزێك!
ماکوان: پڕۆ دەرەوە لێرە، تاوەکو دێینە دەرەوە سواری سەیارەکەی خۆمیان دەکەم و ئەوکات تۆش وەرە سەرکەوە، نەوەك بگیرێین با تۆ سەلامەت بیت.
سامان: کاکە یەکجار وا بچووکم مەکەرەوە حەزەرێك بوو وەرمگرت، تۆ هەرچیت لێبێ هەنگاوم لەگەڵ هەنگاوت دایە، ئەوەندە ناپیاو نیم بەجێت بهێڵم لێرە.
ماکوان: ڕۆحی مامە سامان گیان پڕوا مەکە ئەوەندە ترسناك بێت، منیش یەکەم جار زۆر حەزەرم وەرگرت بەس دوایی دڵنیایان کردمەوە کە ئاساییە.
سامان: کاك ماکوان پرسیارێك بکەم؟
ماکوان: فەرموو!.
سامان: تۆ کێیت؟
ماکوان: "بە پێکەنینەوە" ناوم ماکوانە و پێنجوێنیم و باوکم ناوی عەبدولکەریمە. کەسێکی هەر زۆر ئاسایی و سادەم لەبرنج و شلە سادەتر منم.
سامان: ئەو شەوە چیبوو ئەو جەماعەتەت نوساند بە خاکەوە و دوایی بەیانی چوویتەوە لایان و ئەو هەموو ڕێزەیان گرتی؟
ماکوان: سامان گیان هەرکەس خیانەت و درۆ بکات، ماڵ و سامانی خەڵکی بخوات خوای گەورە ئەیکات بە ناخی زەویدا، ئەوانەش هەموو ساختەچی بوون بۆیە خوای پەروەردگار ویستی نیشانەیەکیان نیشان بدات بۆ ئەوەی ئاقڵ بن بۆ حەوت پشتیان.
سامان: توزاتی خوا، تۆ خدری زیندە نیت؟

ماكوان: نەوەڵڵا! من ماكوانم حەدم نییە بە تۆزی بەرپێی حەزرەتی خضر بم، ئەو لەسەردەمی حەزرەتی موسادا بووە من و جەنابت لە سەردەمێكیتردا دەژین. براكەم خەیاڵت بۆ شتی خراپ نەڕوات من كەسێكی زۆر سادە و ئاساییم ئەوەی كە ڕوویداوە لە كاتێكی تردا بۆت باس دەكەم، كە گەڕامەوە نەرویج كتێبێكت بۆ دەنێرم وا بەشی دووەمی ئامادە دەكەم، ئەوكات دەزانی ئەمە چییە و چی ڕوویداوە. سێ ساڵی تریش ئەم ڕووداوە باس دەكەم و لە كتێبێكدا دەیخوێنیتەوە بەناوی مەملەكەتی شەیتان.

سامان: یەعنی پێم ناڵێیت تۆ كێیت و چیت؟

ماكوان: من سوپەرمانم و لەگەڵ سپایدەرمان، جارجاریش دەبم بە رجل واطواط.. باشە؟

سامان : پێم ڕادەبوێریت!

ماكوان: جارێ كاتی ئەو قسە قۆرانە نییە، وابزانم بەم زووانە لە من تێناگەیت پێویستە ماوەیەك هاوڕێیەتیم بكەیت تا زیاتر یەكتر بناساین باشە؟

سامان: لەخزمەتدام كاك ماكوان.

لەگەڵ ساماندا لەم قسەنەدا بووین كە منی لێ ببوو بە خەیری زینە وەكو كوردەواری دەڵێت، لەپڕ كەسێك لەگەڵ منداڵێكدا لە لامدا وەستا و وتی تۆ اغا ماكوانیت؟

ماكوان: بەڕێزتان ئیقباڵن؟

ئیقباڵ: بەڵێ؛ منم

ماكوان: ئەی كوا سەلامو الله؟

ئیقباڵ: منداڵەكەمە، ئەوەیە لەگەڵمدا.

ماكوان: وەڵڵا من وامزانی سەلامو الله ئێستا یەك تۆپ قوماشی كردۆتە جامانە، ئەم كوڕە جوانكیلەیە؟ لە چینیەكان دەچوو قژێكی خاوی هەبوو، تەمەنی ٩ ساڵ بوو، جانتایێكی منداڵانەی بەشانەوە بوو زۆر قورس دیار بوو بە شانیەوە.

منیش دەستێكم هێنا بەسەریدا و دوو جار وتم ماشاءالله، تبارك الله احسن الخالقین، جانتاكەت بدە بەمن. منداڵەكە خۆی راپرسكاند، ئاسایی وەرم گرت ووتم حەتمەن یاری خۆی تێدایە و دڵی نایەت پێمی بدات.

چووینە دەرەوە لە فڕۆكەخانەكە هەستمكرد چەند كەسێك بەدوامانەوەن لە شووشە و جامەكانەوە تەماشام دەكرد دوو كەسی ڕیشن بوون، باڵایان زۆر بەرز بوو لە عەرەب دەچوون. بە ئیقباڵم وت جەگەرە ئەكێشی؟

ئیقباڵ: نا

سامان: من پاكەتەكەی ئەو ڕۆژەم پێیە جگەرەیەكت پێ بدەم؟

ماكوان: سەرو جگەرەیەكمان پێ بە، لای ئەو جێگایە جگەرەیە دەكێشم هەست دەكەم خەڵك بە شوێنمانەوەیە.

وەستاین و سەرو جگەرەیەكمان پێكرد و دوانەكە بەلاماندا تێپەڕین زۆر ئاسایی بوون. بە ئیقباڵم وت ئەوانە دەناسی؟

ئیقباڵ: نا نایانناسم.
ئیتر بۆم دەرکەوت هەر خەیاڵاتی خۆم بووە جگەرەکانمان فڕێدا و چووینە لای سەیارەکە سەرکەوتین بۆ کۆڵن، بەسامانم وت دەزانی سایەقی بکەیت؟ من حەزدەکەم قسە لەگەڵ ئیقباڵ بکەم.
سامان: بەڵێ بەڵێ، ئاسودەبە پشووی خۆت وەرگرە.
سەیارەکەم وەستاند و دابەزیم سامان لێی بخوڕێت، لەکاتی دابەزینم دیسان هەردوو کەسەکەم بینی بە لاماندا تێپەڕین، ئەمجارەش وتم ئاساییە لەوانەیە ئەوانیش لە فڕۆکەخانەوە ڕۆنەوە بۆ ناو شار. بە سامانم وت دەڕۆین بۆ دۆنەرەکەی حوسێن.
سامان: ئەرێ کاك ماکوان لەم وڵاتەدا دۆنەر نەماوە حوسێن نەبێت؟ من شوێنی زۆر خۆشتر پێدەزانم دەتانبەم بۆ ئەوێ باشە.
ماکوان: نا، لێخوڕە بۆلای سەیدا حوسێن، ئەگەر تۆ حەز ناکەیت مەیە کاکە ڕۆرەوە بۆماڵەوە.
سامان: هەرچی تۆ بڵێیت.
لەناو سەیارەکەدا بە ئیقباڵم وت: ئەو شتانەی کە الله بەخش وتی هاتووە، هێناوتە دەرەوە؟
ئیقباڵ: بەڵێ هەمووی گەیشتووە و لامە.
ماکوان: چییە و چۆنە، ئەتوانم بیبینم؟
ئیقباڵ: بەڵێ، دوو کیلۆ ئاڵتونە و لەگەڵ چەند موجەسەمەیەکدا لە کۆڵە پشتەکەی سەلامو الله دایە. ماکوان: ئەی السلام الله علی سەلامو الله ی کورت، ئەمە بۆیە خۆی ڕاپرسکاند، ئاڵتونەکان چین؟
ئیقباڵ: سکەیە، وە بازنی کۆنە و ملوانکەیە لەگەڵ تاجێکدا، چەند پەیکەرێك و موجەسەمەیەکی بوزیە کۆنەکانە بە ئاڵتون.
ماکوان: تۆ خۆت کەس دەناسیت لە ئەوروپا؟
ئیقباڵ: ناوەڵڵا کەس ناناسم.
ماکوان: ئەی چۆن متمانە بە من دەکەن، تۆ و الله بەخش؟
ئیقباڵ : حاجی عەلی ئەردەشیر زۆر باسی تۆی کردووە وتی زۆر موسوڵمانە، ئەو خزمی ئێمەیە.
ماکوان: باشە، با سەیری بکەم.
هەمووی دەرهێنا و دانە بەدانە سەیرم کرد و دامەوە دەستیان، سەلامو الله کردیەوە شانی.
پێم ووت داینێ با ئیسراحەت بکەیت، کەچی بەقسەی نەکردم زۆر وریا دیار بوو.
بەدەم قسە کردنەوە گەیشتینە لای دۆنەرەکەی حوسێن، من و ئیقباڵ و منداڵەکەی دابەزین. بە سامانم ووت ڕوات سەیارەکە پارك بکات و بێتەوە بۆ لامان

حوسێن زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین و ماستاوی عوسمانلی بۆ هێناین لەگەڵ زەڵاتەیەکی تایبەت، بانگم کردە لای خۆم وتم ئیشم پێتە و حەزدەکەم بەیەکەوە ئیشێك بکەین، بەڵام سەر ڕاستبە لەگەڵمدا سودێکی باش دەکەیت و ڕزقێکی حەڵاڵ ئەگەر خوای گەورە دای دەیخۆین بەیەکەوە، باشە سەیدا حوسێن؟

حوسێن: من لەخزمەتم لەم دەست بۆ ئەو دەست، چیم پێدەسپێری دەیکەم، تۆ شێخی منیت و من موریدی تۆم.

ماکوان: نا- نا؛ استغفرالله ئێمە برای یەکین وامەڵێ پێم خۆش نییە، هەڵسام چومە سەر مێزێك خۆم و ئەو بەتەنها لەڕاستیدا حوسێن پیاوێکی زۆر قەڵەو و زل و بەهێز دیار بوو چوار ئەوەندەی من دەبوو، دانەویەوە دەستم ماچ بکات، پێم ناخۆش بوو دەستی ماچ کردم و منیش سەریم ماچ کرد.

حوسێن: تۆ لێم ڕازیبە و ئازارمان مەدە چی دەڵێیت بۆت دەکەم.

ماکوان: استغفرالله، خوای گەورە لێمان ڕازی بێت، من خزمەتکاری پیاو چاکو موسوڵمانانم ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم کە بۆچی زانایانی ئەم ئیسلامە کارکردنیان بە جنۆکە حەرام کردووە، چونکە فیتنە دروست دەکات.

ئەوکەسەی کە کار بە جنی کافر و موسوڵمان بکات هەر دروست نییە، چونکە لوت بەرزی و خۆ بەزلزانی بۆ دروست دەکات، پەنا بەخودا زۆر جاریش خۆی لێدەبێت بە خودا، بیریشی ناکەوێتەوە کە مرۆڤێکی زۆر سادەو ئاساییە.

لەوکاتەدا سامان هات ویستی لامان دابنیشێت، بەڵام پێم وت ڕوات بۆ لای ئیقباڵ دانیشێت با ئەو تەنها نەبێت، زۆر لای سەیربوو کە لەگەڵ ئەو بەتەنها دانیشتووم، دەستم کردەوە بە قسە کردن بۆ سەیدا بۆم باسکرد کە چیمان پێیە و چیمان هەیە، بەڵام وا تێمگەیاند کە ئێستا پێمان نییە و لە شاری نویس- ە ئەگەر کڕیار هەبوو ئەوا دەچم بۆی دەهێنم، لە شوێنێك تەماشای دەکەین.

حوسێن: خەمت نەبێت کڕیارم هەیە، ئەگەر ڕاستی بێت هەموویت بۆ دەفرۆشم.

ماکوان: دڵنیابە ڕاستە و قسەی ڕاستی لە من دەبیستی.

حوسێن: کەسێکی جولەکە دەناسم ئیشی ئەو کارەیە هەموو شتێکی شەرقی دەکڕێت، بەڵام لە هۆڵەندایە دەبێت بیهێنم بۆ ئێرە و وێنەکانی بۆ بنێرم تاکو دێت، دەتوانیت وێنەم بۆ بنێری؟

ماکوان: بەسەر چاو کە چوومەوە بۆ نۆیس لەوێ وێنەیان دەگرم و بۆت دەنێرم بۆ ڤایبەرەکەت، با جارێ نانەکەمان بخۆین.

نانمان خوارد و گەڕاینەوە بۆ ماڵی سامان دوای پشودان وێنەکانم گرت و ناردم بۆ حوسێن، دیاربوو ئەویش دەستبەجێ ناردبووی بۆ کابرای جولەکە و ڕاستەوخۆ پەیوەندی پێوەکردبوو، وتبووی من هەمووی دەکڕم چی تریان هەیە دەمەوێت، ئەگەر دەڵێن ئێستا لەشاری ئاڕنێمەوە لە هۆڵەنداوە دێمە لاتان.

ماکوان: ئێستا درەنگە، هەوڵ بدات بەیانی بێت.
حوسێن: ئەو شارەی ئەو دوور نییە دەتوانێت بێت.
ماکوان: ئاخر من لە هوتێلدام حەزناکەم کەس بێت بۆ لام، خۆم بەیانی دێم بۆ کۆڵن، نەمهێشت بزانن لە ماڵی سامانم.
حوسێن تەلەفۆنی کردەوە: بەیانی با هەمووومان لە باخچەی ئاژەڵانی کۆڵن یەکتر ببینین، ئەوێ گەورەیە و کافتریاشی لێیە دادەنیشین و مامەڵە دەکەین، ئەمەش ناونیشانەکە. (Cologne Zoological Garden)
منیش ئیقباڵم تێگەیاند لەوەی کە لەدوای ئەوەی ئەم وەجبەیەت فرۆشت هەوڵبدە خۆت مامەڵەی لەگەڵ بکەیت، بۆ ئەوەی ئیتر ئێمە نێوەندگیر نەبین، باشە؟
ئیقباڵ: باشە!
ماکوان: دەبێت ئەوە باش بزانیت ئەم جۆرە کڕین و فرۆشتنانە بەجۆرێکن کە دەبێت پارەیەکی زۆری لێ خەرج بکەیت، چونکە خەڵکی تەماعی تێدایە.
دەبێت بەشی سامان بدەیت کە لە ماڵی ئەویت، وە دەبێت بەشی حوسێن بدەیت کە کڕیاری دۆزیوەتەوە، من نامەوێت ئەوەندە گرنگ نییە لەلام، بەڵام بۆ جارێکی تر کە بەردەوام بوویت باشە ئیقباڵ؟
ئیقباڵ: باش دەزانم وە هاوکاری تۆش دەکەین، ئەم بەشەی کە هێناومانە تەنها بۆ ئەوەیە کڕیار بدۆزینەوە پارەکەی هەمووی بۆ تۆ، الله بەخش پێی وتووم با ماکوان بە پارەکە کۆمەڵە کەسێکمان بۆ پەیدا بکات تا هاوکارمان بن لە مامەڵەکانی تردا.
ماکوان: باشە کەواتە لە جۆری ئیشەکە و حاڵەت و سروشتی کارەکە دەزانن ئەوەم پێخۆش بوو من خۆم تەماعم نییە، بەڵام خەڵکی لەم کارانەدا تەماعیان زۆرە.
ئیقباڵ: باش تێگەیشتووی، خەمت نەبێت کاکە ماکوان.
بۆ بەیانی لەسەر مەوعید و پەیمانی خۆمان بەرەو باخچەی ئاژەڵانی کۆڵن ڕۆشتین و دەستمان کرد بە قسە کردن، حوسێن لەدوورەوە هات سڵاوی کرد و وتی کڕیارەکەم ئامادەکردووە، ئێستا لە کافتریاکەدا دانیشتووە پرۆن بۆ لای، کە ئاوڕمداوە نە ئیقباڵ دیارە نە سەلامو الله.
سەیری دواوەم کرد ئیقباڵم بینی دەگەڕا ڕەنگی تێکچوو بوو، لێم پرسی چیبووە؟
ئیقباڵ: سەلامو الله دیار نەماوە.
تەنها من و ئەویش دەزانین کە ئاڵتونەکان لەناو کۆڵەپشتەکەی سەلامو الله دایە، کە لەدەرگاکە هاتمە ژوورەوە ئەو دوو کەسەم بینی کە لە فڕۆکەخانە بینبوومن، بەڵام ئەو کات زۆر خەڵکی لێبوو قەرەباڵغ بوو وا هەستم کرد ئەوان نەبوون، بەڵام بەدیار نەمانی سەلامو الله دڵنیابووم کە ئەوان بوون، بۆیە خێرا بە سامان و ئیقباڵم وت بەدوای ئەو دوو کەسەدا بگەڕێن سەلامو الله لای ئەوانە.

حوسێن: چی بووە؟
بۆم باس کرد چی ڕوویداوە، خوا هەڵناگرێ خێرا هات و دەستی کرد بەگەڕان.
حوسێن: منیش لەگەڵتان دێم، ئەو منداڵەبوو کە دوێنی لەگەڵتان بوو؟
ماکوان: بەڵێ؛ بەڵام ڕۆ بۆ لای کڕیارەکە دۆخەکەی بۆ باس بکە بڵێ لە کۆڵە پشتێکی منداڵانەدا بووە وە منداڵەکە دیار نییە با متمانە لە دەست نەدەین.
ئیقباڵ دەگریا و منیش بیتاقەت بووم خێرا سامانم نارده لای دەرگای چوونە دەرەوە بوەستێت و خۆشمان لە ناوەوە دەگەڕاین.
لەپڕ سامان تەلەفۆنی بۆ کردم وتی ڕاکەن منداڵەکەیان فڕاند و نەمتوانی هیچ بکەم، خێرا فریاکەون!
ڕامانکردە لای سامان دەموچاوی هەمووی خوێن بوو، بەڵام ئاقڵ بوو بە تەلەفۆنەکەی ڤیدیۆی گرتبوو تا ئەو کاتەی سواری ئۆتۆمبێلەکەیان دەبن ئۆتۆمبێلەکە لە جۆری دیسکەڤەری بوو، بەڵام دوای لێدانەکەی وێنەی گرتبوون بەشڵەژاوی.
ماکوان: سامان نەتناسین کێ بوون، چۆن بوون؟
سامان: ئەو دوو کەسە بوون کە لەفڕۆکەخانە بینیمانن.

هەناسەیەکم هەڵکێشا و وتم سەسیل، حەزقیل، ڕاقی، برقان فریام کەون!
یەکسەر پەشیمانیم دەربڕی و هاوارم کرد استغفرالله، خوایە فریامکەوە.
خەریکە سەرلێشێواو گومڕابم، خوای گەورە کردی گەڕامەوە بۆ لای خوای خۆم.
ماکوان: ئیقباڵ ئەو دوو کەسە ناناسیت؟
ئیقباڵ: نەوەڵڵا؛ نەمبینیون لە ژیانمدا.
ماکوان: سەیرە!
سامان: بەڵام ئاگاداربە جانتاکە بە شانی سەلامو اللەوە نەبوو.
ماکوان: حەتمەن بەجیا بردوویانە، ئیقباڵ دەگریا زۆر بەزەییمان پێی دەهاتەوە، کابرای جولکە و حوسێنیش هاتن بۆ لامان، لەپڕ ڤایبەری من لێیدا تەماشام کرد الله بەخشە. وتم کەس قسە نەکات با جارێ ئەو هیچ نەزانێ گوناحە.
الله بەخش: ماکوان ئیقبالم بدەرێ دەستیان کرد بە قسە و ئیقباڵ بەگریانەوە قسەی دەکرد، ئەوکەسانەی کە سەلامو اللەیان ڕفاندبوو پەیوەندیان بە الله بەخشەوە کردبوو.

## دۆزینەوەی سەلاموالله و لەدەستدانی ئاڵتونەکان

اللەبەخش تەلەفۆنی کرد و داوای کرد لەگەڵ ئیقباڵ قسە بکات، دوای داخستنەوەی تەلەفونەکەیان ئیقباڵ ئەوەی باس کرد کە کۆمەڵێك لە ساحیرەکانی هیندستان بەجێگاکەیان زانیووە ئێستا داوای هەموو ئاڵتونەکان دەکەن، یاخود منداڵەکە دەکوژن بێجگە لە منداڵەکە واز لەوانی تریش ناهێنن!
ماکوان: ئەی نەیوت سەلاموالله لە کوێیە؟
ئیقباڵ: نازانین، باوکم ژمارەکەی تۆی داونەتێ، تەلەفۆن بۆ تۆ دەکەن.
ماکوان: ئێستا چی بکەین؟
کەس نەیدەزانی چی بکەین هەموومان بەدەوری خۆماندا هەڵدەسوڕاین و کابرای جولەکەش بەدیارمانەوە وەستابوو، لەگەڵ حوسێن قسەی دەکرد ئاگام لە سامان بوو زۆر دەترسا.
سامان: کاك ماکوان بڕوا بکە تازە ئەو هیندیانە واز لە ئێمە ناهێنن.
ماکوان: وەڵڵا سامان گیان ئەمە ژیانە یان ئەوەیە نابێت هاوڕێیەتی من بکەیت یان ئەوەتا ژیان لەگەڵ من وەکو ڕەمزی لێدانی دڵە، ژیان بەرزو نزمە

لای من. زۆر چالاکین لە ژیان، دونیا هەموو کەس لەبیربکات من لە بیرناکات خۆشەویستی یەکین، جا مادام تۆش لەگەڵمدا هاوڕێیت دەبێت بەرگە بگریت، خۆ ئەگەر خۆراگر نەبیت خوات لەگەڵ براکەم، تەنها ڕێزو خۆشەویستمان هەیە.
سامان: وەڵڵا بڵێم چی کاك ماکوان، من تازە ژنم هێناوە دەمەوێت ماڵ دروست بکەم، کێشەی خێزانیم زۆرە با کێشەی تریشم بۆ زیاد نەبێت، ئەگەر بەلاتەوە ئاسایی بێت من حەزدەکەم ئەوچەند ڕۆژەی لێرەبوویت خزمەتم بکردیتایە، بەڵام حەزم بەم کارە نییە و ماڵ ئاواییتان لێدەکەم.
ماکوان: زۆر ئاساییە براکەم خوات لەگەڵ عەزێتمان دایت، بەڵام دێین جانتاکانمان دەهێنینەوە لەماڵتان و دەڕۆین، ماڵەکەت ئاوا بێت.
حوسێن: توڕە بوو دەستی کرد بە جنێودان بە سامان و تفێکی لێکرد: ماکوان تۆی نەدەناسی خۆی خستە ناڕەحەتی و ئازار بۆ تۆ، ئەگەر یەك تۆز مەرد بوویتایە ئاوا لەم کاتەدا جێت نەدەهێشت، تف داوەشێیت. ماکوان برای منە هەر ناهێڵم بێتە لای تۆ.
ماکوان: نا - سەیدا حوسێن، کاکە بۆ خۆی ئازادە باپڕوات. ڕاست دەکات با تووشی کێشە نەبێت تازە ژنی هێناوە، وازی لێبێنە با پڕۆین سامان سەرکەوە دێین بۆ لای تۆ جانتاکانمان دەبەین و دەڕۆین.
سامان: باشە باپڕۆین.
سەرەتا چووینە ماڵیان و دەستمان کرد بە جانتا کۆکردنەوە، خەریکی جانتاکان بووم لەگەڵ ئیقباڵ دا هەرچەند دڵی زۆر پڕبوو دەگریا بۆ سەلاموالله، سامانیش خەریکی چا دروستکردن بوو، لە خواریشەوە حوسێن چاوەڕێی دەکردین لەگەڵ کابرای جولەکە بۆ ئەوەی هوتێلێکمان بۆ بدۆزێتەوە.
سامان: هاتە لام و بەدەم گریانەوە وتی کاك ماکوان زۆر زۆر داوای لێبوردن دەکەم نەدەبوو ئاوام بووتایە، لەوکاتەدا ترسێکی زۆر دایگرتبووم زۆر خەجاڵەتم، ماڵی خۆتە تا مردن لەگەڵتم چۆن دەهێڵم پڕۆن بۆ هوتێل.
ماکوان: نا- سامان گیان، نامەوێت بە بۆنەی منەوە توشی کێشە و چەرمەسەری ببیت، لەبەر ئەوە من دەڕۆم و تۆش هیچ مەجبور نیت لەگەڵ کەسێکی نەناسراودا کە ئەفغانە خۆت پیاو خراپ بکەیت.
سامان: بەخوا ناڕۆن ئەگەر سەرم دانابێ ناهێڵم پڕۆن، بابە قسەیەك بوو کردم زۆر هەڵەبووم، ئیتر شەکری وا ناشکێنم و ناهێڵم پڕۆن مەگەر بەسەر لاشەمدا هەنگاو بنێن.
ماکوان: ئاخر سامان من بەرگەی قسەیەکی تری ئاوا ناگرم، یان لەهیچ شتیك لەگەڵماندا بەشدار مەبە یان برایەتیمان بکە.
سامان: ئەوخەمە سەر سەر و چاوم، تۆ هەرچی بڵێیت من لە خزمەتدام.
ماکوان: پڕۆ حوسێن و ئەو جووە بانگ بکە سەرەوە و لای ئەویش بڵێ من ناهێڵم ماکوان پڕوات، کە ئەو قسەیەم کرد لەوکاتەدا لەسەر خۆم نەبووم چۆن دەستیان لێ هەڵدەگرم.

سامان: باش هەر ئێستا.
چوو حوسێن و جولەکەکەی بانگ کردە سەرەوە لە خواریشەوە حوسێن ئەوەندەی تری پێکردبوو.
حوسێن: هیچ خەمت نەبێت ماکوان شوقەیەکم بۆ پەیدا کردوویت بچۆ ناوی.
سامان: تەواو باسی ئەو مەوزوعە مەکەن، ماکوان ماڵی خۆیەتی.
ماکوان: دەستتان خۆش بێت، حەز دەکەم تۆزێك موجامەلەی ئەم جولەکەیە بکەم، حوسێن بڵێ ماکوان دەڵێت ناوت چیە؟
حوسێن: ناوی ڕافی- یە خەڵکی هۆڵەندایە.
ماکوان: زۆر سوپاسی بکەن کە بەدەممانەوە هات و جێی نەهێشتین، پێشی بڵێ لەم کێشەدا دەرچووین ئاڵتون شتەکان زۆرن جگە لەو بەکەسی تری نادەین.
ڕافی: زۆر سوپاست دەکەن بەڕێز ماکوان، من دەگەڕێمەوە بۆ هۆڵەندا.
ئاقڵ بوو لەبەرچاوی هەموویاندا تەلەفۆن کارتی خۆی دامێ کە ئەوە دەلالەت بوو من ڕاستەوخۆ پەیوەندی پێوە بکەم و حوسێن لە یاریەکە بکاتە دەرەوە.
زۆر سوپاسم کرد و پێم ووت کە کارتەکە بدە بە حوسێن ئەو برا و پشتی منە لەوی وەردەگرم لای ئەو نافەوتێت، کە وام وت حوسێن زۆری پێخۆش بوو زانی پیاوی خیانەت نیم.
حوسێن و ڕافی ڕۆیشتن، ئیقباڵ ئەوەندە بەکەساسی دەگریا منیشی خستە گریان.
سامان: کاک ماکوان ئەوە دەگری؟
ماکوان: بۆ گریانی ئیقباڵ دەگریم، ئەو باوکە و منیش باوکم هەست بە ئازار و ناڕەحەتی و ئەو سوێیەی کە هەیەتی ئەی چێژێت دەکەم.
سامان: وەڵڵا وامزانی لەژیانتا ناگری تۆ، ئەوەندە ڕەق هاتیتە بەرچاوم.
ماکوان: براکەم خۆ من ڕۆبۆت نیم منیش مرۆڤم هەست و سۆزم هەیە، لەوانەیە ئەو ئازارانەی کە من چەشتومە تۆ هەر پەیت پێنەبردبێت.
من بۆ گریانی زۆر کەس دەگریم.
کە عەرەبانچیەك دەبینم پاڵ بەعەرەبانەکەیەوە دەنێت بۆی دەگریم، چونکە هەڵسوکەوتم لەگەڵیدا بووە ئەزانم هێزی ئەو لەدەستیدا نییە، هێزی ئەو لە منداڵەکانیایەتی کە لەماڵەوە چاوەڕێی نانی ئێوارە لەو دەستە زبرانەی دەکەن. من هەموو کاتی بارانێك دەگریم، چونکە دەزانم هەزاران کرێکار لەبەر باراندا بلۆك دەخەنە سەریەك و جبلەی چیمەنتۆ دەکەن و وەستاکانیان بەجنێودان پێیان دەڵێن خێراکەن بارانەکە چیمەنتۆکەمان بەفیڕۆ دەدات.
من دەگریم کاتێك بەفر دەبارێت ئەگەر لێم بپرسن بۆچی دەگریت، بە درۆوە دەڵێم یادگاریەکانی سلێمانیم بیر دەکەوێتەوە، بەڵام بۆ ئەو ماڵە هەژارانە دەگرم کە نەوت لەچرا و زۆپاکەیاندا نییە و ماڵەکانیان بێ تاپۆیە و شوشەی پەنجەرەیان نییە، من ئاوا دەگریم.

من دەگریم کاتێك گەنجێك دەبینم بەلای مێزێکەوە دانیشتووە کارتی مۆبایل دەفرۆشێت و لەگەڵیشیدا پیلی سەعات دەگۆڕێت، چونکە هەموو ئاوات و خۆشیەکانی لە سەرمێزەکەی هەراج دەکات، زۆر بە بەهێزیش خۆی نیشان ئەدات. من دەگریم بۆ ئەو پیاوە پیرانەی کە تەزبیح دەفرۆشن یاخود لفکە یان شقارتە دەفرۆشن، بۆ ئەو ژنانە دەگریم کە لە بازاڕدا کنگر و دەستگێڕن، من چەندین جار لەماڵی خۆماندا قسەم پێ وتراوە لەبەر ئەوەی هەرچی پارەم پێبووە داومە بەو ژنە دەستگێڕانە. وتوویانە تۆ شێت بوویت ماکوان بۆ وادەکەیت؟ ئەوان بێئاگان لەوەی من بە گریانەوە لێیان دەکڕم و دەڵێم پێش ئەوەی لە باوەشی شەرواڵ پیسێکدا گەرمیان بێتەوە باپڕۆنەوە لە ماڵەکەی خۆیاندا بەو پارە گەرمیان بێتەوە لە ناو کەسوکارەکەیاندا. من دەگریم بۆ ئەو کچانەی کە باوکیان پارەی نییە جلو بەرگی قوتابخانە و قردێلەیان بۆ بکڕێت.
پڕوا ناکەم بەڕێوبەری پۆلیس و ئاسایش و ئەندام پەرلەمان و دەسەڵاتدار و ئەوانە بگرین، چونکە ئەوانەی من باسم کرد خۆم بینیوومە بۆیە دەگریم، بەڵام ئەوان نەیان بینیووە ئەوان دەریان دەکەن لەسەر سکی ئەوان دەژین یان لەسەر دەنگیان بەرز دەبنەوە.
من چۆن نەگریم لەبەردەممدا منداڵێکی سواڵکەر ئەمرێت، ئەزانی منداڵە سواڵکەرەکە بۆچی مرد سامان گیان؟
سامان: نەوەڵڵا؟
دایکی برسی دەکرد لەبەر ئەوەی بۆ ئەوەی سواڵی پێ بکات تا منداڵەکەی بگریی و دواتر لە برساندا مرد. هێشتا ناگریت لەگەڵمدا فرمێسك بەچاوتاندا نایەتە خوارەوە کە گەنج بە لارە ملی زانکۆ و پەیمانگاکانیان جێهیشت لەبەر کوڕان و کچانی ورگ زلەکان.
ئەزانی بۆچی ڕەقیشم؟
سامان: نەوەڵڵا کاك ماکوان گیان؟
لەبەر ئەوەی زۆر کەسم بینی باسی شەرەفی دەکرد کەچی خۆی بێشەرەفترین کەس بوو، زۆری تر باسی دەستپاکیان دەکرد دز و جەردە دەرچوون. خەڵکم بینی باسی داوێن پاکی دەکرد دواتر بۆم دەرکەوت خۆی داوێن پیسترینە، زۆرم بینی باسی نیشتیمان پەروەری دەکرد کەچی خۆی جاش و نیشتیمان فرۆش دەرچوو، زۆری ترم بینووە...
ئەوەی سەرەتا باسم کرد دڵم نەرم دەکات و دەمگرێنێت، بەشی دووەمی قسەکانی تریشم دڵم ڕەق دەکات و دەموەستێنێت، ئەمانە ماکوانیان دروست کردووە. بۆیە بڕیارمداوە هەتا ماوم پشتگیری خەڵکی هەژار و کوڕی چاك بم، چونکە خۆم لەوانم وە هەتا بۆشم بکرێت لە هەمبەر ئەوانەی تر ڕق لە دڵ بم، چونکە بێشەرەف و داوێن پیس و جاش و خاك فرۆشن.
لەم قسانەدا بووین لەپڕ زەنگی تەلەفۆنەکەم لێیدا لە هیندستانەوە بوو، یەکێك بە ئینگلیزی قسەی دەکرد دەنگی لە ئەمیتا باجان و شامی کاپور

دەچوو، بە ئینگلیزیەکی هیندی قسەی دەکرد منیش ئینگلیزیەکەم دوکەڵ دەکات ناچار وتم بوەستە، ئاماژەم کرد بۆ سامان وتم ئینگلیزیت باشە؟
سامان: نەوەڵڵا؛ منیش هیچی لێنازانم.
ماکوان: ئیقباڵ تۆ دەزانی؟
ئیقباڵ: خوبە، خراپ نیم.
دامە دەستی و دایان بەیەکەدا من و سامانیش بە دیاریەوە وەکو تەلەفزیۆن تەماشامان دەکرد، بەسامانم وت وەرەقە و قەڵەمێکی بۆ بێنە بۆ ئەوەی بینوسێت تا قسەکانی بیر نەچێتەوە تۆماری بکات، تەلەفونەکەی منیش ئۆتۆماتیکی دەنگەکەی تۆماری دەکرد.
کە تەواو بوو پرسیم چی بووە ئیقباڵ؟
ئیقباڵ: داوای ئاڵتون و شتەکان دەکەن کە دەرمان هێناوە.
ماکوان: ئێ بردوویانە، بڵێ سەلاموالله‌مان بۆ بهێننەوە کەلوپەلەکانیش ببەن بۆ خۆتان.
ئیقباڵ: بەس سەلاموالله یان بردووە ئاڵتونەکەنیان لا نییە.
ماکوان: چۆن شتی وا دەبێت درۆ دەکەن، ئەی لە کۆڵە پشتەکەی سەلاموالله نەبوو؟
ئیقباڵ: بەڵێ وابوو، بەڵام من فێرم کردبوو ئەگەر شتێك ڕوویدا جانتاکە فڕێداتە جێگایەك یاخود بیشارێتەوە و شوێنەکەی بزانێت.
ماکوان: کەواتە لە باخچەی ئاژەڵەکان سەلام فڕێی داوە!
ئیقباڵ: ئەقڵم بۆ ئەوە دەچێت هەر وابێت.
ماکوان: تەلەفۆن بکە بۆ اللهبەخش بزانە کۆتا قسەیان لەگەڵ ئەو چی بووە؟
لەدوای ئەوەی قسەی کرد لەگەڵ اللهبەخش بۆی باس کردم هەر ئەوەندەیان وتووە ئەو شتانەی دەستتان کەوتووە دەبێت بیدەن بە ئێمە و بیگەڕێننەوە بۆمان، ئێمە خاوەنی ئەو گەنجینەیەین.
ماکوان: واتا اللهبەخش نەیوتووە چەندە و چییە و چۆنە؟
ئیقباڵ: نەخێر، هەر ئەوەندەی وتووە ئەوەی دەریان هێناوە ناردوویەتی بۆ ئەوروپا.
ماکوان: کەواتە تەلەفۆنیان بۆ بکەرەوە دڵنیابەرەوە کە ئاڵتونیان بەدەست گەیشتووە، ئەگەر وتیان نا هەوڵدە بەزمانی ئوردو بەسەلاموالله بڵێ چی کردوە لە جەنتاکە، ئەوان تێناگەن.
ئیقباڵ: ئوردو نزیکە لە هیندیەوە، با بە فارسی بیڵێم باشترە.
ماکوان: من نازانم گرنگ ئەوەیە بزانین چی کردووە لە جانتاکە.
بە تەلەفۆنەکەی من زەنگی دا لەگەڵ جەماعەتی هیندستان قسەیکرد، وتیان چاوەڕێ بکەن تەلەفۆنتان بۆ دەکەین.
ماوەیەکی پێچوو کەسێکی هیندی تەلەفۆنی کردەوە، دامە دەست ئیقباڵ ژمارەکە بەلجیکی بوو، ئیقباڵ دەستی کرد بەگریان لەگەڵ سەلامو الله

قسەی كرد، منیش خەریك بوو دڵم ئەتەقی بۆیە دانەیەكەم كێشا بەسەری ئیقباڵ دا ووتم كاتی ئەوە نییە بڵێ جانتاكەت چی لێكردوە با ڕزگاری بكەین.
لەگەڵ سەلامواللە قسەی كرد دیاربوو قسەی لێ وەرگرتبوو جێگاكەی زانیبوو، بەڵام خۆزگە هەر نەمانزانیبایە. سەلامواللە جانتاكەی فڕێی دابووە ئەو جێگایەی كە پڵنگە تیگەرەكانی لێبوو. لەدوای داخستنەوەی تەلەفۆنەكە ئیقباڵ زۆر بەخۆشی وتی: ماكوان دۆزیمەوە لەو جێگایەدایە.
تەماشایەكم كرد بەسەرسامیەوە: دڵت بەچی خۆشە خۆ ئێستا دەزانین كە سەلامواللە ماوە، بەڵام ئەوەی بچێت بۆ ئەو جێگایە بەساغی نایەتەوە، ئەزانی لەكوێدایە لای ٦ پڵنگی تیگەر هێزی یەك پیاكێشانی ١٠٠ بۆ ١٥٠ كیلۆیە!
سامان: ئەی باوكەڕۆ سەرەی ئەم فیلمەیە.
ئیقباڵ: ماكوان چی بكەین باشە؟
ماكوان: نازانم، تەلەفۆنی حوسێنم بەرێ.
سامان: لام نییە.
ماكوان: با بچین بۆ لای ئەو بۆ دۆنەرەكەی، هەڵساین بەرەو لای ئەو كەوتینە ڕێ لەدڵی خۆمدا دەموت حەزە، سەسیلە سیلاوی، ڕاقی سابونی ڕەقی، برقان وەكو بەرق وەرن ئیشم پێتانە، هیچ نەبوو كەس نەهات بەدەممانەوە.
ڕۆشتین بۆ دۆنەرەكە لەوێ ڕافی دانیشتبوو، چومە لای ڕافی و حوسێن هاتە لامان، "بە پێكەنینەوە" بەحوسێنم وت: بڵێ ڕافی ماكوان ئەڵێ بیستومە كە دەڵێن ئێوەی جولەكە زۆر ڕەزیلن ڕاستە؟ كە بۆی وەرگێڕا دەستیكرد بە پێكەنین.
ڕافی: ئێوە داوەتی منن، ئەوە جولەكەی هۆڵەندا و ئەوروپا نین ڕەزیلبن ئەوە جولكەی ئیسرائیلن!
ماكوان: حوسێن پێی بڵێ ئیسرائیلی خۆش دەوێت؟
ڕافی: نەخێر دژی ئیسرائیلم.
ماكوان: كەواتە هاوڕێ و ڕەفیقین.
ڕافی: موسوڵمان ڕقی لە جولەكەیە ڕاستە ماكوان؟
ماكوان: ڕاستە ڕقمان لە جولەكەی سەهیۆنی و ئیسرائیلەیە نەك لەبەر ئەوەی جولەكەیە، نا لەبەرئەوەی فەلەستینی داگیركردووە، هەروەكو ئێمەی كورد ڕقمان لە تورك و عەرەب و فارسە نەك خەڵكەكەی، بەڵكو دەسەڵات و سیستەمەكە، جا جولەكە ئەهلی كیتابن و لەماڵیشیاندا نان دەخۆین و ژنیشتان لێدەخوازین واتا حەزمان بە خزمایەتیتان هەیە.
ڕافی: ڕاستە وایە، ئەوانە دەزانم دراوسێی موسوڵمانم هەیە لە هۆڵەندا خەڵكی باشن.
باسەكەم گێڕایەوە بۆ جەماعەت كە جانتا ئاڵتونەكە نەگیراوە، بەڵكو لە جێگایەكدایە لە باخچەی ئاژەڵان لەناو بەشی پڵنگە تیگەرەكاندا، چۆن پڕۆین

بیهێنین؟ مەبەستیشمە شەوی بەسەردا تێپەڕ نەبێت پێویستمان بە منداڵێکە بچینەوە ئەو جێگایەو بەو کەسانە بڵێین ئەوە جەنتای منداڵەکەمانە نەیزانیووە فڕێیداوتەوە ئەو جێگایەو بۆمان بهێننەوە. جگە لەو ڕێگا چارەیە کەس چارەی تری لایە تا ئەو منداڵە ڕزگار بکەین؟
حوسێن: ئێستا من منداڵەکەی خۆم دێنم و دەڕۆین.
کەچووینەوە بۆ باخچەی ئاژەڵان من و حوسێن ئەو بانەی کە دەیکەینە دەستمان هێشتا فڕێمان نەدابوو بۆ پرسگەکەمان باسکرد کە چی ڕوویداوە، وتی نیو کاتژمێری تر پڵنگەکان دەکەنە ژوورەوە بچن بیدۆزنەوە و بزانن منداڵەکە فڕێیداوەتە کوێ. چووین هەموو جێگاکە گەڕاین لە بن دارێکدا دۆزیمانەوە و دامە دەستی ئیقباڵ و وتم کوڕەکەتی پێ ڕزگاربکە.

## مردنی ماکوان و ناردنی تەرمەکەی بۆ هیندستان

دوای ئەوەی کۆڵەپشتەکەمان دەرهێناو و دامە دەست ئیقباڵ و ئەوەشم پێ ووت کە ئاگاداری بێت، چونکە ئەو کۆڵەپشتە ژیانی کوڕەکەتی تێدایە.
ڕافی: ئەگەر مۆڵەتم بدەن لە ناو سەیارەکەدا تەماشایەکی دەکەم، کە هاتووم حەز دەکەم هەر بیبینم بزانم ڕاستە و قیمەتی چەندە.
هەموو لەو کاتەدا تەماشای منیان دەکرد، منیش خورپەیەك بەدڵمدا هاتوو ترسێکم لێ نیشت، بەڵام پێم ووتن کە ئاساییە با سەیری بکات، بەدەم ڕێگاوە بە فارسی بە ئیقباڵم وت: ئێمە کە چووینە ناو سەیارەکە تەماشامان کرد تۆ مەیە ناوەوە دابنیشی، لەدەرەوە بە نەوەك ڕابکات هەر بۆ ئاگاداربوونی خۆمان، چونکە دەبێت زیاتر لە جاران ئاگامان لەو ئاڵتونە سەخیفە بێت تا سەلام ئازاد دەبێت، کە سەلام ئازاد بوو ئیتر چاوی هەمووتان دەربێت.

چووینە ناوسەیارەکە و ئیقباڵ بەناوی ئاگاداری و پاسەوانیمان لەدەرەوەی سەیارەکە مایەوە، ڕافی تەماشای دەکرد و هەناسەی هەڵدەکێشا، تەماشای دەکرد و ملی بائەدا.
ماکوان: چییە ئەو هەموو هەناسەیە هەڵدەکێشێ؟ حوسێن پێی بڵێ چییە؟
ڕافی: قیمەتی ئەو ئاڵتونە لە خودی ئاڵتونەکەدا نییە، بەڵکو لە کۆنی و نەخشی ئاڵتونەکەدایە، لەگەڵ ئەو ناوانەی لەسەری هەڵکۆڵراوە.
ماکوان: نرخەکەی چەندە، بەنزیکەیی؟
ڕافی: پارەیەکی زۆرە، دەتوانین بیخەینە مەزادەوە لە سویسرا یان بەلجیکا، مۆزەخانەی وڵاتان بە خەیاڵی پارەی پێئەدەن.
بەڵام پێشنیارێکم هەیە ئەگەر قبوڵی بکەن، حوسێن بە ماکوان بڵێ بزانە پێشنیارەکەم قبوڵ دەکات.
ماکوان: بڵێ بزانم چییە.
ڕافی: ئەگەر هەفتەیەك بتوانن دەستی دەستیان پێبکەن ئەم ئاڵتونانە هەمووی تەزویر دەکەم و تەزویرەکەیان بدەنێ و کوڕەکە ئازاد بکەن.
ماکوان: بیرۆکەیەکی چاکە، بەڵام ئایا ئیقباڵ دەتوانێت بەرگە بگرێت؟
ڕافی: بۆ پێی ناڵێیت؟
ماکوان: باشە! بانگی ئیقباڵم کرد و پێشنیارەکەم پێ وت، لێکدانەوەمان کرد بۆ ئەوەی کە منداڵەکە هیچ لێنەکەن، چونکە چەکی دەستی ئەوانە بۆ وەرگرتنی ئەو ئاڵتونە، جا بڕیار لای خۆتە.
ئیقباڵ: هەرچەندە زۆر قەلەقم با پرسێکیش بە الله بەخش بکەم.
تەلەفونی کرد بۆ الله بەخش و ئەویش ڕازی بوو.
ماکوان: تەلەفونیان بۆ بکە بڵێ وەرن با ئاڵتونەکەتان بدەینێ، بەڵام تا ڕافی ساختەی دەکات دەستی دەستیان پێدەکەین. بەگریانەوە قسەیان لەگەڵ بکە بابزانن ناڕەحەتیت و پەلەتە، با ئەوان پەلە لەتۆ نەکەن، بەم جۆرە بوارە دەرونیەکە پێچەوانە بکەینەوە، باشە؟
ئیقباڵ تەلەفونی بۆ کردن و ئەوانیش وتیان هەر کات ئێوە ئامادەبوون ئەوا ئێمەش ئامادەین، ئیقباڵ داوای کرد لەگەڵ سەلامدا قسە بکات و قسەیان کرد، من و ئیقباڵ هەردووکمان دەستمان کرد بە گریان. سەلام دەیووت بابە شەو خەوم لێناکەوێت بیرت دەکەم بیری دایکم دەکەم، بیری هەمووتان دەکەم. ئیتر من جەرگم بۆی دەکولا خەریکبوو پەشیمان ببمەوە بڵێم لە قەبری باوکی هەرچی ئاڵتونە بەرەو با سەلاموالله بگەڕێتەوە، هەرچۆن بوو هەردوولامان ئاراممان گرت.
بەرەو ماڵی سامان گەڕاینەوە، حوسێن و ڕافی ڕۆیشتن و ئاڵتونەکەم لەگەڵ خۆمان هێناو وتم بە ڕافی کە ئامادەبوویت بەیەکەوە هەموومان دەڕۆین. ئاڵتونەکان نابێت لە بەرچاوی من ون ببێت، نەك لەبەر ئەوەی متمانەم بە ئێوە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دوژمنمان زۆرە و ژیانی کەسێکیشی پێوە بەندە.
ڕافی: بێخەم بە لە تۆ زیاتر حەزدەکەم ئەو منداڵە ئازاد بێت.

ماڵ ئاوایمان کرد لەیەکتری، بە ئیقباڵم وت لەگەڵ سامان پرۆنەوە منیش پاش کەمێکی تر دێمەوە بۆ ماڵەوە ئاگات لە ئاڵتونەکان بێت، خۆت بمرە بەس ئاڵوتنەکان نەفەوتێت، ڕوونە؟
ئیقباڵ بەخەمباریەوە وتی ڕوونە، منیش وتم دەچمە جێگایەك بەڵکو ئەم جنۆکانە پەیدابن لەئەڵمانیان لەگەڵ خۆمن بۆ وا بەجێیان هێشتووم لەم کاتەدا نازانم.
بەناو بازاڕدا دەگەڕام بە ئومێدی بینینی جنۆکەکانی هاورێم، پەیدابوون بەڵام ئەوان نەبوون کە من دەمویستن.
سورکێو (ویرسان) پەیدابوو!
ویرسان هاتە تەنیشتم و لەگەڵمدا ڕێگای دەکرد: دەمناسی؟
ماکوان: دەتناسم چ ماڵێکی، هەر من دەتبینم یان خەڵکی تریش؟
ویرسان: بەئارەزووی دڵی خۆت؟
ماکوان: هەتیوو خۆ پێم نافرۆشیت، با خەڵك نەڵێن ئەم کوڕە شێت بووە خۆت دەرخە کە قسە دەکەین بەیەکەوە دەنا ئەو فڕێنم بە ئاسماندا بە کەلامی خوا.
ویرسان: باشە بۆ وا تورەیت؟ گوێگرە باش بزانە چی دەڵێم بەتەمای ئەوە نەبیت کە ئاڵتون تەزویر بکەیت! ئاگام لە هەموو شتێکتە، ئەوەی تۆ ئەتەوێت بەیەك مەرج سەردەکەویت ئەویش ئەوەیە بێیتە ناو گروپەکەمان و ببیتە کەسی یەکەمیش تێیدا هەموو بڕیار لەتۆ وەردەگرین. ئەوەی سەسیل کردی هیچ نەبوو خۆم فێری ئەوم کردووە، لە سەیارەکە موهیم ترت بۆ دەکەم ئەگەر بێیتە لامان.
ماکوان: جا ئەگەر وایە بڕیار لەمن وەردەگرن و من کەسی یەکەمم ڕازیم، هەموو موسوڵمان ببن و خواناسبن و دەستی برایەتی بۆ یەك درێژ دەکەین و لەم شەیتانی و خراپەکاری و سیحر و جادەوەت تەوبە بکە، ئەوەی من دەمەوێت ئەوەیە و تۆش برا گەورەبە ڕازیت؟
ویرسان: ئێمە ڕازین بە تۆ و بە هەموو بڕیارێکت، بەڵام بە بنەما و یاسا و دەستوری ئێمە نەك تۆ، وەکو خۆت دەڵێیت ڕوونە؟
ماکوان: بەڵێ ڕوونە، ئەزانی ئەوە کەی ڕوودەدات؟ ئەوکاتە ڕوودەدات کە ڕۆحم لە لاشەم جیا دەبێتەوە، ئەوکاتەش ئاستەمە شتی وا ڕووبدات ڕوونە؟
ویرسان: ئاگاداربە ساحیرەکانی هیندستان لەگەڵ من کاردەکەن، ئەو گروپە هیندیەش هەر لەگەڵ من کاردەکەن، جا ماکوان بڕوا بکە زۆر ئیشی جوان دەکەین، ئەوەی تۆ حەزی لێدەکەیت دێتە بەردەستت. کەس ناڵێت واز لە خواناسی و دینداری خۆت بهێنە، بەڵام گرێبەستی ئەوەمان لەگەڵ بکە کە لەگروپەکەماندا کار بکەیت، بۆ زانیاریش خۆشت لەگەڵ ڕافی ماندوو مەکە تەزویریشی بکات پێی دەزانین.
ماکوان: ئەوە باسی چی دەکەیت؟

ویرسان: ئێستا سامان بە ڤایبەر تەلەفۆنت بۆ دەکات، بزانە ئیقباڵ دەڵێ چی؟
ماکوان: فشەکەر ئەوە چییە دەڵێی فیلم و شتی وام لەگەڵ دەردەکەیت.
قسەکەم تەواو نەکرد زەنگم بۆ هات لەڤایبەر سامان بوو هەڵمگرت، ئیقباڵ قسەی کرد و ووتی: ماکوان ئێستا الله بەخش تەلەفۆنی کرد، هیندیەکان وتوویانە بەتەمای ئەوە نەبن ئاڵتونەکە ساختە بکەن دوایی منداڵەکە دەکوژین.
ویرسان پێدەکەنی منیش ئارامم لەبەر هەڵگیرا و هەتا توانیم دەستم داهێنایەوە بکێشم بە دەمو چاویا ئەوەندە بە هێزەوە گوژمم بۆ خواردەوە، کێشام بەدەم پیاوێکدا لەگەڵ دووکەسدا دەڕۆشتن ڕێك تەخت بوو، دوانی لەگەڵ بوو ڕایان کرد. منیش زۆر خەجاڵەتیم کێشا وتم ببورە ئازارێکم بۆ هات وویستم دەستم ڕاپرسکێنم تا ئەو خەڵکەم تێگەیاند لەوانەیە ١٠٠ جار وتبێتم ببورە ئازارێك لە قۆڵمدا بوو تەنها ویستم بیجوڵێنم بە قایمی
(Sorry, it was a pain in my arm, a movement lost to soreness)
باش بوو کابرام ئاشت کردەوە، تەلەفونم کرد بۆ سامان وتم وەرنە دەرەوە با بڕۆین.
هاتن و ڕۆیشتین بۆلای ڕافی وتم هیچ مەکە ئاشکرا بووین.
ڕافی: چۆن ئاشکرا بووین، جاسوسمان تێدایە؟
ماکوان: نا جاسوسی مرۆڤ نییە!
ڕافی: ئەی کێیە؟
ماکوان: جنۆکە و ساحیرەکان، هەواڵیان بۆ دەبەن.
ڕافی: منیش باوکم شتی وای بۆ باسکردووم.
حوسێن: سەیدا ماکوان چۆن دەزانی؟
ماکوان: منیش جنۆکەم هەیە.
حوسێن هاواری کرد الله اکبر! ڕافی زیرەی کرد و سامان نیوە ڕۆح بوو، وە ئیقباڵیش هیچ تێنەدەگەیشت.
ماکوان: ئەوە چیە حوسێن؟
حوسێن: هەر خۆم زانیم تۆ ڕۆحانیت.
ماکوان: نەوەڵا تەڕەماشم، رۆحانی چی ئەحمەدی نەژادیش نیم. گوێگرن تەزویرکردنی ئاڵتونەکان لەبیرکەن، ویرسان هەموو شتێك دەزانێت.
حوسێن: ویرسان کێیە؟
ماکوان: جنۆکەی ئەوانە، واز لەم قسانە بهێنن تەلەفۆنیان بۆ بکەن منداڵەکە بهێنن و لە گۆڕینەوەیەکی خێرادا با بکرێت ماندووبووم، دەزانم ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت. ئیقباڵ جارێکیتر تەلەفۆنیان بۆ بکە و پێیان بڵێ با بێن بەزووترین کات لەماڵی سامان بێت یان لە دۆنەری حوسێن منداڵەکە بهێنن و ئاڵوتنەکەیان بدەرێ.

ئیقباڵ تەلەفۆنی کرد پێی وتن ئێمە هەموو شتێکمان ئامادەیە و منداڵەکە بهێنن بۆ دۆنەرەکەی حوسێن، حوسێن ناونیشانەکە دانێ.
هەمووی دە خولەکی پێنەچوو لای الله بەخش تەلەفۆنمان بۆ کرا، داوای کرد کە دەبێت ئاڵتونەکان بگەڕێتەوە بۆ هیندستان و داوایان کردووە ماکوانیشی لەگەڵدا بێت ئینجا منداڵەکە ئازاد دەکەن.
ماکوان: ئەوە زۆر ئاستەمە هیچ کەس ناتوانێت ئەوە دەربکاتە دەرەوەی ئەوروپا، کەس ئەوەی پێناکرێت، ئایا منداڵەکە ئازاد دەکەن ئەگەر من بچم بۆ لایان؟
الله بەخش: وایان وت، دەڵێن ئازادی دەکەین بە مەرجێك ماکوان بە ئاڵتونەکانەوە بێت بۆ لامان.
تەلەفۆن داخرایەوە و وتم پێیان بڵێ منداڵەکە تەسلیم بکەن بە باوکی منیش و کۆڵەپشتەکە خۆمان تەسلیم دەکەین لەپرۆسەیەکی دەست بە دەست کردندا.
زۆر بێتاقەت بووم تەلەفۆنم کرد بۆ خێزانم پێم وت: حەزدەکەم لەگەڵ ئانا و لین قسە بکەم، دوای ئەوەی بە دڵ پڕیەوە قسەم کرد و پێم وتن دیاری جوانم بۆ کڕیون بەم نزیکانە دێمەوە چاوەڕێی سەرڤیسی ئۆتۆمبێلەکەم، نەمهێشت هیچ بزانن و تەلەفۆنم داخستەوە و پرۆسەکەمان ئەنجامدا.
سەلاموالله تەسلیم کرا و منیش بە کۆڵەپشتەکەوە خۆم تەسلیم کرد بەو دوو کورەی کە لە فڕۆکەخانە بینیمن.
سواری ئۆتۆمبێلێکیان کردم چوار کەس بوون دووان لە پێشەوە و دووانی تریش لەملاولامەوە دانیشتن، لە دڵی خۆمدا وتم: ئەگەر دەمانچە و چەکیان پێ نەبێت دەست ئەوەشێنم و ڕائەکەم چی دەبێت بابێت، بەڵام ترسی دەمانچەم هەبوو کە پێیان بێت بۆم ئاشکرا نەبوو، زوو زوویش ئەمکێشا بە قەبرغە و کەلە و سکیاندا بەنەرمی ئەمووت بزانم دەمانچە یاخود شتێکی ڕەقی تێدایە. نزیکەی نیو کاتژمێرێك ڕۆشتین و کردیانم بە بینایەکدا دیاربوو هوتێل بوو لە دابەزیندا ئەو دووانەی پێشەوە دەمانچەیان دەرهێنا و وتیان هەر جوڵەیەکی نەخوازراو بکەیت دەتکوژین.
بردمیانە ژوورێکی زۆر خۆش هەر خۆم بووم دەرگاکەم لێ داخرا هیچ تەلەفۆنێکی تێدا نەبوو، منیش تەلەفۆنەکەمم دابوو بە جەماعەت و تەنها سیمکارتەکەم خستبووە گیرفانم، بەحوسێن و ڕافیم وتبوو هەر گیرام و منداڵەکەیان ڕادەستکرد پەیوەندی بکەن بە پۆلیسەوە سیم کارت و پاسپۆرتەکەم لە گیرفاندایە بۆ ئەوەی لەوسەرەوە بتوانم بگەڕێمەوە، چونکە هیوای گەڕانەوەم هەبوو. ئەوانیش کارەکەیان ئەنجامدابوو، بەڵام پۆلیس بە گوێرەی پێویست نەهات بە دەمیانەوە.
لە هوتێلەکە مامەوە خۆم شۆرد و نوێژم کرد کەس نەهات بەلامدا خەوتم تا بەیانی هەر کەس نەبوو، کە هەستام ویستم بکێشم بەم دەرگاکەدا و دەستم دایە دەرگا و کرایەوە.

یەکێك لە کوڕەکانی فڕۆکەخانەکە بوو تۆزێ لە ئەمیتا باجان دەچوو ووتی: چیت دەوێت؟
ماکوان: برا ئەوە چییە دەڵێی دەوری ئەمیتا باجان دەبینی، بەیانیە برسیمە نانێك ئاوێك؟
ئەمیتا باجان: ئێستا پێیان دەڵێم برێك فاستت بۆ بهێنن.
ماکوان: سوپاس ئەمیتا گیان.
کردمیەوە ژوورەوە دەستی بەقەدەر قاچی دەبوو ئەوەندە درێژ بوو.
گەڕامەوە ژوورەوە و دەرگاکەم لەسەر داخرا گوێم لێبوو بە تەلەفۆن داوای کرد خواردنم بۆ بهێنن، منیش وام دانابوو ئەو پرواتو و دەرگاکە بشکێنم، بەڵام هیچ هیوام نەما.
کە گەڕامەوە حەزقیل لەسەر بێدەکە دانیشتبوو.
حەزە گیان یاخوا بەخێر بێیت!
حەزقیل: گوێگرە پلانەکە زۆر ترسناکە ئەمشەو بەنجت دەکەن بلیتی فڕۆکەیان پڕیووە بۆ هیندستان واتا گەشتەکەتان ئەڵمانیا- دووبەی- هیندستانە. بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر بەنجت دەکەن و ئەتخەنە ناو تابوتێك واتا مردوویت تۆ لەخانەوادەیەکی هیندیت و تەرمەکەت دەبەنەوە بۆ ئەوێ و تا دە کاتژمێر ئینجا دەگەنە ئەوێ، ئەوان لەوانەیە ئێوارە دەرمانی بێهۆشیەکەت بۆ بکەنە ناو خواردنی ئێوارەوە بۆیە ئێستا تێر نان بخۆ، بەڵام ئیترهیچ جۆرە خواردن و خواردنەوەیەك نەخۆیت بۆ ئەوەی نەخەویت تا ئەوخەنە ناو تابووتەکە، کەچوویتە فڕۆکەخانە لەوێ ئاگادارت دەکەمەوە وەرە دەرەوە، بەڵام لە دوای کۆتا خواردن کە بۆت دەهێنن خۆت بکە بەخەوتوو بۆ ئەوەی بزانن کاریگەری هەبووە دەرمانەکە.
ماکوان: ئەی ئاڵتونەکان ؟
حەزقیل: خەمت نەبێت بۆیە وادەکەن بۆ ئەوەی دەریبکەن بۆ هیندستان.
ماکوان: حەزەی برام ئەو ویرسانە بێ قیمەتەم بینی، زۆر سەخیفە ئاگادربە ئاگای لێمان نەبێت.
حەزقیل: خەمت نەبێت سەسیل چووە سەرقاڵیان بکات بۆ ئەوەی هەواڵەکەت بۆ بهێنم.
ماکوان: ئەی ئافەرین سەسیلە سیلاوی برامان.
دوای ئەوەی نانی بەیانیم خوار لە ژوورەکە چاوەڕێم کرد تا ئێوارە کاتژمێر ٥ بوو خواردنێکی زۆر خۆشم بۆ هات، هەمووشی لەسەری نوسرابوو حەڵاڵ، چەند جۆر ساردی و شەربەت و ئاو هاتبوو لەگەڵیا، ئەترسام لەوەی چاودێری بکرێم لەلایەن جنەکانی ویرسانەوە بۆیە دەست نوێژم گرت و دەستم کرد بە نوێژ و ئینجا بەدەنگی بەرز بەحساب نوێژم دەکرد نوێژی مەغریب مابووی، لەم ماوەیەدا نوێژکردن دروست نییە، بۆیە بەس قورئانم دەخوێند هەرچی شەیاتین بوو فڕاندمن بە کەلامی خوای پەروەردگار، دوای ئەوەی زۆرێك لە

خواردنەوەکانم ڕشتە تەوالێتەکە و هەندێکیشم هێشتەوە و خۆم کرد بەخەوتوو.
سندوقێکیان هێناو ناوەکەی هەمووی ئیسفنج بوو زۆر نەرم بوو دوو کونی خڕی لەملاولاکەیەوە هەبوو لاقاچیشمەوە کۆڵەپشتەکەیان پێچا بەسیمی ئەلەمنیۆم و خستیانە سەر سنگم و هەڵیانگرتم و ڕۆیشتن خەریك بوو دەخنکام، بەڵام چار نەبوو هەر دەبوو ئارام بگرم، لەو کاتەشدا خەریك بوو میزم دەکرد بەخۆمدا هیچ چارم نەما ئیسفنجم خوساند لەمیز، نزیکەی یەك سەعات زیاترمان پێچوو لە ڕێگادا دابەزین، ئیتر زانیم گەشتووینەتە فڕۆکەخانەی دۆسلْدۆرف، منیان تەسلیم کرد و ئاگام لێبوو سواری قایشەکیان کردم و دووجار دامی بە زەویدا ئیتر زانیم لەدەستی ئەمیتا باجان ڕزگارم بوو، دوو کرێکاری فڕۆکەخانە هەڵیان گرتم بمخەنە سەر ئۆتۆمبێلی گواستنەوەی جانتاکان بۆ ناو فڕۆکەکە.
حەزقیل هات تەنها بەدەنگ لەپەنای گوێمدا وتی پیابکێشە کاتی هاتووە.
منیش کێشام بە سەقفی تابوتەکەدا کەچی ئەو دوو کرێکارە منیان کێشا بە زەویدا و ڕایانکرد پشتم زۆر ئازاری پێگەیشت، ئەوەندە قایم کێشایان بەزەویدا تابوتەکە شکا، منیش هاتمە دەرەوە زیاد لە ٢٠ کرێکار و مۆزەفی لێبوو ئەو جێگایە هەموویان ڕایانکرد. منیش میزەکەم پێوە مابوو، یەکێکی پیریان هاتبووە لامەوە وای دەزانی لە بەهەشت هاتوومەتەوە ئاوی بەهەشتە پێمەوە هەر ئەیوت: "یزس، یزس" بە ئەڵمانی، نەیدەزانی هەمووی میزە. هاتمە دەرەوە کەس لێی نەپرسیم تا هاتمە دەرەوەی کۆنترۆڵ دوو پۆلیس هەستیان پێکردم زانیان نا ئارامم و ئاسایی نیم هاتن وتیان پاسپۆرت؟ دامە دەستی و وتم: ببورن بەهەڵە ئەم جانتایەمان ناردووە پاسپۆرتی منداڵ و خێزانەکەمی تێدایە، یارمەتیان داوم هاتووم بۆ ئەوەی فریای فڕۆکەکەم بکەوم دەچم بۆ هیندستان.
باش بوو باوەڕیان کرد و ڕزگارم بوو هاتمە دەرەوە لە هۆڵی چاوەڕوانی قەرەباڵغیەکی زۆر بوو وەجبەی حەج و عەمرە بوون دەڕۆشتن بۆ عەمرە پڕبوو لە موسوڵمانی تورك، عەرەب، سۆماڵی و پاکستانی...هتد، منیش ویستم بچمە دەرەوە ئیقباڵ و سەلاموالله‌م بینی لەخۆشیدا دووجار هاوارم کرد بەدەنگی بەرز سلامو االله! سەلاموالله! هەرچی حاجی و حاجی ژن بوو لە فڕۆکەخانەدا تەماشای منیان دەکرد و دەستیان بۆ بەرز دەکردمەوە و دەیانوت "علیکم السلام" منیش هیچ خۆم تێکنەدا و پێم ئەوتن خوای گەورە عەمرەتان قبوڵ بکات و ساڵێکی تر بە نیازی حەج سەفەر بکەن، لەخۆشیا باوەشم کرد بە ئیقباڵ و سەلامو الله پرسیم چی دەکەن لێرە؟
ئیقباڵ هیچ هیوامان نەما بۆیە سامان بلیتی بۆ بڕینەوە بۆ دوبەی دوای لەوێوە دەچین بۆ کابول، بۆم دەرکەوت بەهەمان فڕۆکەیە کە بڕیار بوو من بەرن بۆ هیندستان، بەڵام لە دوبەی جیا دەبوونەوە.

بە ئیقبالْم وت دەی کەواتە بلیتەکان فڕێ بەو وەرە باپڕۆینە دەرەوەی فڕۆکەخانە.

## گفتوگۆی ڕافی و  بوون بە هاوڕێ لەگەڵ جولەکە

گەڕامەوە بۆ لای سامان و خۆم شۆرد، زۆرم برسیی بوو کاتژمێر ٩ی شەو بوو لەگەڵ خۆم هەموویانم برد بۆ دۆنەرەکەی حوسێن، لەڕێگا سامان هەردەستی بە مندا دەهێناو دەستی ئەخستە سەر سنگم و ئەیوت کاك ماکوان تۆ مرۆڤی، توخوا پێم بڵێ چی ڕویداوە؟
ماکوان: سامان گیان با تێر دۆنەری سەیدا حوسێن بخۆم ئەوکات هەموویت بۆ باس دەکەم، بەدەم ڕێگاوە هەر موجامەلە و قسەی خۆشم بۆ سەلاموالله دەکرد، زۆرم خۆش دەویست منداڵێکی زۆر خوێن شیرین بوو. کە گەیشتمە

لای دۆنەرەکە  کە سەیدا حوسێن بینیمی پڕ بەدەمی هاواری کرد مەدەد یا الله مەدەد.
هات بۆ لام و باوەشی پێداکردم:  هەر دەمزانی بەسەربەرزی دێیتەوە الله مەدەد، دەستی ماچ دەکردم و هەر دەیوت یا ڕەب تەوبە، یا ڕەب تەوبە، زۆر بەهێزبوو نەمدەتوانی دەستم دەربهێنم. بە هەردوو دەستی دەستی ڕاستمی گرتبوو دەستی ماچ دەکردم نە جارێك و نە دەجار، منیش تووڕەبووم ئەرێ کاکە بەسە وانابێت ئەو خەڵکە تەماشامان دەکەن وا دەزانن هاوڕەگەز بازین. بیکە بەڕایی خودا دەستم ئازادکە، من خودا ڕزگاری کردووم تۆ بۆ وادەکەیت، مردم لەبرسا دۆنەرێکی دەبڵم بۆ دروست بکە و بزانە جەماعەت چی دەخۆن.
حوسێن: دەمزانی دێیتەوە، دەمزانی ئەوانیش ڕسوا دەکەیت.
ماکوان: ڕسوای چی؟ من ڕامکردووە.
 خۆ هیچ نەدەچوو بە مێشکیدا هەر ئەیووت مەدەد الله مەدەد، دوایی بۆم دەرکەوت یەکێکە لە سۆفیەکان و زۆر دینداریشە.
حوسێن: چی دەخۆن بۆتان دروست دەکەم و ئاڵتونەکانیشت هێناوەتەوە؟
ماکوان: خواردنم بۆ دروستبکە و ئاڵتونەکانیش سەلامەتن، بێخەم بە لای خاوەنەکەیەتی.
حوسێن: تەلەفۆن دەکەم بۆ ڕافی با بێت بۆ لامان، تەلەفۆنی هەڵگرت و بە ئەڵمانی دای بەیەکداو لەگەڵ ڕافی قسەی کرد.
گوێم لێبوو باسی شێخ و موسوڵمان و ئیسلامی دەکرد، بۆیە بە سامانم وت حوسێن چی دەڵێت بە ڕافی؟
سامان: دەڵێت ڕافی پێم نەوتی ماکوان شێخە و لەدەست ئەواندا نییە بتوانن شتێکی لێبکەن، خۆم شتم لێدیووە ئەوە گەڕاوتەوە و سپاردەکەشی پێیە و وەرە بۆ لامان.
 لە کاتی نان خواردندا بووین ڕافی خۆی کرد بەژوورا و هات بۆلامان، باوەشی کرد بەمندا، بەئینگلیزی وتی: پێدەچێت حسابت لەسەر بکەم.
ماکوان: سوپاس ڕافی هیوام وایە پیاوی باشی وەکو تۆش لەگەڵ خەڵکی باشدا بێت دوای مردنی، وتم حوسێن بۆی بکە بە ئەڵمانی، حوسێن بۆی وەرگێڕا.
ڕافی: تێناگەم مەبەستت چییە، بۆ دوای مردن؟
ماکوان: ئەی لەم ژیانەدا چەندە باش بیت، بەڵام تەرەفی خوا نەبێت هیچ ئەرزشی نییە.
ڕافی: ئێ منیش پڕوام بەخودا هەیە، زۆر پڕوام پێیەتی هەمیشە لەدڵمدایە.
ماکوان: وانیە تۆ پڕوات وایە خواکەت بەس نەوەکانی بەنی ئیسرائیلی خۆش دەوێت، ئەو خودایەی ئێوە تەنها چەند کەسێکی خۆش دەوێت.
ڕافی: ئەی خواکەی تۆش هەروایە، دەبێت تەنها موسوڵمان بیت و ئیسلام هەڵبژێریت، ئەوانی تر بۆ ئاگرە وایە؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە وایە، بەڵام پێوەرەکەت هەڵەیە کە پێوەری خوای خۆت بە خوای ئیسلام بکەیت، ئەزانی بۆ؟
ڕافی: بۆ هەڵە چییە لە پێوەرەکەمدا؟
ماکوان: هەڵەکە لەوەدایە کە خواکەی ئێوە خوای تەنها خانەوادە و خێزانێکە، بەڵام خواکەی ئێمە خوای هەموو بونەوەرەکانە، هەموو دەتوانن ببنە خاوەنی خواکەی ئێمە کە پەروەردگاری ئیسلامە، بەڵام تۆ ڕازیت کورد یان عەرەب یان هەر گەلێکی تر ببێتە جولەکە؟
ڕافی: وایە دەبێت لە نەوەی ئیسرائیل بیت واتا یەهود بیت.
ماکوان: کەواتە خواکەی تۆ زۆر بچوکە، بەڵام خوای ئێمە خوای هەموو خەڵکیە، ئیسلام خانەوادە نییە، ئیسلام مەنهەجە، ئاینە، دینە. ئەوەی هەڵیدەگرێت خاوەنیەتی تاپۆکەی لەسەر عەرەب نییە یان لەسەر گەلێکی تایبەت بێت، جیاوازی ئێمە و ئێوە زۆر گەورەیە ڕافی.
ڕافی: ڕاستە تا ئێستا بیرم لەوە نەکردۆتەوە.
حوسێن دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ ڕافی و کەمێکی پێچوو سەیدا حوسێن دەستی دەکێشا بە مێزەکەدا خەریك بوو لێی بدات.
منیش هاوارم کرد بەسەریاندا بوەستن ئەوە بۆ وا تورەن؟
سەیدا حوسێن: کاکە تەنها وتوومە خواکەی ئێوە بچوکە و منداڵە هێشتا گەورە نەبووە، میز دەکات بەخۆیدا، ئەویش دەڵێت: منیش بە خوداکەی ئێوە بڵێمەوە، منیش وتم وابڵێیت وەکو دۆنەر ئەودەم لە شییش.
ماکوان: جا چۆن دەبێت وابڵێیت، ئەی کە وەك دۆنەر ئەیدەیت لە شیش، ئەویش ئەتوانێت تۆ بداتە بەر چەقۆ وەکو مەڕ سەرت ببڕێت، ئەمە لەکوێی ئیسلامدا هاتووە قسە بەخواکەیان بڵێیت، ئەگەر ئیسلامت خۆشدەوێت و ڕاستگۆیت دەبێت داوای لێبوردنی لێبکەیت، سەیدا حوسێن لای خۆی تۆ سۆفیت.
سۆفی دەبێت:
س: سینە ساف بێت
و: لە وید و مەحبەت و خۆشەویستیدا بێت.
ف: فانی بێت لەلات ئەم ژیانە بە پارە و سەروەت و سامانیەوە، فانی بەواتای فەنا بوون نا، بەڵکو بە واتای پشت تێکردن.
ی: لە یادی خوای پەروەردگاردا بێت.
چۆن قسە بەخواکەیان دەڵێیت منیش لەگەڵ ڕافی دەڕۆم دەستی ڕافیم گرتوو هاتینە دەرەوە، سەیدا حوسێن لەگەڵماندا هات و وتی باشە سەری منی ماچ کرد و تەوقەی کرد لەگەڵ ڕافی دا و وتی بڕۆن دانیشن شیرینی دەهێنم دەیخۆین.
کۆتاییم بە مەجلیسەکە هێنا: ئاگاتان لە ئیقباڵ بێت و من دەڕۆمەوە بۆ نەرویج، ئەوە فرۆشیار و کڕیار هەردووکتان لێرەن و من دەگەڕێمەوە نە پارەم دەوێت و نەهیچ، ماڵ و سەروەت و سامانی خۆتان بۆ خۆتان.

سەیدا حوسێن: ناهێڵم پرۆیت باسی تۆم کردووە لە تەکیەی شێخ موستەفای نەهری دەچین بۆ لای ئەوان، خەتمێکمان بۆ دامەزرێنە.
ماکوان: براکەم من ئەو شتانە ناکەم و ناشیزانم، خێزانم بەتەنهایە و دوکانێکم بەسەردا جێهیشتووە دەبێت بگەڕێمەوە بە زووترین کات، هەفتەیەك زیاترە لە کاتی خۆم بەسەر چووە، ناشمەوێت خێزانم بە تەنها جێبهێڵم ئەرکی زۆرە منداڵ و دوکان ..هتد، لەبەر ئەوە من بە خواتان دەسپێرم و خواتان لەگەڵ، ئیحترامی ڕافی بگرە.
 ماڵ ئاوایم کرد لە حوسێن و ڕافی و چووینەوە بۆ ماڵی سامان و زۆر سوپاسی سامانم کرد، ووتم ئەگەر برایەتی منت قبوڵە، ئاگاداری ئیقباڵ بە من بەخواتان دەسپێرم لە دوای نوێژی بەیانی دەردەچم. بە ئیقباڵم وت هاوکاری  ئەو خەڵکە بکە کە هاوکاریت دەکەن، جارێکیتر ڕەفیقایەتی من نەکەن منداڵی خۆتان  بۆ کار و کەسابەت و پارە پەیداکردن بە کاربهێنن، بە الله بەخش بڵێ ماڵی دونیا ژیانی منداڵێك ناهێنێت.
بۆ بەیانی دوای نوێژ دەرچووم خوا حافیزم کرد و لەڕێگا ئۆتۆمبێلەکەم لە بەنزینخانەیەك پڕکرد و قاوەیەکم کڕی لەو کاتەدا ویرسان لەپشتمەوە ئامادەبوو.
ویرسان: خۆت تێك مەدە هەر دەمەوێت قسەت بۆبکەم.
ماکوان: لانەچیت ئەو قاوە دەکەم بەسەروچاوتا.
ویرسان: هیچ نەکەیت دوایی هەر دەبێت بڵێیت سۆری، ئایەم سۆری، پرۆ پارەکە بدە و لەگەڵت سەردەکەوم قسەت بۆ دەکەم، باشە؟
ماکوان: نەوەڵا بۆت نییە سەرکەویت چووم بۆ لای کاشێرەکە و پارە بدەم قاوەکەم دانا، زۆر تورەبووم ئافرەتەکە وتی وەسڵەکەت دەوێت؟
لەژیانمدا وەصڵم وەرنەگرتووە، لەو کاتەدا لەخۆمەوە وتم بەڵی دەمەوێ پێی دام بەبێ تەماشا کردن، خستمە گیرفانم و سواری ئۆتۆمبێلەکەم بووم ئاوڕمداوە بینیم ویرسان دانیشتووە.
ویرسان: بەس تورە مەبە قسە دەکەین بەدڵت بوو وەریگرە، بەدڵت نەبوو ئەڕۆم باشە؟
ماکوان: دەی شەکرەکەت بشکێنە.
ویرسان: ڕۆژێك لە ڕۆژان پرسیوتە ئەو گروپەی کە بانگت دەکەم تا لەگەڵمان بیت چییە؟
ماکوان: نەخێر، چونکە پێویستم نەبووە و بەنیازیش نیم بچمە ناوی ئیتر بۆ بپرسم؟ ئەوەی لای ئێوەی شەیتانەوە بێت کوفرە و بەتاڵە و هیچ ناهێنێت.
ویرسان: ئەی ئەگەر پێم ووتی ئەوەی تۆ دەستت دەکەوێت لەو گروپەدا زۆر لەوە گرنگترە کە دەستت دەکەوێت لەلایەن ئیقباڵ و دوکان و هەموو ئەو سەروەتانەی کە بوونی هەیە لەم ژینەدا.
ماکوان: کافر بوونی تێدایە تەڕەفی خودا نەبیت، هەموو ژیانم بدەیتێ و تەمەن بێ پایانی واتا طولی عومر ئینجا نایگۆڕمەوە بەم سەروەت و سامانە.

ویرسان: کێ دەڵێت واز لە دینەکەت بهێنە؟
ماکوان: وەی کە شەریفی!
ویرسان: ئەو گروپەی ئێمە موسوڵمان و مەسیحی و جولەکە و بێدینیشی تێدا جێگا دەبێتەوە.
ماکوان: تەبعەن هەروایە، بەس من لەگەڵ ئەوانە جێگام نابێتەوە زۆر ببورە، پروام نییە ئەگەر کەسێك موسوڵمان بێت لەگەڵ ئێوە ڕێگا بکات.
ویرسان: هەر نەتپرسی گروپەکەمان چییە و ناوی چییە؟
ماکوان: ئەگەر ئاوس بیت بە مانگایەکیش لێت ناپرسم.
ویرسان: ئەی پێت چۆنە ئێستا پۆلیس بتوەستێنێت و بتگرێت.
ماکوان: کاتێ خۆی ئێمە منداڵ بووین ئەگەر کەسێك قسەیەکی کەرانەی بکردایە یان نەشیاو بووایە دەمانوت فولکەی دەستاڕەکە دەزانی؟ ئەویش دەیوت ئا یاخود نا. ئەگەر بیوتایە دەزانم دەمانووت پڕۆ لەوێ بیخولێنەرەوە، خۆ ئەگەر بیوتایە نایزانم دەمانوت پڕۆ بەشوێنیدا بەگەڕێ، تۆش پێم بڵێ فولکەی دەستاڕەکە دەزانی؟
ویرسان : تەماشای دواتەوە بکە پۆلیس بە شوێنتەوەیە.
بەخوا ڕاستی کرد ئەو درۆزنە پۆلیس بە شوێنمەوە بوو منیش بەئاسایی ڕۆشتم و تۆزیکی پێچوو پێشم کەوت و لە شاشەی پشتی سەیارەکە نوسرابوو، شوێنمکەوە بە زمانی ئینگلیزی، منیش شوێنیان کەوتم تا یەك چارەك ڕێمان کرد و پاشان بردمیانە ناو بنکەیەکی پۆلیس و لە پارکێنیکەیدا وەستام دوو پۆلیس هاتن و منیش لە ناو سەیارەکەدا مامەوە یەکێکیان وتی: پێش کاتژمێرێك لە بەنزینخانەیەك بەنزینت تێکرد؟
ماکوان: بەڵێ تێمکرد وەسڵەکەشم پێیە.
پۆلیس: بێزەحمەت با تەماشایەکی بکەین.
ماکوان: بفەرموو بە خۆشحاڵیەوە وەسڵەکەم دایە دەستی و تەماشای کرد.
پۆلیس: چیت کڕی لەوێ؟
ماکوان : سەیارەکەم پرکرد لە بەنزین و قاوەیەکیشم کڕی.
پۆلیس: چۆن پارەت داوە؟
ماکوان: نوسراوە بە ماستەرکارد.
پۆلیس: ئەوە نوسراوە تەنها پارەی قاوەکەت داوە.
ماکوان: ئەوە بەڕاستە؟
پۆلیس: بەڵێ وانوسراوە.
ماکوان: ڕاستە من چومەتە بەردەمی کاشێرەکە، بەڵام ئەوکەسەی لەسەر کاشێرەکەیە دەبێت بزانێت کە من لە کام سەیارە دابەزیوم و کامێرەی لەبەرچاودایە، قاوەکەم لەبەردەمدا داناوە هیچی نەپرسی لێم وامزانیووە دەزانێت، ئەگەر من مەبستم ئەوە بووایە پارە نەدەم ڕاستەوخۆ دەڕۆشتم، گریمان من بیرم چووە بۆ ئەو نەیپرسیوە؟
پۆلیس: ئەی تۆ تەماشای وەسڵەکەت نەکرد؟

ماکوان: من زۆر بەدەگمەن تەماشای وەسڵ دەکەم ئەمەش نازانم چۆن خستمە گیرفانم، چونکە زۆر سەرقاڵ بووم بەخۆمەوە بایی ٢٠٠٠٠ ئێورۆ لەم وڵاتەی تۆدا کەرەستەم کڕیووە ناردومەتەوە بۆ وڵاتی نەرویج، تۆ بڵێی سومعەی خۆم بشکێنم بۆ ٦٠ ئێورۆ؟

پۆلیس: ڕاستە پێدەچیت کارەکە هەڵە بێت، بەڵام ناچارین دۆسیەیێکت بۆ بکەینەوە.

ماکوان: فەرموو، جا ئەوەی بۆ چییە ئەوان با ژمارە بانکیەکەیان بنێرن لە ماوەیەکی کەمدا لێرەوە دەیخەمە سەر حسابکەیان یان دوو ئەوەندە ئەدەم بە تۆ لەوێوە بیدە دەستیان.

پۆلیس: ئەوە ئیشی ئێمە نییە.

ماکوان: باشە خۆم دەیگەڕێنمەوە.

پۆلیس: سکاڵات لەسەر تۆمارکراوە، دەبێت دۆسیەیێکت بۆ بکەینەوە، چووم لە پرسگەکەیان وەستام تا دۆسیەکە بکەنەوە و سزای ماڵی بدرێم، بەڵام دیاربوو پۆلیسێك بە تورەییەوە هات و داوای لێبوردنی لە من کرد و وتی بورە هەڵەکە لای تۆوە نەبووە، بەڵکو تەماشای کامێرا کراوە لەو کاتەدا مۆزەفی بەنزینخانەکە گۆڕاوە و تۆش لەوکاتەیا بە تەلەفۆن قسەت کردووە.

ئازاد کرام بەرەو کیل ڕۆشتم و سواری کەشتی بووم بۆ دانیمارك و لەوێشەوە بۆ سوید و لەوێشەوە نەوەستام تا نەرویج و شارەکەی خۆمی تێدا نیشتەجێم. کاتژمێر ٣ی شەو گەیشتمە ماڵەوە و لێی خەوتم.

بۆ بەیانی هەڵسام دوو ڕۆژ بوو ئەڵمانیام جێهیشتبوو، تەلەفۆنێکی زۆرم بۆ هاتبوو لای سامانەوە واهەستم کرد تەنها بۆ هەواڵ پرسین بووە.

تەلەفونم کردەوە بۆ سامان ئەویش بەپەلە وەڵامی دامەوە وتی وەڵڵا هەموو ئاڵتونەکانیان لە ئیقباڵ دزیووە.

ماکوان: سەلامی کوڕی سەلامەتە؟

سامان: بەڵێ؛ منداڵەکەی سەلامەتە، بەڵام ڕافی هەمووی دزیووە، پێدەچیت دەستی حوسێنیشی تێدابێت.

ماکوان: ئەوە کێشەی من نییە و خۆتان ئازادن چی دەکەن.

ئیقباڵ: ماکوان چی بکەین باشە؟

ماکوان: تەشتێ قوڕ بهێنە بیکە بەسەری خۆتو باوکت دا، چوزانم عەمرت نەمێنێت ئەوە کێشەی من نییە خۆتان چارەسەری بکەن.

سامان: کاك ماکوان من لەبەر خاتری تۆ لێرە هێشتوومەتەوە، چی لێبکەم؟

ماکوان: عەمری تۆش نەمێنێت دەریکە با پرواتەوە ملی بشکێنێت.

سامان: بۆ وا تورەی.

ماکوان: ئەی سەرچۆپی بگرم بەهەواڵە خۆشەکانتان شێخانی بۆتان هەڵپەڕم؟

سامان: پرست پێدەکەین وەکو برا گەورە.

ماکوان: ئەوەی دەیڵێت جێگای پرسە، لەبەر من خەڵك لەماڵەکەتدایە و لەکاتی ناڕەحەتیدا دەری بکەیت؟

من دایدەخەمەوە ئەوە کێشەی خۆتانە چۆن چارەی دەکەن بیکەن؟

تەلەفۆنم داخستەوە زۆر بێتاقەت بووم و خەفەتم خوارد، لەخۆمەوە ووتم با تەلەفۆنێك بکەم بۆ حوسێن، تەلەفۆنم بۆ کرد و قسەمان کرد دیاربوو ئاگای لە دزیەکە نەبوو، چونکە سوێندی بۆ خواردم کە ڕافی دز نییە بەس وەکو تۆڵە لە ئێمە ئەو کارەی کردووە، خەڵکم بە شوێنیدا ناردووە بیهێنن.

ماکوان: با ئیقباڵ لەماڵی سامان دا نەبێت، ئەو هەتیووە زۆر چروك دیارە.

حوسێن: بەخوا ئەیکوژم قسەی وا بکات، خۆ ئاگادارم ئیقباڵ شت دەکڕێت بۆ ئەویش.

ماکوان: هاوکاریان بکە تۆ سۆفیت.

خوا حافیزیم کرد و سەرقاڵ بووم بە کاری خۆمەوە ڕۆژێك لەدوکان ئافرەتێکی کورد خۆی کرد بە دوکانەکەمدا و بە پێکەنینەوە وتی تۆ ماکوانیت؟

ماکوان: ئەگەر خوای گەورە لێمان قوبوڵ بکات ئەوم، ئەمرکە؟

ئافرەتەکە: من جلی ژێرەوەم دەوێت هەتانە؟

ماکوان: خوشکی من لێرە ئەمانە نافرۆشین.

ئافرەتەکە: ئەی ئەو بلوسانە بۆ من دەبێت؟

ماکوان: نازانم خۆت تاقی بکەرەوە، ئەوە ژووری خۆگۆڕینە.

خۆی کرد بە ژووری خۆ گۆڕینەکەدا بانگی منی دەکرد ماکوان، ماکوان وەرە بزانە لێم جوانە؟

ماکوان: ئاوێنەی تێدایە خۆت سەیربکە، وەرە دەرەوە با تەماشای بکەم.

ئافرەتەکە هاتە دەرەوە و تەماشام کرد وتی جوانم؟

ماکوان: نەوەڵڵا زۆر ناشرینە ڕێك لە داهۆڵ دەچیت.

ئافرەتەکە: وەرە بە زەوقی خۆت دانەیەکم بۆ هەڵبژێرە.

ماکوان: من زەوقم بەکەڵك نایەت یەك خولەك بوەستە، تەلەفۆنم کرد بۆ خێزانم کاتی ئیسراحەتی بوو داوام لێکرد بگەڕێتەوە دوکان لەو بازاڕەکە لەگەڵ هاوڕێیەکیدا قسەی دەکرد ووتم با لەو فیتنەیە نەجاتم بێت، باش بوو خێزانم هات و بەڕێی کرد.

# کچێك لاشەی خۆی هەڕاج دەکات

لە دوکانەکەی خۆم توشی ئافرەتێك هاتم کورد بوو، زۆر بێ شەرمانە ڕەفتاری دەکرد، وا هەستم کرد کە ویرسانی نالەبار ناردیێتی بۆیە لەدڵی خۆمدا ترسام، کامێرای دوکانەکەم نەکەوتبووە کار چاوەڕوانی بەستنی بووم بۆیە زوو خۆم دەرباز کرد لەدەستی و خێرا خێزانم بانگکرد. ئەوەی کە لێی دەترسم لە ژیانمدا سێ کاڵای زۆر گرانبەها و ماندووکەرن ئەوانیش ئافرەت و پارە و پلەو پایەیە.
مرۆڤ لە تەمەنی ١٥ ساڵی تا ٢٥ ساڵی هەرچی بکات زۆر لەسەری ناکەوێت، دوای ئەوەی کە پێی خستە سەرو ٢٥ بۆ ٣٥ ساڵی پێویستە خۆی بناسێنێت لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ڕەهەندەکانی تری ژیان و کار و کەسابەتەوە خۆی دروست بکات، لە ٣٥ بۆ ٥٥ ساڵی بەرهەمەکەی دەخوات. خۆ ئەگەر کەسێك لە سەرو ٣٥ ساڵییەوە کەسایەتی پڕوخێت یان بشکێت یاخود پڕوشێت زۆر ئاستەمە هەڵسانەوەی، ئەو متمانەیەی لە ناو خەڵکدا دروستی کردووە بەدەستی بهێنێتەوە.
بۆیە دەترسام لە قسەی خەڵکی لە تێکچونی خانەوادەم، هەموو ئەوانە کاریگەرن لەسەر کەسایەتی مرۆڤ، بەردەوام بووم لەژیانی ئاسایی خۆم.
ڕۆژێکی تر هاتەوە ئەمجارەیان کامێرەی دوکان کاری دەکرد هیچ کێشەم نەبوو، دەنگو وێنەی بە جوانی تۆمار دەکرد لە دووری ١٠٠ مەترەوە دەنگی بە تەواوی و بەباشی تۆمار دەکرد.
کە هاتە ژوورەوە من وەك پیشەی هەمیشەیی خۆم دەچووم بەدەم کڕیارەکانمەوە کە ئەو هات دانیشتم و رووم لێ وەرگێڕا و خەریکی سەیری جلو بەرگ و فاشنی نوێ بووم لە سایتی ئێرۆمۆدا.
نزیك بوویەوە تەماشای بلوسێکی دەکرد، پرسی بایی چەندە؟
ماکوان: نرخەکەی لەسەرە نازانم بایی چەندە، خۆم سەرقاڵ کردەوە بە تەماشای مۆدێلات.
ئافرەتەکە: ماکوان بۆچی وا قسەم لەگەڵ دەکەی؟
ماکوان: کچی خۆم سێ تەمەنی تۆم هەیە بۆ ناڵێیت کاك ماکوان، خۆ لە تۆ نەبووم ڕێز و ئەدەب باشە بۆ مرۆڤ.

ئافرەتەکە: هەر نەت پرسی من ناوم چییە، یان ناوی تۆ چۆن دەزانم؟
ماکوان: هیچ ئیشم پێت نییە هەر کەسێکی خوشکی بەڕێزی منیت، زانینی ناوی منیش ئاساییە، چونکە من خەڵك زۆر دەناسم خەڵکێکی زۆریش دەمناسێت.
ئافرەتەکە: من زۆر موعجیبم بەدەنگت.
ماکوان: من تا ئێستا گۆرانیم نەوتووە بزانە بە ماکوان هەورامی گۆرانیبێژ لێت تێکچووە، ئەو ماکوان کەریمی گۆرانیبێژە و منیش ماکوان کەریمی ڕۆژنامەنوس.
ئافرەتەکە: منیش ڕۆژنامەنوسم وە مەبەستم دەنگخۆشی بۆ گۆرانی نا، بەڵکو بۆ قسە کردن هاتە پێشەوە بۆ تەوقەکردن، ناوم لاڤین-ە.
ماکوان: خۆشحاڵم لاڤین خان، من بۆ خانمان ڕێزتان دەگرم تەوقەتان لەگەڵ ناکەم حەزدەکەم ڕێزی زیاترتان بگرم دەستم دەگرم بە سنگمەوە بۆتان.
لاڤین: ناوەکەم خۆشە؟
ماکوان: ئەگەر ناوی خۆت بێت خراپ نییە.
لاڤین: ناوی خۆمە تەماشای ئایدی کارتەکەم (ناسنامە) دەکەیت؟
ماکوان: مەبەستم ئەوە نییە، زۆر کەس هەیە ناوی شەمسەیە یاخود گوڵچینە، بەڵام ناوەکانی خۆیان دەگۆڕن و خۆیان ناسك دەکەنەوە و دەیکەن بە لاڤە و بە تاڤە و بە نوونو...هتد.
لاڤین: ئەمە دوکانی خۆتە؟
ماکوان: نەخێر؛ هاوسەرەکەم خاوەنیەتی من کرێکارم ئیشی بۆ دەکەم.
لاڤین: واتا خێزانت ئەوەندە دەوڵەمەندە؟
ماکوان: چیت دیووە ئەمە هەر هیچ نییە ١٠٠ ئەوەندەی تری هەیە.
لاڤین: بەچی وا دەوڵەمەند بووە؟
ماکوان: بە من
لاڤین: چۆن؟
ماکوان: منی هەم بۆیە دەوڵەمەند بووە، هەرگیز خیانەتم لێنەکردووە، هەرچیم پێ بڵێت بەقسەی دەکەم خواردنی بۆ دروست دەکەم و قاپی بۆ دەشۆم... هتد.
لاڤین: وەڵا تۆ کەسێکی باشی.
ماکوان: ئەی پیاوەکەی تۆ ئەوەت بۆ ناکات؟
لاڤین: پیاوم نییە
ماکوان: گاڵتە! لە ژن دەچیت؟
لاڤین: بەڵێ، جیابوومەتەوە.
ماکوان: بەدەمو چاوتدا بێت، پێ دەچێت منداڵیشت هەبێت؟
لاڤین: بەڵێ دوو کچم هەیە، لە پیاوی یەکەمم و کوڕێکیشم هەیە لە پیاوی دووەمم.
ماکوان: ئەی لەشەت ساغ بێت، ئەی بەنیازی سێیەم نیت؟

لاڤین: ئەگەر پیاوێکی باش هەبیت بۆ نا، بەڵام هاوتەمەنی خۆم بێت.
ماکوان: تەمەنت چەندە؟
لاڤین: ٣٢ ساڵ
ماکوان : وەڵڵا کچی خۆم تۆ لەم خەتە ئاوا کار بکەیت دەچی بۆ چوار و پێنج.
لاڤین: "بەتوڕەییەوە" بۆ وا قسەم لەگەڵ دەکەیت؟
ماکوان: ئەی چۆن قسەت لەگەڵ بکەم خۆ بەزۆر بانگم نەکردوویت، تۆ هاتوویت بۆ دوکانەکەم و باسی ئاژداو ئابایی خۆتم بۆ دەکەیت. دەی بۆ دەرەوە ئەگەر بەدڵت نییە، من هاتووم بۆ لات یان تۆ لە دوکانی مندایت؟
لەڕاستیدا منیش ئەو توڕەبوونەیم دەویست دەمزانی خۆی دەنوێنێت بۆ ئەوەی ئەوەندەی تر بیشکێنم.
بێدەنگ بوو خۆی سەرقاڵ کرد بە تەماشاکردنی جلو بەرگەوە، هەمووی هەڵشێواند بەسەر یەکدا منیش هەر نەچووم بەدەمیەوە، کڕیاری ترم دەهات زۆر بەجوانی بەدەمی ئەوان دەچووم ئەوم ئیهمال کرد.
بەرانبەریشم دوکانی قاوەخانەیەك بوو چووە ئەوێ و دانیشت و منیش سەرقاڵی کاری خۆم بووم، ماوەیەکی پێچوو دیسان هاتەوە بۆ لام.
هەر هاتە ژوورەوە منیش وتم دەزانم ناوت لاڤینە، ڕۆژنامەنوسی ٢ شوت کردووە و ٣ منداڵت هەیە، ئەتەوێت شوو بکەیت منیش بەداخەوە نە بەئاشکرا و نە بە نهێنی لەو خەتە ئیش ناکەم.
لاڤین: ئەم شەو لەماڵی ئێمە جەژنی لەدایك بوون هەیە بۆ نایەیت، قسەکانت زۆر خۆشە.
ماکوان: تۆ وتت من ناوم ماکوانە، پێم بڵێ چۆن منت ناسی و دەنگی من خۆش بووە، چۆن گوێت لەدەنگی من بووە، ئەوەم پێ بڵێ دێم بۆ ماڵتان؟
لاڤین: تۆ مەلا ماکوانیت، ئەوەی کە باسی ئیسلام و شتی وا دەکەیت؟
ماکوان: بەڵێ من ئەوم، خێزانیشم بێنم بۆ ماڵتان یان هەر خۆم بێم؟
لاڤین: نا هەر خۆت وەرە.
ماکوان: چ مەلایەکت بینیووە کاری وا بکات و بەتەنها بچێت بۆ ئاهەنگ، بۆ لای ئافرەتێکی تەڵاق دراو بەو جوانیەی کە خاوەنێتی، کە هاتم بۆ ماڵتان چی بکەین تەنها بڵێم جەژنی لەدایك بوونتان پیرۆز بێت، تەبعەن کەسیشی لێ نییە هەر خۆم و خۆت دەبین، وایە؟ خۆش دیارە لاڤین، وایە؟
لاڤین: قەیچییێکە، وەکو دوو هاوڕێ خواردنێك دەخۆین بەیەکەوە.
ماکوان: هاوڕێی بەڕێز و بە ڕێزداربین، یان وەکو عەرەب دەڵێت: بین احباب تسقط الاداب؟
لاڤین: عەرەبی نازانم، بەدڵنیاییەوە من ڕێزت دەگرم.
ماکوان: لاڤین بۆ وا خۆت هەڕاج دەکەی بۆ من، کوا شکۆی ئافرەتایەتی و ژنایەتیت، بۆ ئامادەی خۆت بخەیتە بەردەست هەموو کەس؟
لاڤین: من خۆم ناخەمە بەردەم کەس مەگەر خۆشم بووێت.

ماكوان: قسەیەكی خۆشە، چاوبەستێكی زۆر باشە بۆ ئەوەی چەواشەكاری پێبكەیت. پێم بڵێ پەیامەكەت چییە و كێ ناردوویتی؟
لاڤین: كەس نەیناردووم، تۆ دڵ مردووی دڵ ڕەقی هیچ تێناگەیت.
ماكوان: وانیە، باش تێدەگەم وە دەشزانم چیت دەوێت وە ڕاست ناكەیت، بە چاوتا دیارە كە ڕقت لە منە ئەوەشی ناردوویتی پیاوی ئەوە نییە من هەڵخەڵەتێنێت پێش ئەوەی تۆ بنێرێت ئەو ئەحمەقە باسی تۆی كردبوو.
كە وام وت تێك چوو...
لاڤین: ئەوان پێیان وتوویت؟
ماكوان: ئەرێ وەڵڵا ئەوان وتیان هەر بەخۆمی وت كە بە پارە بە ئافرەت بە هەموو شتێك هەوڵ ئەدەین بۆ هەڵخەڵەتاندنی من، خوشكە بەڕێزەكەی من تۆشیان بردۆتە ناو گروپەكەیان حەتمەن هەڵیان خەڵەتاندوویت؟
لاڤین: بەڵی؛ لە گروپەكەدا پلانەكانیان پێ ووتم.
ماكوان: دە باشە كەسی من بۆ خۆت هەراج دەكەیت، لە پێناوی چی باوكی من، من خاوەنی خێزانم باشە تۆ هەر دەبێت ئەقڵت بەوە بشكێت من ئەگەر لەگەڵ ئافرەت ڕابوێرم، لەگەڵ كورد دەست تێكەڵ دەكەم ئەو هەموو ئافرەتە ناسكە جوانە ئەوروپیە هەیە؟
لاڤین: وەڵڵاهی مادام ئەوەندە بێ ئەخلاقن خۆیان دەمنێرن و خۆشیان ئاشكرام دەكەن، دەبێت دار بدەم بەڕۆحیاندا و هەموو شتەكانیان بڵاو بكەمەوە.
ماكوان: بۆچی وەستاوی هەمووی بڵاوبكەرەوە بێنە خۆم بۆت بڵاو دەكەمەوە.
لاڤین: وەرە تەماشا بكە ئەوە هەموو چاتەكانە لەگەڵمدا.
ماكوان: چاتی چی؟ لەدڵی خۆمدا وتم تۆ بڵێیت جنۆكەكانیش فەیسبووكیان هەبێت و چات بكەن؟ من تا ئەو ساتەوەختەش وامزانی لەلایەن ویرسانەوەیە، كە تەماشای چاتەكانم كرد سەیر دەكەم مولحیدەكان كۆبوونەتەوە ئەم هەموو شەیتانە ئینسانە لە چات گروپەكاندا ئەم ئافرەتە فەقیرەیان هەڵخەڵەتاندووە بۆ ئەوەی لەگەڵ مندا كاری خراپە بكات و دوای ئەوە بڵێت ماكوان دەستدرێژی سێكسی كردۆتە سەرم و زۆر شتی تر بە قارەمان و خاوەن فیكر ناویان بردووە.
لاڤین: ئەوە ئەو سەگانە، هەموو چاتەكان لەبەردەستت دایە چی لێدەكەیت بیكە.
ماكوان: لەگەڵیاندا پرۆ هیچ مەڵی جارێ، بەس پێم بڵێ چی پاڵی پێوەنایت لاشەی خۆت ئاوا بە ئاسانی هەڕاج بكەیت؟ باشە گریمان منت هەڵخەڵەتاند و لەگەڵتا ئەوەی ویستم كردم ئەی باشە تۆ دەزانی ئەوە مانای چییە؟
لاڤین: ئەوان وایان لە من گەیاند لە پێناوی ئازادی و خۆش نودی مرۆڤەكانە، تۆ تیرۆرستی پێویستە بمریت و بگیرێیت و نازانم زۆر شتی تر، زۆر بێتاقەتم.

ماکوان: ڕەوشەکەم بەدڵ بوو بۆم هاتبووە بەردەست و زانیاری نوێم دەستکەوت، لەسەر ئەو وەتەرە ئیشم دەکرد، باشە لاڤین گیان کچی خۆم ئەزانی ئەوان دوایی وەکو سۆزانی تەماشای تۆ دەکەن، تۆ دەزانی ئەوان دەوری ئافرەتی سۆزانی بە تۆ دەبینن؟ ئەزانی تۆ شەرەفی خۆت بە ئاسانی ڕادەستی من کرد. گریمان من تیرۆریستم، بەڵام ئێوە زۆر تیرۆریستترن، تۆ هاتوویت کەسایەتیم دەکوژیت، خانەوادەیەك جیادەکەیتەوە، منداڵەکانمان لە نازی دایك و باوکیان دەکەیت. کەرامەتیشم دەشکێنیت و بەدرۆش من دەخەیتە زیندان، پروابکە شەیتان کاری واناکات جا من شەیتان زۆر دەناسم بەس پروابکە شەیتانەکان زۆر بەڕێزترن.

لاڤین: سوپاس، تاقەتی هیچم نەما دەڕۆم.

ماکوان: نا مەڕۆ یەك کاتژمێری تر دوکان دادەخەم بەیەکەوە دەڕۆین، نانیش دەخۆین و زیاتر لەخزمەتاندا دەبم. من ئاڵتونم دەست کەوتووە چۆن وازی لێدەهێنم، هەر قسەم بۆ دەکرد ئینجا پێم وت چەنیان پارە دایتێ بۆ ئەم کارە؟

لاڤین: پارەیان نەداومەتێ کەسێك بەڵێنی داومەتێ ئەگەر ئەوکارە بە تۆ بکەم ئەو من دەهێنێت.

ماکوان: قاقای پێکەنینم لێداو وتم کچم ئێمەی پیاو گەوادەکەشمان کە پیاوبێت کاری واناکات، تۆ شەرەفی خۆت ئەدۆڕێنی ئەبیتە سۆزانی. چی پیاوێك توانای هەیە سۆزانییێك بهێنێت؟ ئێستا تۆ واز لە سۆزانی خۆت بهێنە تەماشای ئەوە بکە گەوادە ئافرەتی بۆ من ناردوە، ئاخر کچی خۆم هاوسەرگیری و خانەوادە پێویستی بە ڕەوشتە و وەفای دەوێت، ڕاستگۆیی دەوێت، شەڕەفمەندیێتی و لە خۆبوردەیی دەوێت، تۆ پێت وایە بەو حاڵەی کە هەتانە تۆ سۆزانی بیت و ئەویش گەواد ژیانتان خۆش دەبێت؟

لاڤین: کاك ماکوان دەزانم تورەیت بەس کەم بمشکێنە، بەس نییە ئێمە وەکو ڕێکخراوی دەنگی ئازاد کردوومانە، من بە حساب لە دەزگایەکی موخابەرتیدا بووم.

ماکوان: حەز دەکەم باش بزانیت هەر دامو دەزگایەك بیر لە شتی وا بکاتەوە گەوادە، دەیوثە، پێغەمبەری خوا  دەفەرموێت: لە ئاگردایە.

هەر کەس کارەکە بکات و هاوکاریان بکات، پاشان ئافرەتەکانیش هەموو بە سۆزانی هەژمار دەکرێن کچی خۆم وانابێت، بیر لە ژیانی خۆت بکەرەوە. ئاخر ئەم جیهانە ئەوە ناهێنێت کە تۆ خۆت ڕادەست بە کەسێ بکەیت ڕقیشت لێبێت. ئەوەتا تۆیان هەڵخەڵەتاند و لە ژێریشەوە من خەڵکی خۆمم هەبوو لەناوتاندا ئاگاداریان کردمەوە.

لاڤین: کاك ماکوان تکات لێدەکەم باپرۆم زۆر بێزارم، پەیمانت ئەدەمێ کاتێکی تر دابنیشین.

ماکوان: تکا دەکەم وامەڵێ من هەر سەرەتا دەمزانی، بەڵام نەمدەویست ڕاستەوخۆ پێت بڵێم ئێستا خۆت درکت بە هەڵەکە کردووە دەبێت خۆشحاڵ بیت، کە من ڕاستگۆییەکەت وای لێکردم ڕێزت بگرم خۆ دەتوانم تۆڵەت

لێبکەمەوە خۆشت دەزانی بەخوا بیر لە شتێك بکەمەوە هەرچی بێت ئەنجامی ئەدەم. جا من زۆر ڕێزت دەگرم لەبەر ئەوەی ڕاستەوخۆ خۆت پەشیمان بوویتەوە. دوکانم داخست و تەلەفۆنم کرد بۆ خێزانم: تۆ نان بخۆ من لەگەڵ ئافرەتێکم لەدەرەوە نان دەخۆم چاوەڕێی من مەکەن.

لاڤین: ئەوە ئاوا بە ئاشکرا بە خێزانت دەڵێیت لەگەڵ ئافرەتێك نان دەخۆم ئاساییە؟

ماکوان: بەڵێ ئاساییە بۆ ئافرەت مرۆڤ نییە؟ ئەوە ئێوەی مولحید و بێدینن لە ژێرەوە شتی قۆڕ زۆر دەکەن بۆیە لاتان ئاسایی نییە، بەڵام من درۆی لەگەڵ ناکەم ئەوەتا لەگەڵ تۆم و لێم دڵنیاییە کە ئەو ماکوانەم قسەم لەگەڵ تۆ کرد، لەبەر ئەوەش پێی دەڵێم چونکە تا من نەڕۆمەوە ئەو نان ناخوات. دوای نانخواردن هەر بە خێزانیشم دەڵێم چایەکمان بۆ دروست بکات و دەڕۆین بۆ ماڵی ئێمە و دوای ئەوە ئەتبەمەوە بۆ ماڵەکەت، بۆیە وام پێ ووت چونکە مەبەستم بوو بزانم ماڵی لەکوێیە.

نانمان خوارد و قبوڵی نەکرد بێتەوە بۆ ماڵەوە لەگەڵمدا دیاربوو شەرمی دەکرد، بەڵام بردمەوە بۆ ماڵەکەی لە شوقەیەکی یەك ژووریدا دەژیا بەتەنها.

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، لاڤین- یش هەموو چاتەکانی بۆ ناردم و ئیمەیل و پاسۆردی خۆی دامێ چوومە گروپەکەیان هەموویم هێنا، ستافەکەم بەخێرایی هەموویان خەزن کرد. زۆر سوپاسی لاڤین- م کرد زۆر شتم دەستکەوت و بڕیارماندا هەمووی بڵاو بکەینەوە لەگەڵ ستافەکەمدا لە فەیسبوك و یوتوب سایتەکاندا بەپلان دەستمان پێکرد، بەڵام بەداخەوە لەوکات و ساتەوە ڕیپۆرتی من دەستی پێکرد لە یتوب و فەیسبووك.[1]

هاوڕێ ئەفغانیەکەم هات بۆ لام کە لە ڕێگای ئەوەوە اللەبەخشم ناسیبوو هات بۆ لام لە دوکان، وتی ماکوان هەرچیت کردووە هاوکاری ئیقباڵ بکە.

ماکوان: بەخوا ناتوانم دوکانم چۆڵ ناکەم و خەڵکی خۆتان بچن بەدەمیەوە ئاڵتونی لێدزراوە ئەوەندەی تری هەیە، خۆی گەمژەیە من چی بکەم؟

هاوڕێ ئەفغانیەکەم: من هاوکاریت دەکەم و ئاگام لە دوکان دەبێت، هەرچیشم نەزانی بە خێزانت دەڵێم.

ماکوان: باشە قبوڵمە، حەزم دەکرد هاوکاریان بکەم و بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ ئەڵمانیا بۆ کاری ئیقباڵ.

شەوەکەی خۆم ئامادە دەکرد بەرەوە ئەڵەمانیا بۆ ئەوەی لە ناو کەشتیەکەدا بخەوم کاتەکەم وا دانابوو بۆ کاتژمێر ١١ی بەیانی بگەمە ئەڵمانیا و شەو لە سویدەوە کاتژمێر ٣ی شەو سەرکەوم، کەوتمە ڕێ لە ڕێگادا لە بەنزیخانەیەك لامدا و بۆ کڕینی شتومەك تا هاتمەوە ئەعور دانیشتبوو لە سەیارەکەمدا.

---

[1] لە لاپەڕەی داهاتوودا نمونەیک لەو چاتانە دادەنێم کە لاڤین بۆی ناردم

چییە ئەعور کتێبێکت دامێ و لێت سەندمەوە ئەوەی نوستراداموس هەی چروك ئەوە بە چی ڕوویەکەوە هاتوویت بۆ لام؟ ئەو ناوە خۆشەشت لە خۆت نابوو موئەید.

ئەعور: ماکوان هاتووم بۆلات ئەم ساڵ ٢٠١٨ بانگێشتکراوی بۆ کۆنگرەی (بیلدەر بێرگ گروپ) (bilder berg Group).




چوون بەرەو بیلدەربێرگ و دۆزینەوەی ڕافی

لە ڕێگادا توشی ئەعور بووم باسی ئەوەی بۆ کردم کە هاتووە بۆ لام ساڵی نوێ واتا (٢٠١٨) بانگێشتکراوم بۆ کۆنگرەی (بیلدەر بێرگ گروپ) (bilder berg Group).
ماکوان: ئەمە چییە؟
ئەعور: بەڕاست نازانی چییە؟
ماکوان: ئەگەر بمزانیایە پرسیارم نەئەکرد.
ئەعور: ئەمە ئەو گروپەیە کە ویرسان دەیەوێ تۆی تێدا دروست بکات، کە تەنها بۆ پیاوە گەورەکانی خاوەن دەسەڵات و سیاسەت و ئابوری و نفوزە.
ماکوان "بە قاقای پێکەنینەوە": دەی من بۆ بچم بۆ ئەو جێگایە نە دەسەڵاتم هەیە و نە سیاسەت دەکەم و نە کەسێکی زۆر دەوڵەمەند و سەرمایەدارم، نە خاوەن نفوزیشم، یرۆ عەرەبانەکەت ڕاکێشە و بە ویرسانیش بڵێ فێڵەکەی زۆر سادەیە.
ئەعور: ماکوان گەورەترین بەخت ڕووی تێکردوویت، نازانم بۆ وا دەکەیت و کێشەکەش لەوەدایە هەتا تۆ سەرکێشی بکەیت ئەوان سەرکێشتر دەبن، جا بۆ وا دەکەیت خۆشت و ئێمەش ماندوو مەکە.
ماکوان: خۆ تۆ بە عەرەبیەکی عێراقی قسەت دەکرد ئەم کوردیە جوانە لەکوێوە فێربوویت؟ (خەریك بوو وەڵام بداتەوە) نەمهێشت، پەلە مەکە وەڵام مەدەرەوە قسەکانم تەواو نەکردووە، نە تۆ نە باوکی تۆ نە ئیبلیسی باوکە گەورەتان نە ویرسانە تڕە ناتوانێت هیچ بەرانبەر بەمن بکات، من کە تەرەفی خوابم چۆن دێمە لای ئێوە کە تەرەفی شەیتانن.
ئەعور: چەند زمانێك دەزانم، بەڵام هیوام وایە بتوانیت لەو گروپە کار بکەیت لە هۆڵەندا چاوەڕێت دەکەین لە هوتێلێك مانگی ٥ی ساڵی نوێ. خۆشم پێشوازیت لێدەکەم وە ئەوەی تۆ حەزی لێبکەیت و بەخەیاڵتدا نەیەت بۆت دەکرێت بەهاتنت بۆ ناو ئەو گروپە.
ماکوان: نایەم و نامەوێت، ئەتوانیت یرۆی ملت بشکێنی، دەنا دانەبەزیت ئێستا خۆم و ئۆتۆمبێلەکە و تۆش ئەدەم بە شتێکدا تا هەردوو چاوت بێتە دەرەوە، لای خۆمەوە هەموو دەرگاو پەنجەرەم قوفڵ کردبوو نە دەیتوانی جامی سەیارەکە بکاتەوە یرەوات نە دەیتوانی دەرگاش بکاتەوە. بە بیرمدا هات چەقۆیەکم لا بوو لای دەرگای ئۆتۆمبێلەکە دامنابوو ئۆتۆماتیك دەکرایەوە چەقۆکە، بیرم لەوە کردەوە دەستی بدەمێ و دەری بهێنم و ڕێك بیکەم بەسەر دڵیدا. کە بیری چەقۆکەم کەوتەوە "بە پێکەنینەوە"، هوتێلەکە خۆشە ئەگەر ڕازی بم ئەعور؟
ئەعور: هوتێلەکە لە نزیك شارێکە لە ئاڕنیم و هەر ناوی بیلدەربێرگە، بەناوبانگترین و باشترین هوتێلی دونیایە.

هەر دەنگی چەقۆکە هاتە دەرەوە لە دەستی چەپم دامە دەستی ڕاستم و بەدەستی چەپم سوکانەکەم گرت، ویستم بە توندی بیدەم لەسەر دڵی. دەستم بۆ داهێنایەوە کوشنەکەی کون کرد و ئەعور نەما، لەو کاتەدا لەسەر خەتی خێرا بووم خوای گەورە ڕەحمی پێکردم دەنا خەریك بوو لەو مەسافەیەدا خۆم بدەم  بە ئۆتۆمبێلی تردا. لەبەر چاوم دیار نەما، بەڵام چەند دەقەیەك تەماشام  کرد لە کوشنەکەی دواوە دانیشتووە و پێم پێدەکەنێت. زۆر پەست بووم ترسام  پەلامارم بدات ناچار ئۆتۆمبێلەکەم هێواش کردەوە و لامدا بۆ ئەوەی بە تورەییەوە ئۆتۆمبێل لێنەخورم، کە لامدا دەرگام کردەوە وەك گیزەی مێش ئاگام لێبوو دەرچوو.
تەلەفۆنم کرد بۆ کوڕێکی هاوڕێم لە هۆڵەندا کەماوەی ٣٠ ساڵ بوو لەو وڵاتە دەژیا و پیشەی پزیشك بوو، وتم هەواڵی هوتێلێکم بۆ بپرسە لە نزیك ئاڕنێم بزانە شتی واهەیە، ئەگەر هەبوو بزانە شەوی بەچەندە لەوانەیە دوو شەو بچمە ئەو هوتێلە.
بەردەوام بووم لە لێخوڕین بەرەو مالمۆ کە یەکێکە لە شارە گەورەکانی سوید لەوێوە سواری کەشتی ببم ڕاستەخۆ بۆ کیل کە شارێکی ئەڵمانیە.
هاوڕێکەم تەلەفونی بۆ کردمەوە داوام لێکرد دای بخات وە نزیکە ١٠ خولەکی تر لە ناو کەشتیەکەوە قسە دەکەین لەسەرەدا وەستاوم بۆ ناو کەشتی. دوای ئەوە تەلەفونم بۆ کردەوە، نزیکی ٩ کاتژمێری پێدەچوو تا دەگەیشتە کیل لە ئەڵمانیا و چوومە ژووری خۆم لە ناو کەشتیەکەدا و بە هێمنی و ئارامی دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ فریادی هاوڕێم وە ئەویش بۆی باسکردم.
فریاد: کاکە بەڵێ ڕاستە هوتێلێك هەیە لە نزیك ئاڕنێم ناوی بیلدەربێرگە شەوێك مانەوە تێیدا بای  ١٠٠٠ ئێورۆیە، مەرجی مانەوە دەڵێت دەبێت خاوەنی پێگەی سیاسی بێت یان بزنسمان بێت، یاخود کەسێکی ناسراوی دیپلۆماتیك بێت، هەرزانترین ژووریش بەو پارەیە بگرە ژووری تێدایە بۆ یەك شەو دەچێتە ٦٠٠٠ ئێورۆ!
ماکوان: بەجدیتە یان ڕادەبوێری، شتی وا چۆن دەبێت؟
فریاد: نا بەڕاستمە، جا تۆ بۆ نایەیت بۆ لای من بۆ دەچیتە هوتێل؟
ماکوان: من دەچمە ئەڵمانیا، کەسێك ویستی لەوێ ببینم بۆیە هەواڵم پرسی.
فریاد: ئێ کاکە تۆ خۆت دەزانی هەموو هۆڵەندا بە ٥ سەعات دەگەڕێیت وەرە لای من بۆ داناخ بەیەکەوە دەڕۆین دوایی.
ماکوان: بزانم چۆن دەبێت.
فریاد:  بۆ زانیاریت ئەو جێگایە شوێنێکی وا ئاسان نییە، لەسەریم خوێندەوە زیاد لە  ١٠٠٠ پۆلیس پاسەوانی دەکات.
ماکوان: شتی وا چۆن دەبێت، ئەی مەگەر هوتێل نییە؟

فریاد: ماوەی ٣٠ ساڵە لەم وڵاتەدام یەكەم جارە ناوی ببیستم و كە چوومە ناو پێگەی هوتیلەكە زۆر ترسناك هاتە بەرچاوم، ماكوان تكایە سەركێشی مەكە ئەمە جاران نییە خۆت بكەیت بە هەموو جێگایەكدا و نەترسی، ئەو شوێنە جێگایەكی ئاسایی نییە دڵیشم لەخۆوە بە تۆ باش ناڵێت هەرچیت پێویستە هاوكاریت دەكەم واز لەوجێگایە بێنە، باشە؟

ماكوان: باشە بەس پێم بڵێ ئەو جێگایە چییە یان زیاتری لەسەر بخوێنەرەوە بابزانین چییە، چونكە با منیش هەڵنەخەڵەتێنن كەسابەتە و كارێكی ئاساییە، لەوانەیە پارەكەم بخۆن. بۆیە ئەو درۆ سپیەم كرد هۆكارەكەی ئەوە بوو كە فریاد منی زۆر خۆشدەویست و پێشتر لەسلێمانی منداڵی یەك گەڕەك بووین و لە قوتابخانەی ناوەندیش بەیەكەوە بووین، لەگەڵ فریاد قسەكانمان تەواو كرد، لەدوای پشویەكی باش حەمامم كردو خۆم گۆڕی بۆ ئەوەی بچم بۆ ناو بازاڕی كەشتیەكە و لەناو دوكان و چێشتخانە و جێگاكانی پیاسەیەك بكەم و نانێك بخۆم تا هەندێك ماندوو دەبم و بەئارامی دەخەوم تا بەیانی كاتژمێر ١٠ دەگاتە كیل.

لە ناو بازاڕی كەشتیەكەدا دەگەڕام كچێكم بینی زۆر جوان بوو لە یەكێك لەو كچانە دەچوو كە كاتی خۆی لە شاری سلێمانی دڵمان بەیەكەوە بوو، بەڵام هاتبوو بۆ ئەوروپا و لەوێوە من وا ئاگادار كراوبوومەوە كە ژیانی لەدەست داوە. بەدوای كەوتم بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، هەر دەمویست پێشی بكەوم بۆ ئەوەی بزانم ئەو كچەیە كە یەكمان دەناسی.

چونكە باوكی پێشمەرگە بووە لەگەڵ باوكمدا كاتی خۆی ویستم خۆم بكوژم، باوكی نەیهێشت و لەدوای ئەوەی كە دەگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا هیچ هەواڵێكم لێی نەبوو، لە ساڵی ١٩٩٦وە نەم بینیووە ئەوا ئێستا ساڵی ٢٠١٧یە واتا ٢١ ساڵە ئەو خۆشەویستەمم نەدیووە، تاكە شتێكیش كە لە نێوانماندا مابێت تەنها شیعرێكە بەناوی سروەیە، بەڵام كچە ناوی پەروانە بوو.

ئیتر من خەیاڵم لێ هەڵگیرا و ئاگام لەخۆم نەما، شوێنی ئەو كەوتم لە یەكێك لە دوكانە تاكست فریەكان (Tax free) لە بەرچاوم ون بوو، بەڵام من ئۆقرەم لێهەڵگیرابوو و زۆرم برسی بوو لە تاواندا برسێتیم بیرچووەوە و بەناو خەڵكەكەدا وەكو شێت دەگەڕام لەبەر چاوم نەما. یادی جاران و كۆنە هەواری جارانم هاتەوە بی، بەڵام ئومێدم نەما لەدوای گەڕانێكی زۆر بەرەو ڕێستورانتێك چووم داوای (ڤێجیتار پەنینیم) كرد چاوەڕوانی ئەوەم دەكرد بۆم دروست بكەن، لەو ساتەدا هەمان كچ بە بەردەممدا تێپەڕی.

هاوارم كرد پەروانە، پەروانە؟

ئاوڕی دایەوە و وتی بەڵێ؛ من پەروانەم.

دەست بەجێ لەخۆشیدا چووم بۆ لای و وتم نامناسیتەوە؟ من ماكوانم.

پەروانە: ببورە، من تۆ ناناسم.

ماكوان: پەروانە، ماكوانم باوكت كاك ڕێبوارە بە ڕەحمەت بێت كە لەشەڕی ناوخۆ كوژرا، نەنكت ناوی ئافتاوە. من ئەو كورەم كە هەموو جارێك جلوبەرگت بۆ دەناردمەوە لە ئەڵمانیاوە.
ئەوەندە بەدەنگی بەرز و موشتاقیەوە قسەم دەكرد هەرچی لە ڕێستۆرانتەكەدا بوو تەماشایان دەكردین.
پەروانە: كاكە ببورە من ناتناسم تۆ هەڵەیت، بەڵام تۆ چۆن من دەناسیت؟
ماكوان: وەرە دانیشە با بۆت باس بكەم، من كوری شەهید عەبدولكەریم پێنجوێنیم.
پەروانە: تۆ خەسرەوی؟
ماكوان: بەڵێ، بەڵێ، خەسرەوم.
پەروانە: ئەی بۆ دەڵێیت ماكوانم؟
ماكوان: ببورە لە خۆشی تۆ ناوەكەی خۆمم بیر چوەوە، ڕاستە من خەسرەوم.
پەروانە: كە خۆشحاڵم تۆم بینیەوە، خەسرەو ئێستا زۆر لە جاران قۆزترو جوانتر بوویت.
ماكوان: تۆش لە هەموو كاتەكان جوانتری، ئەو كاتانەی من چاوەڕێم دەكردی بۆ هیچ هەواڵێكت بۆ نەدەناردم؟
پەروانە: لە دوای مردنی باوكم توشی نەخۆشی دەروونی بووم، دایكم هات بۆلام و ئیتر لەو كاتەوە ڕۆشتوومەتەوە لای دایكم و ماوەی چەند ساڵێك لە ژێر چاودێری پزیشكی دەروونیدا بووم  كە وورده ووردە باش بووم ساڵی ٢٠٠٠ بوو، هەواڵم ناردەوە بۆ سلێمانی بە كورێكی ناسراوماندا چووبوو بۆ لای دایكت، كەچی وتبووی هاتووە بۆ ئەوروپا ئێستا لەوێ ژیان دەكات. ژمارەی تۆی دابوو پێی بەڵام ژمارەكە هەڵەنوسرابوو كە بۆ منیان نارد دووجار تەلەفۆنم بۆ كردی هەڵەبوو.
ماكوان: پەروانە زۆر خۆشحاڵ بووم بە دۆزینەوەت، ئەی چی دەكەیت لێرە؟
پەروانە: ئەفسەری دەریاییم و كاری من چاودێریكاری (GPS) مانگی دەستكردە دەرياییەكانە. ئەمڕۆ كارەكەم تەواو بوو  تا ١٥ ڕۆژی تر پشووم هەیە، واتا دوو هەفتە كار دەكەین و دوو هەفتەش پشوو.
ماكوان: كە خۆشحاڵم واتا ئیشت نەما، دەچیتەوە بۆ ماڵەوە؟
پەروانە "بە پێكەنینەوە": بۆ خۆشحاڵ بوويت؟
تۆزێك تەریق بوومەوە و ڕەنگم سور هەڵگەڕا.
پەروانە: ئەزانی نەگۆڕاویت وەكو هەڵسوكەوت هەر خەسرەوەكەی جارانی.
ماكوان: "بە پێكەنینەوە" ناوم گۆڕیووە مانای وانیە خۆم گۆڕابێتم.
ئەو شەوە حەزم نەدەكرد پروات خواردنیان بۆ هێنام  پێم وتت كە بخوات لەگەڵم یان  بۆی داوا بكەم.
پەروانە: نا لەوەی تۆ دەخۆم بە زەردەخەنەوە تەماشای دەكردم.

ماکوان: منیش هەموو گیانم پێدەکەنی وام دەزانی ساڵی ١٩٩٥، لەخوای گەورەم دەویست کات نەڕوات.
پەروانە: لەکام ژووریت؟
ماکوان: قاتی دوو ژووری ٢٠٨.
پەروانە: من لەگەڵ چەند هاورێیەکی کچم بەیەکەوەین، دەچم مۆڵەت لەوان دەخوازم دێمەوە بەیەکەوە دەبین.
ماکوان: خۆشحاڵ دەبم!
ئەو ڕۆیشت و منیش هەستێکی زۆر عەجیبم بۆ دروستب بوو وا هەستم دەکرد لە فلیمی تایتانیکدام ئەوندە خۆشحاڵ بووم نەمدەزانی چی بکەم، ماوەیەکی پێچوو پەروانە گەڕایەوە بۆ لام.
پەروانە "بە پێکەنینەوە": پرۆین بۆ کوێ؟
ماکوان: بچینە دەرەوە تەماشای دەریا بکەین؟
پەروانە: سەرمات نایێت؟
ماکوان "بە پێکەنینەوە": نەخێر؛ ئەوەتا خۆرەتاوە هەست دەکەم دنیا زۆر گەرم و جوانە و هەموو چواردەورم پەروانەیە.
پەروانە: کەواتە با پرۆین.
بێ ئەوەی من هیچ هەست بە خۆم بکەم دەستم خستە ناودەستی و بەیەکەوە بەناو بازاڕی کەشتیەکەدا دەرچووین، بەدەم قسەکردنی جاران و سلێمانی و ئەوکاتانەی کە بەیەکەوە دەچووین بۆ بازاڕی خەفاف و ئۆرزی و... هتد
پەروانە: هەست دەکەم زۆر خۆشحاڵی؟
ماکوان: ئەی تۆ خۆشحاڵ نیت؟
پەروانە: زۆر هێندەی ئەم دەریایە.
ماکوان: کەمە! هێندەی ئاسمان من خۆشحاڵم.
ماوەیەك بێدەنگی ڕووی تێکردین نەمدەویست بێدەنگبم لەگەڵیدا بۆیە پرسیم هیچ شارەزایت هەیە لەگروپی بیلدەربێرگ؟
پەروانە: بەڵێ، واتا حکومەتی جیهان!
ماکوان: چی؟
پەروانە: ئەی بۆ، واتا حکومەتی جیهان وە ئەو کۆمەڵە کەسەی کە حوکم و دەسەڵاتی هەموو جیهانیان بەدەستە.
ماکوان: من وامزانی هوتێلێکە و هیچی تر.
پەروانە: تەواوە هوتێلیش هەیە بەم ناوە لە هۆڵەندا، یەکەم کۆبوونەوەیان لەساڵی ١٩٥٤ی زاینی بەست لەو هوتێلە لەهۆڵەندا بەناوی ئەو هوتێلەوە ناونراوە.
ماکوان: ئیشیان چییە ئەم گروپە؟
پەروانە: لێرەش واز لە سیاسەت ناهێنی خەسرەو؟

ماکوان: ئەزانی کە دەڵێیت خەسرەو هەموو گیانم لەخۆشیدا پێدەکەنێت؟ دەمێکەیە گوێم لەو ناوەم نەبووە.
دەمویست زانیاری لەسەر ئەم گروپە بزانم، بەدەم قسەکردنەوە بەناو هەموو کەشتیەکەدا دەگەڕاین و دەستمان لە ناو دەستی یەکتردا بوو وامدەزانی لە شەقامی تووی مەلیکی سلێمانیم هیچ ئاگام لە ژیان و کەسایەتی خۆم نەمابوو.
پەروانە: ئەم گروپە زۆربەی بازاڕی جیهانیان بەدەستە لە هەموو کۆمپانیا زەبەلاحەکان تا ساڵەکانی ١٩٧٠ تەنها ئەمریکی و ئەوروپی لەناو ئەم گروپەدا هەبوون، بەڵام ساڵی ١٩٩٩ گروپەکە فراوان بوو لەئاسیا و ئوستراليا و ئەفریقیا خەڵکی تر هاتنە ناوەوە، بەڵام جێگای گرنگیان نییە، ئەوانەی ئەم گروپە بەڕێوەدەبەن دەبێت ئەوروپی و ئەمریکی بن.
ماکوان: ئیشیان چییە؟
پەروانە: هەموو جیهان بەڕێوە دەبەن.
ماکوان: ئەی ستراتیژیان چییە؟
پەروانە: هیچ کەس نازانێت زۆر نهێنیە و تەنانەت هیچ ڕۆژنامەنوسێك بۆی نییە نزیکیان ببێتەوە و لە کاتی کۆبوونەوەی ساڵانەیان بە هەزارەها پۆلیس پاسەوانیان دەکات و بە چەند مانگ پێش وەخت لەهەر جێگایەکدا کۆببنەوە ئەو جێگایە بەهەموو شێوەیەك دەبێتە شوێنێکی سەربازی وەکو ناوچەی ٥١ی ئەمریکی.
ماکوان : ناوچەی ٥١ ئەمریکی چییە؟
پەروانە: (AREA 51) چۆن نازانیت؟ ئەوە جێگایەکی قەدەغەیە هیچ کەس ناتوانێت بچێتە ئەوێ، چونکە شوێنێکی سەربازی نهێنیە.
ماکوان: بەڵێ، بەڵی، بیرم کەوتەوە دەزانم باسی چی دەکەیت بەحساب دەڵێن ئەوە جێگای ئەو مەخلوقانەیە هاتوونەتە سەر زەوی، ئەمریکا شەڕی لەگەڵ کردوون.
پەروانە: ڕاستە، بەڵام پێم وایێت ئەوە درۆیە تەنها کاری سەربازی ئەمریکی تێدا دەکرێت. ئەم گروپە تەنانەت ئەوەشی لە ناویدایە ئەگەر نهێنییەك ئاشکرا بکات ئەوا بچوکترین سزا ئەوەیە کەسەکە بەشداری ناکاتەوە، تا دەگاتە ئەوەی هەموو سەروەتەکەی لێدەسێننەوە و دەیکوژن.
لەم قسانەدا بووم لەگەڵ پەروانەدا تەلەفۆنێکم بۆ هات لە کەشتیەکەدا هەرچەندە شەبەکەم زۆر لاواز بوو زانیم سامانە لە ئەڵمانیاوە، بۆیە داوامکرد بەنامە ئاگادارم بکاتەوە. بۆی نووسیم کە ڕافی دۆزراوتەوە، زۆر دڵخۆش بووم چونکە مادام ڕافی دۆزراێتەوە واتا ئاڵتونەکانیش سەلامەتە.
پەروانە: بچینە دیسکۆکە ئێستا کراوەتەوە؟
ماکوان: باشە باپرۆین.
بەدەم ڕێگەوە بەرەو دیسکۆی ناو کەشتیەکە بەبێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت بە هەموو شتیك ڕازی کرابووم، دەستم لەناو دەستی ئافرەتێکی نامەحرەم

بوو بەرەو دیسکۆی ناو کەشتیەکە دەڕۆشتین، وەکو هەورە بروسکەیەك بەگیانمدا هات و شتێك چپاندی بەگوێمدا وتیان: تۆخەسرەو نیت ماکوانی، تۆ خواناسی دەست دەربهێنە لەدەستی ئەو ئافرەتە بۆ کوێ دەچیتە ژوورەوە، ئەوە جێگای تۆ نییە.
بەپەلە دەستم لەدەستی پەروانە کردەوە، وەکو چۆن بەترسەوە تەماشای کەسێك بکەیت بەوشێوەیە تەماشای پەروانەم دەکرد هیچ ئاگام لە خۆم نەمابوو.
پەروانە: بۆ وا تێکچوویت، خۆ هیچ نەبووە؟!
ماکوان: نایەمە دیسکۆ.
پەروانە: بۆ؟
ماکوان: نایەمە ئەو شوێنانە پەروانە.
پەروانە: باشە بڕۆ دەچین بۆ ژوورەکەی خۆت.
ماکوان: هەردووکمان بچین بۆ ژوورەکەی من؟!
پەروانە: خۆت دەزانی! بچینە دیسکۆ یان ژوورەکەی خۆت، کوێت پێخۆشە بۆ ئەو جێگایە دەچین، بڕیار بدە دەستی منی خستەوە ناو دەستی.
ماکوان: نەهەناسەم بۆ ئەدرا نەقسەم بۆ دەکرا وە نەشم دەزانی چی بکەم. ئەمە بڕیارێکە چارەنوسی من دیاری دەکات بە هەردوو جەمسەرەکەیەوە.

## پەروانە و سوتاندنی هەناوی ماکوان

لەگەڵ پەروانەدا هەستی هەرزەکاریم بۆ گەڕابووەوە وا هەستم دەکرد کە گەڕەك و جارانی سلێمانیە و کەسایەتی و تەمەن و هەموویم لەبیر کردبوو،

پەروانە یەکێك بوو لەو خۆشەویستانەی کە لەدەستم دابوو. دۆزینەوەی لە کەشتیەکەدا لەماوەیەکی کەمدا دروست بوونەوەی خۆشەویستی و گەڕانەوە بۆ ژیانی منداڵی و بەرائەتی هەرزەکاری، دەستم لەناو دەستی پەروانەدا بوو بەرەو ژوورەکەم دەڕۆشتین، کاتێك تەماشای دەکردم لێوی بائەداو ئەیگەزی زیاتر ئەی ورووژاندم. خۆشەویستی زۆری دەردەپڕ، مەست بووم بەدیارییەوە تا چووینە ژوورەوە.
بەخێر هاتنم کردو چاکەت و جلەکانی سەرەوەی داکەند و منیش چووم بۆ تەوالێت و تا هاتمە دەرەوە خەریکی ئەوە بوو هەموو جلەکانی خۆی داکەند و منیش وەکو پەیکەرێك بەدیاریەوە وەستابووم، بەزەردەخەنەیەکەوە تەماشای کردم و ڕووە و من هات وەکو چەکوشێك بکێشن بەسەرمدا بەو شێوەیە ئازارم پێگەیشت لە دەمەوە هاڵاوێکی گەرمی چووە ناو لاشەم و لەپڕ پەروانە نەماو ئەوەندەش ئازارم پێگەیشت لەسەر بێدی ژورەکە بێ هۆش کەوتم.
کە بەئاگا هاتمەوە زۆرێك لە فەرمانبەرەکانی ناو کەشتیەکە دەرگای ژوورەکەمیان کردبووەوە لەڕێگای ژمارەی ئۆتۆمبێلەکەم کە لە گەراجی کەشتیەکەدا چاوەڕێیان کردبووم دەبێت دەرچم بەتەنها ئۆتۆمبێلەکەی من مابوویەوە و بەوەدا دۆزیبوویانەوە من لە چ ژوورێکدام و هاتن وتیان چی بووە؟
ماکوان: هەست دەکەم لە شەوەوە بووراومەتەوە و نائاساییم.
فەرمانبەرێك: تۆ گەشتوویتە ئەڵمانیا سویچی ئۆتۆمبێلەکەمان بدەرێ و ئێستا ئامبولانس (فریاگوزاری) بانگ دەکەین، چونکە وەجبەی تر لە ئەڵمانەوە سەردەکەوێت بۆ سوید ئێمە دەگەڕێینەوە، ببورە کاتمان نییە.
ماکوان: زۆر باشە ئەوە سویچ ویستم هەڵسمەوە هیچ ئازارم نەبوو، بەڵام قاچم بە زەوییەوە نوسابوو، هەستم بە ماندبوونێکی زۆر دەکرد توانای قسە کردنم نەبوو ئاگام لە خۆم بوو، بەڵام هەرچیەك بکرایە توانای وەڵامدانەوە و قسەکردن و پرسیارم نەبوو.
ئامبولانس هاتوو منیان برد بۆ نەخۆشخانە لە کیل هیچ کێشەیەکی جەستەییم نەبوو، ناچار کردیانمە دەرەوە منیش هاتمە دەرەوە ئەدرەسی ئۆتۆمبێلەکەیان پێدام و بە تەکسیەك چوومە لای ئۆتۆمبێلەکەم و ماوەی ٤ کاتژمێر لە ناو ئۆتۆمبێلەکەم مامەوە توانای لێخورینم نەبوو.
تا وورده وورده هەستم بە باش بوون دەکرد و لاشەو سوکی و ئەکتیڤی و چالاکیم بۆ گەڕایەوە، هەستم دەکرد هێزم تێدایە. سەیارەکەم گەرم کرد و کەوتمە ڕێ هەر بێدەنگ بووم نەم دەتوانی بیربکەمەوە بێدەنگیەکە ئارامی پێدەبەخشیم، پاش ڕۆشتنیکی زۆر بەرەو کۆڵن لە ڕێگادا دەستم نا بە دوگمەی سیدی و سەیارەکەم قورئانی لەسەر بوو بەدەنگی سەعد الغامدی، سەرەتا ئاسایی بوو وورده وورده گیانم قورس بوو دیسان وەکو ئەوەی بە چەکوش بکێشن بەسەرمدا و بەپەلە سەیارەکەم لادا و بارانیش دەباری دەرگای سەیارم کردەوە بۆ ئەوەی دابەزم هەناسم بۆ نەئەدرا ئەوەندەش ئازاری سەرم هەبوو ئاگام لە هیچ نەما بوو، ئەوەندە ئاگادارم

كەوتمە ناو قوڕ چڵپاوی سەرجادەكە و ئاوی باراناوی سەر شەقامەكە بەسەر دەموچاومدا دەڕۆشت.
كە چاوم كردەوە لە نەخۆشخانەیەك بووم داوام لە كەسێك كرد لە نەخۆشخانەكە تەلەفۆنەكەم بۆ پەیدا بكەن لەناو ئۆتۆمبێلەكەمدایە و شەحنەكەیشیم بۆ بهێنن. نەمدەوێرا هەڵسم بچمە دەرەوەی ئەو ژوورەی كە تێیدا پاڵ كەوتبووم، دەترسام بكەوم و كەس نەبێت هەڵم بگرێتەوە.
پەرەستارەكە ووتی: ئۆتۆمبێلەكەت لێرە نییە، بەڵام شوێنێكە نزیك هامبورگ هیچ كێشەت نییە دەتوانیت بڕۆیت پشكنینمان بۆ كردوویت هیچ كێشەیەكت نییە.
ماكوان: بەڵام سەرئێشەیەكی زۆرم لەگەڵدایە؟
پەرەستارەكە: حەبی ئازار بخۆ چاك دەبیت، تۆ هیچ كێشەیەكت نییە و دەتوانیت بڕۆیت.
تەكسیم گرتوو بەرەو لای سەیارەكەی خۆم ڕۆشتم هەستم كرد كەسێكی ئاساییم هیچ ئازارم نییە، بەڵام زۆرم برسیە و نزیكەی ٢٤ كاتژمێرێك دەبوو هیچم نەخواردبوو، چوومە ناو بازاڕ لە هامبورگ هەندێك سمیت و بۆرەك و خواردنی ترم خوارد و دیسانەوە چالاكیم بۆ گەڕایەوە، خەریكی قاوە خواردن بووم گەڕامەوە لای ئۆتۆمبێلەكەم گەرمم كرد و نەڕۆشتم، بەڵكو دەستم كرد بە شەحن كردنەوەی تەلەفۆنەكەم، نەمدەوێرا بیربكەمەوە هەستم دەكرد شتێك لە ناو مێشكمدا دەهات و دەچوو ئازار لە گیانمدا نەبوو، بەڵام هەستم دەكرد جوڵەی گیانم لەدەستی خۆمدا نییە. تەلەفۆنەكەم كردەوە و تەلەفۆنم كرد بۆ خێزانم، دوای هەواڵپرسی وتی زۆر خەمم بووە بۆ تەلەفۆنەكەت داخرابوو؟
ماكوان: شەحنم لێ ون ببوو تا كڕیم زۆرم پێ چووە.
خێزانم: سەلامەتی؟
ماكوان: زۆر باشم، ببورە دەبوو هەوڵمدایە تەلەفۆنم بكردایە بەس نەمتوانی.
دەترسام لەوەی سەیارە لێبخورم دەستم نا بە تەسجیلەكەدا قورئانەكەی لەسەربوو لە ترساندا كوژاندمەوە بێدەنگی ڕووی تێكردم، هەستم دەكرد خۆم نیم دەمویست خۆم بم نەمدەتوانی، كەسێكی لاواز چەقیو بەزەویدا كە بیرو هزری خۆمم دەجوڵاند ئازار بەسەرمدا دەهات، دەمویست بیر بكەمەوە بۆ وام لێهاتووە هیچ وەڵامێكم دەست نەدەكەوت، بیرم كەوتەوە كوا پەروانە؟
لەبیركردنەوەی پەروانەدا بووم ئەوەندەم زانی پەروانە و ئەعور و ویرسان هاتن بۆ لام.
ویرسان: زۆر دەمێك بوو ئەمویست ببینە هاوڕێ ئێستا هاوڕێین و كەس ناتوانێت لە هاوڕێیەتیمان بكات.
ماكوان : من هەرگیز نابمە هاوڕێی ئێوە.
پەروانە: ڕووەو من هات و دەستی خستەوە سەر شانم لە پڕ نەما و ئازارە زۆرەكە هاتەوە بەسەر سەرمدا و لەناو مێشكمدا دەیوت سوجدە بەرە بۆ

ویرسان دەنا مێشکت ئەتەقێنم، بە چەکوش دەیانکێشا بەسەرمدا هەر دەیوت سوجدە بەرە بۆ ویرسان.
منیش لە تاو ئازاری سەرم هیچم بۆ نەدەکراو دەشم زانی سوجدە بردن بۆ ویرسان واتای کافر بوون و لەناو چوونم، چی عەزایێکیاندام هاوارم دەکرد خوای گەورە فریام کەویت ئەو هەموو خەڵکە بەدەورمدا پێدەکەنین و کەس دەستی نەئەدا بەدەستمەوە، تا جارێکی تر بە قورسی کەوتمەوە سەر زەوی و ئەوەندی تر ئازارم پێگەیشت و دیسانەوە بوورامەوە ئاگام لەخۆم نەما دەم و چاوم لەگەڵ خاك و خۆڵدا تێکەڵ بوو.
ئازارێکی وام هەبوو نەمدەزانی چۆن ڕزگارم بێت، هەر کە دەمووت استغفرالله بە تەورو چەکوش دەیانکێشا بەسەرمدا، هەر دەموت لا حول ولا قوة إلا بالله وەکو کەمتیار قەپ لە جەستەم بگرێت وام لێدەهات، ناچار قورئانم واز لێهێنا و خۆم دەم بەست کرد بۆ ئەوەی زیکری خودا نەکەم، ڕووت و قوت کرامەوە لە مرۆڤبوون بووم بە ڕۆبۆت و کارەکەرو خزمەتکاری پەروانە و ئەعور و ویرسان.
چارم نەما ئەوکاتە کە نانم خوارد لە هامبورگ کاتژمێر ٦ی ئێوارە بوو هەڵسامەوە لای ئۆتۆمبێلەکەمدا لە جێگای پارکینگی ئۆتۆمبێلەکاندا خەبەرم بوویەوە کۆمەڵێك گەنج بەسەرسەرمەوە بوون، هەڵسام و سوپاسی ئەوانم کردوو ووتم باشم ئەوە ئۆتۆمبێلی خۆمە ماندووبووم خەوم لێکەتبوو، بەڵام کاتژمێر هەشت و نیوی شەوبوو تەلەفۆنم کرد بۆ فریاد داوام لێکرد هەرچۆن بووە وەرە فریام کەوە تەندروستیم باش نییە؟
فریاد: ئەو جێگاگەی کە تێیدای بە ڤایبەرەکەت ئەدرەسەکەی بنێرەو چێك ئەدەرس بکە بزانم چەندە دووری لە منەوە؟
بۆم نارد کە تەماشای کردبوو ئاگاداری کردمەوە ٥ کاتژمێر لێمەوە دوورە، پێشم وت هاوڕێیەکی بهێنێت چونکە من ناتوانم ئۆتۆمبێل لێبخوڕم.
فریاد: هەر ئەم شەو بە پشتیوانی خوا دەگەمە لات، لە جێگای خۆت مەجوڵێ بۆ زانیاریت خۆشەویستێکی تۆم لایە ماکوان دەزانی کێیە؟
ماکوان: بەخوا فریاد ئەوەندە بێزارم لەخۆم کەس ناناسمەوە بەقوربانتان بم فریام کەون.
فریاد: باشە ماکوان گیان سوارەم لایە، کاکە بازی گەڕەکی خۆمانە.
ماکوان: ئەزانم، ئەو سوارەیەی پێمان دەوت کاکە باز؟
فریاد: بەڵێ؛ ئەویش لەگەڵ خۆم دێنم و ئێستا دێین، ئەزانم بێتاقەت دیاری وا هاتین ئاگات لەخۆت بێت و نەجوڵێیت، ماکوان وەکو پێم ووتی بەهیچ شێوەیەك ئۆتۆمبێل لێنەخوڕیت هەرگیز ئاوا بەناساغی تۆم نەدیووە.
ماکوان: باشە دەست و بردێك بکەن.
چوومەوە ناو ئۆتۆمبێلەکەم خۆم سەرقاڵ کردبوو بە نوسینی کورت کورتەوە لە فەیسبووکەکەم، دیسانەوە لەدەرەوەی ئۆتۆمبێلەکەم وەکو ئەوەی گردبوونەوە بکەن دنیایەك کوڕ و کچ و پیاو و ژن کۆبووبوونەوە ویرسان و پەروانەم

تیایاندا بینی و دابەزیم و پاڵمدا بە ئۆتۆمبێلەکەمەوە و لێیان دەترسام، لەسەرماندا هەڵدەلەرزیم. پەروانە هاتە لام: بۆ دەلەرزیت سەرماتە؟
ماکوان "زۆر بە کەساسی": بەڵی سەرمامە.
پەروانە: چاکەتەکەی خۆمت بدەمێ بیکەیتە بەرت؟
ماکوان: نامەوێت سوپاس، هەروام وت دیسانەوە هاتە تەنیشتمەوە سەری کردە سەر شانم و نەما، ئازارەکەم دەستی پێکردەوە و ئەوەندەیان پیاکێشام کلۆ خوێنم هەڵدەهێنایە دەرەوە خوێنەکەم سور نەبوو، بەڵکو خوێنێکی قاوەیی بوو. پیایدا دەکێشام و دەیوت سوجدە بەرە بۆ ویرسان، پەروانە زۆر ئازاری دام.
سەرم بەرزکردەوە و هاوارم کرد، ئەگەر چاك ببمەوە پەروانە پەڕوباڵت دەکەم ئاگاداری ئەوە بووم چی لەگەڵ پەروانە و ویرسان دا بوو پیایان دەکێشام، چ ئازارێکم توش بوو. هاوارم دەکرد فریام کەون، کەس بەهانامەوە نەهات جارێکی دیکە کەوتمەوە سەر زەوی دەموچاو و گیانم لەناو خوێنی خۆمدا گەوزابووم، خۆم بەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە. لەدوای ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دیسان بیهۆش کەوتم و ئاگام لەخۆم نەما.
نازانم ماوەی چەند بێهۆش بووم، بەڵام ئەوەی بەئاگای هێنامەوە ویرسان بوو وتی: هاوڕێ ماکوان ئۆتۆمبێلەکە لێخوڕە باڕۆین.
ماکوان: ناتوانم هەڵسم.
ویرسان: بە توانا و هێزی خۆم هەڵتدەسێنم، هەڵسە.
ماکوان: ناتوانم بێم چاوەڕوانی خەڵکێك دەکەم، ناتوانم لێرە بجوڵێم.
پەروانە لە پشتی ویرسان هات برەو ڕووم: دێیت یان دەزانی چیت لێدەکەم؟
ناچار لەتاو ئازار ئەو جێگایەم جێهیشت و بەلێخورینی سەیارە هەر ڕاست و چەپیان پێدەکردم تا بردمیانە ناو دارستانێك و هاتمە دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکەم، تەماشام کرد ئاهەنگێکی زۆر خۆشە منیش لەگەڵ ویرسان دابەزیم و ڕووەو ئاهەنگەکە چووین بێ ئەوەی قسە لەگەڵ یەك بکەین، ڕۆشتین هەموو هەڵدەپەڕین و بەرازیان سورکردبووە و شەرابیان دەخواردەوە کوپێك شەرابیان بۆ من هێنا منیش دەست بەجێ ڕشتم.
جارێکی تر پەروانە بەرەو ڕووم هات، منیش ڕامکرد بەرەو لای ئۆتۆمبێلەکەم و چوومە ناو ئۆتۆمبێلەکەم دانیشتم و تەماشام کرد لە ناو ئوتومبێلەکەدا دانیشتووە.
پەروانە: خەسرەو گیان بۆ لەدەستم ڕادەکەیت نازانی من تۆم چەندە خۆش دەوێت؟
ماکوان: من پێوسیتم بە خۆشەویستی تۆ نییە بە ترسەوە قسەم دەکرد، چونکە زۆر ئازاری دابووم.
پەروانە: وەرە پێکەوە بڕۆینەوە بۆ ناو ئەو ئاهەنگە و بەیەکەوە سەما دەکەین.
ماکوان: ناتوانم حەزدەکەم لێرە پشوویەك بدەم.
پەروانە "بە تورەیەوە": دائەبەزیت یان دات بەزێنم؟

ماکوان: زانیم هەڕەشەیە و بە چەکوش دەکێشێتەوە بەسەرمدا بۆیە ناچار دابەزیم و دەستم خستەوە ناو دەستی و بەرەو ئاهەنگەکە چووم، هەموو بەدەوری من و پەروانەدا سەمایان دەکردو پێدەکەنین و زرەی پێکی شەرابیان دەکێشا بەیەکدا.

ناچار مامەوە هەستم بەسەرما دەکرد، دەستم لەناو دەستی پەروانەدابوو هێزم تێدا نەمابوو ئەوەندە ئازارم هەبوو، تەلەفۆنێکم بۆ هات لە فریادەوە دوورکەتمەوە بۆ ئەوەی گوێم لە فریاد بێت.

فریاد: ماکوان لە کوێیت؟

ماکوان: بردوویانم نازانم لەکوێم.

فریاد: ئەو خوێنە لە تۆ ڕۆشتووە لەو جێگایەی کە ئۆتۆمبێلەکەتت لێ پارك کردووە؟

ماکوان "بەدەم گریانەوە": بەڵێ؛ زۆر ئازاریان داوم فریام نەکەون دەفەوتێم؟

فریاد: مافیاکانی بیلدەربێرگن؟

ماکوان: خۆیانن!

دیاربوو ئەو بە مرۆڤ تێگەیشتبوو.

فریاد: ئێستا لە کوێیت؟

ماکوان: لە دارستانێکم دوورم لە شار.

فریاد: لۆکەیشنەکەت بکەرەوە دایمەخە لەهەر جێگایەك بیت ئەتدۆزمەوە و دێمە لات.

ئەوەی ئەو وتی کردم، بەڵام لە ئەنجامدا ویرسان و پەروانە هاتنە لام و پرسیان کێ بوو قسەت لەگەڵ کرد؟

ماکوان: فریادی هاوڕێمە بە شوێن مندا دەگەڕێت.

ویرسان: ناوی دایکی فریاد چییە؟

ماکوان: "یەکسەر بیرم کەوتەوە کە سیحری لێدەکەن!" نازانم دایکی ناوی چییە، دەشمزانی، بەڵام پێم نەوتن. پەروانە ڕووەو من هات هەر چۆن بوو تەلەفۆنەکەم خستەوە گیرفانم وتم نەوەك لێم بدەن با ئەوان بمدۆزنەوە، دووبارە هاتەوە لام و چووە ناو لاشەم و ئەوەندەیان پیا کێشام خوێن بەچاو بە لوت و دەمدا دەهات.

لەناو ئەو قوڕو خاکەدا خستمیان، وەکو مار پێچم دەخوارد ئەوەندە ئازاریان دام تا ناچاریان کردم هەڵبسمەوە و بەو هەموو قوڕەوە ڕووەو ئۆتۆمبێلەکەم ڕۆیشتم، ویرسان دەیوت لێخوڕە لەم ناوە نەمێنیت، خوێن فوارەی دەکرد هەموو گیانم قوڕ و چڵپاویە ئۆتۆمبێلم لێخوڕی خوای گەورە کردی ئۆتۆمبێلەکەم چەقی و نەدەڕۆشت. پەروانە هاتە دەرەوە وتی وەرە دەرەوە لە ئۆتۆمبێلەکەت با بڕۆین، دەستم لەناو دەستیدا بوو بەناو قوڕدا دەیان بردم.

هیچ چارەیەکم نەمابوو ئەوەندە سەرمام بوو خوێن بە دەمو چاومەوە کڵۆ کڵۆ بوو بوو تا هێزم تێدا نەماو کەوتم لەناو ئەو دارستانەدا.

کەچاوم کردەوە لە ناو نەخۆشخانەیەك بووم زیاتر لە ٤ دکتۆر بەسەرمەوە بوو چەند پەرەستارێك خوێنەکانیان دەسڕی بە سینە و دەم و چاومەوە جلی نوێیان بۆ هێنابووم منیان دەگۆڕی لە دەوری پزیشکەکان فریاد و کاکە بازم بینی دەستم بۆ درێژ کردن خێرا هاتن بۆ لام و دەستم خستە ناو دەستی فریاد و کاکە باز.
فریاد: چی ڕوویداوە کێ وای لێکردوویت پۆلیسیشم ئاگادار کردۆتەوە چەند جار هاتوون قسەت لەگەڵ بکەن، بەڵام بیهۆش بوویت.
کاکە باز کە پێی دەوتم کاکە سور، لە گەڕەك ماوەیەك هاوڕێ بووین و کوڕێکی ئازابوو ناوی سوارە بوو لە خۆشەویستیا پێمان دەوت کاکە باز.
کاکە سور چییە ؟ من بزانم تۆ کێوی کەس ناتوانێت تۆ بڕوخێنێت.
دەستم کردەوە بەگریان هەرگیز خۆمم وا زەلیل نەدیبوو، بەڵام هەستم دەکرد ئەو زەلیلی کردووم خەڵك نییە هیچ کەس نییە بەڵکو ئەوە خۆمم بەدەستی خۆم خۆمم زەلیل کردوە خۆم توشی تاوان کردووە.
بۆیە کاکە باز بۆ گریانەکەی من دەستی کرد بە گریان و وتی ئەگەر پیاو بم ناهێڵم حەقی پڕوا فریاد بۆی باس کردووم هوتێلەکەشیان دەسوتینم.
پزیشکەکان جێیان هێشتم ویستم قسە بۆ فریاد و کاکە باز بکەم، بەڵام پەروانە هات و منیش وتم ئەو دەڵە قۆڕەیە ئاوای لە من کردووە، هاتەوە ناو لاشەم دەیکێشا بەسەرمدا ئاگام لێبوو سەرم لەسەر باوەشی کاکە باز بوو خوێن کڵۆ کڵۆ ئەهاتە دەرەوە لە دەمم و لە چاوم. فریاد خۆی پزیشك بوو حەپەسابوو بەدیارمەوە نەیدەزانی چی بکات ناچار بە چەرچەفی نەخۆشخانەکە خوێنەکەی بۆ دەسڕیم و هاواری دەکرد وەرن بەلایەوە.

## ساحیرو شێخ و ڕوقیەی شەرعی

پەروانە هاتەوە ناو لاشەم و ئازاری دام سەرم لەسەر ڕانی کاکە باز بوو، دیسانەوە ئازارێکی زۆری دامەوە دووبارە خوێن بە چاو و لوت و دەممدا دەهات، وەکو ئەوەی بە چەکوش بکێشێت بە سەرمدا. زۆر ئازارم هەبوو هاوارم کرد خوای پەروەردگار ئەگەر تاوانیشم کردبێت من هەر تەرەفی زاتی

تۆم، فریام کەوە لەکەس داواناکەم تۆ نەبێت، ئازارەکەم نەما و هاتمەوە سەرخۆم.
تەیەمومم کردوو دەستم کرد بە نوێژ دوو ڕکعات نوێژی تەوبەم کرد هەر بە پاڵکەوتنەوە پرسیم کاتژمێر چەندە؟
فریاد: ٤ی بەیانییە.
تەیەمومێکی ترم کردوو دەستم کرد بە نوێژی عیشا، چونکە نوێژی بەیانی مابووی دوای نوێژەکە لاشەم سوك بوو، داوام کرد دەمەوێت خۆم بشۆم، هەر لە نەخۆشخانەکە دوش و حەمامیان نیشاندام، خۆم شۆرد و بەدەم زیکرەوە هاتمەوە بۆ ژوورەکە و بە جەماعەتم وت دەردی من لەم نەخۆشخانە چارەسەر ناکرێت.
کاکە باز: کاکە بەس پێم بڵێ چی بووە، ئەوەی پەنجەت بۆ ببات وەکو سەگ ئەیتۆپێنم بەس بڵێ بزانم چی بووە.
ماکوان: ئەوەی ڕوویداوە لە ڕێگادا بۆتان باس دەکەم، با بڕۆین.
بڕیارماندا و هاتینە دەرەوە جەماعەت وتیان دەچین بۆ هۆڵەندا و دواتر بگەڕێوە بۆ ئەڵەمانیا، منیش ڕازی بووم. کاکە باز ئۆتۆمبێلەکەمی لێدەخوڕی، لەتاواندا نەموێرا بچمە ناو ئۆتۆمبێلەکەی خۆم، بۆیە خۆم لەگەڵ فریاد سەرکەوتم.
تا نوێژی بەیانی ماینەوە هەرچەندە ئەوانیش ماندووبوون، دوای نوێژی بەیانی کەوتینە ڕێ بەرەو هۆڵەندا و شاری ئاڕنێم.
نزیکەی کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ بوو گەیشتینە ئاڕنێم و ئەوان ماندووبوون خەویان لێکەوت لەماڵی فریاد، تا ئەوان هەڵسان خواردنم بۆ دروست کردن هەمووومان زگوردی بووین، فریاد و خێزانی لەیەك جیاببوونەوە و کاکە بازیش ژنی نەهێنابوو.
تەماشای سەلاجە و بەفرگرەکەم کرد هیچی تێدا نەبوو چوومە بازاڕ گۆشت و باینجانم کڕی و هاتمەوە برنج و تەپسیەکی جوانم دروست کرد و نوێژی نیوەڕۆ عەسرم بە قەسر و جەمع کرد تا کاتی نوێژی مەغریب ئەوانیشم هەڵساند، یەکجار برسیم بوو بەیەکەوە تێرو پڕ نانمان خوارد.
داوام کرد لە فریاد کەس دەناسێت لەم شارە ڕوقیەی شەرعی بخوێنێت و بزانێت؟
فریاد: من نازانم ئەو شتە چییە، بەڵام مەلایەکی مەغریبی دەناسم، ئەو کوڕەی ڕەفیقم وتی: جنۆکە و شتی وا دەردەهێنێت. ئیتر زۆر گوێم پێنەداوە ئەگەر دەڵێیت تەلەفونێکی بۆ دەکەم، بەڵام من عەرەبی نازانم مەگەر خۆت پێی بڵێیت.
ماکوان: زۆر باشە ئەوە چارەی دەردی من دەکات قسە لەگەڵ هاوڕێکەت بکە و با ژمارەکەیمان بداتێ.
فریاد قسەی لەگەڵ کردوو من و کاکە بازیش سەرقاڵی قسە و باسی خۆمان و یادگاری و چیم بەسەرهاتووە بۆم گێڕایەوە، باسی ئاڵتون و ڕافیم بۆ کرد کە دزیویەتی و دۆزراوەتەوە ئیتر ئاگام لێیان نەماوە. لەباسی ئەم

قسانەدا بووم فریاد هات: ئەوە ژمارەکەیە قسە لەگەڵ شێخ خالید بکە چاوەڕێی تۆیە.
تەلەفۆنم بۆ کرد و بەیەکەوە قسەمان کرد حاڵەتەکەی خۆمم بۆ باس کرد، وتم: بەڵکو ڕوقیەی شەرعیم بەسەردا بخوێنی جنم تێدایە.
شێخ خالید: وەرن بۆ لای من لەماڵی خۆمان دەری دەکەین.
ڕازی بووم وە چووین بۆ ماڵی شیخ خالید، هەر چوومە ژوورەوە کۆمەڵێك ئافرەتی مەغرییبیم بینی هیچیان حیجاب نەبوون. پێکەنین و قسەی خۆش و گوێم لە گۆرانی کاظم ساهر بوو، بە فریادم وت: دڵنیای ئەمە شێخە؟ یان کۆنسێرت و شەوانی لیالی هەیە؟
فریاد "بە پێکەنینەوە": بەخوا دەڵێن زۆر موبارەکە، هەر جنۆکە ئەسوتێنێت.
ماکوان: یاخوا وابێت، پێویستم بە کەسێکی خواناس و دەم و نفوس پاکە، ئەمە بەماڵەکەیدا دیارە سەماکەری تێدایە.
چووینە ژوورەوە بۆ لای شێخ خالید ڕووی کردە کاکە باز لە خۆیەوە ووتی: تۆ جنەکە عاشقت بووە و سیحری ڕەشت لێکراوە.
خوای گەورە ڕەحمی پێکردین کە کاکە باز تێنەگەیشت دەنا یەکسەر یەك جڕطی موحتەرەمی بۆ لێ ئەیا.
کاکە باز: ئەوە دەڵێ چی کاکە سور؟
ماکوان : لێی تێکچووە دەڵێت جنەکە لە تۆدایە.
کاکە باز "بە پێکەنینەوە": کاکە سور بڵێی تەحویلی من کرابێت؟
ماکوان: هەرچی تەماشای ئەمە دەکەم ساختەچییە.
فریاد: بزانین چی دەکات، پەلە مەکە با پێش ڕووداو نەکەوین.
ماکوان: جەنابی شێخ من ناوم ماکوانە پێویستم بە ڕوقیەی شەرعییە، ماوەی چەند ڕۆژێکە هەست دەکەم جنۆکەیەك هاتۆتە لاشەم، بەڵکو بتوانیت بۆم دەرکەیت بە ڕوقیەی شەرعی، زۆر ئازارم ئەدات.
شێخ خالید: تۆ جنۆکەت تێدانیە، دەستی ڕاکێشا بۆ کاکە باز لەناو لاشەی ئەودا هەیە. دووبارەی کردەوە لێم و وتی من دڵنیام تۆ جنت تێدانییە.
ڕووم کردە کاکە باز پێم وت وادەڵێت.
کاکە باز: پێی بڵێ بێ جای کرد، وەڵڵا من عەیبم نییە.
فریاد: گەڕەکی خۆمان نییە، لێرەش مەیکەن بەشەڕ.
ماکوان: فریاد باپڕۆین هیچ نییە.
فریاد: کەیفی خۆتانە باپڕۆین.
ماکوان: شێخ خالید ئەمانەی لەگەڵمدان هیچیان نییە، من جنم تێدایە کاکە بۆ کۆتا جار پێت دەڵێم ئەگەر ئەتوانیت ڕوقیەکی شەرعی بخوێنە و تەواو دەڕۆین، چونکە من حاڵم خراپە.
شێخ خالید زانی و دڵنیابوویەوە لەوەی کە دەڕۆین و من کێشم هەیە، پرسی ناوی دایکت چییە؟
ماکوان: یەکسەر زانیم ساحیرە، وتم ناوی گوڵچینە کە لەڕاستیشدا وانیە.

شێخ خالید: باشە دانیشە بڵنگۆیەکی هێناو مایکێکی پێوە بوو وەکو ئەوەی کۆنسێرت بکات و داوای ١٠٠ ئێورۆی کرد.
ڕووم کردە کاکە باز و وتم ئەمە زۆر ساختەچییە، ئەڵێی چی بۆ خۆشی تۆزێکی لێبدەین؟
کاکە باز: وەڵڵا دەمێکەیە بەیەکەوە شەڕمان نەکردووە، با بەیادی جاران لێی دەین.
فریاد: بیکەن لەڕای خوا، بەیادی جاران خەڵك گوێ لە گۆرانی دەگرێت، یادگاری دەگێڕێتەوە نەك شەڕ بکات. من ١٠٠ ئێورۆکە ئەدەم و تۆزێکی پێ ڕادەبوێرین و دەڕۆین، ئیتر هیچ مەکەن. خەسرەو تۆ ئاقڵی بۆ پەمپی سوارە ئەدەیت.
هەردووکمان پێدەکەنین و لەبەر فریاد هیچمان نەووت.
 شێخ خالید دەستی کردبە چەند قسەیەك و ووتی: کەهلان ابن سەحلان، هەندێك ناوی تری وت.
کاکە باز: کاکە سور، ئەوە باسی طایەی میشلان دەکات؟
ماکوان "دامە قاقای پێکەنین": یەشتا پێکەنینەکەم تەواو نەکردبوو کە هەرچی جنی شەوی ڕابردوو بوو هاتنە ئەو ژوورەوە، لە پێشیانەوە ویرسان دەڕۆشت بەکۆمەڵ هاتن و هەروەکو جاران پەروانەیان لەگەڵ بوو، ڕووەو من هاتو دەستی گرتم، بینیم شێخ خالید سوجدەی بۆ دەبردن، تەماشای فریاد و کاکە بازم کرد تەماشای ئەویان دەکرد کە سوجدەی دەبرد ئەوان وایان دەزانی سوجدە بۆ خوا دەبات، بەس من دەمبینی کە سوجدە بۆ ویرسان و هەموو جنەکانی دیکە دەبات وە گوێم لێبو دەستی بۆ ئەوان ڕادەکێشا و دەیووت: " الله نور السموات والارض" هاواری دەکرد "وقالوا لجلودهم لم شهدتم علينا قالوا انطقنا الله".
پەروانە دەستی منی گرتبوو، ویرسان چووە سەر کورسیەکەی شێخ خالید دانیشت ئەویش ڕووی وەرگێڕا سوجدەی بردەوە بۆ ویرسان، منیش دەستم لە ناو دەستی پەروانەدا بوو ئەعور چووە پشتی سەری ویرسان وەستاو هەرچی دەمویست دەستم دەربهێنم لەدەستی پەروانە نەمدەتوانی وەکو گیرە قوفڵی کردبووم.
ویرسان: ماکوان داوات کردین؟
ماکوان: من داوای ئێوەم نەکردووە.
ویرسان: باش دەزانی بەطلسم گرتومیت و هیچ مەجالێکت نییە، نەحەزقیل دەتوانێت بێتە لات نە برقان وە نە سەسیل. ئەوانیش وەکو تۆ لە بن دەستی مندان و کۆتاییان هات، تۆ ئەگەر ئەتەوێت ئازاد بیت و لە شەڕی پەروانە ڕزگارت بێت وەکو ئەو خەڵکە ڕابوێرە بۆ خۆت بە خۆشی و شادی و پارە و سەروەت و سامانی خۆت کۆبکەرەوە. چۆن بەرگەی ئەو هەموو ئازارو ناڕەحەتیە دەگریت بەزەییم پیاتا دێتەوە پڕوا بکە.
ماکوان: مردن لەلام شاییە لە تەرەفی خوا دەرچم و بێمە تەرەفی ئێوە.

ویرسان: تۆ خۆشت بێت و ناخۆشت بێت تەرەفی منیت، ئەوەی تۆ بە پیاو چاکی دەزانیت ئەبینیت چۆن زەلیلە و سوجدەمان بۆ دەبات.
ماکوان: ئەو سوجدەی بردووە ڕاستە، بەڵام دەبینی من چۆن وەستاوم بە گەردن بەرزی، ئەو سەرە تەنها بۆ خوا نەوی دەکەم، مەگەر لێی کەیتەوە لە لاشەم تۆیەکی خوێری ئەوەت پێ ناکرێت. هەتا توانیم یەك شەقم هەڵدا لەسەری خالید مەغریبی و هاوارم کرد ارفع راسك، اسجود الله، هەر وام وت دیسان پەروانە چووە ناو لاشەم وەکو سەلیپەی کڵاشنکۆف بە پیك دەیکێشا بەسەرمدا. منیش تەحەمولم کرد خوێن بە چاو و لوت و دەممدا دەهات و هێڵنجم ئەدا هەر سەرم دانەنەواند، ئاگام لێبوو فریاد باوەشی پیا کردبووم لەوکاتەی کە شەقەکانم هەڵدا، بەڵام خالید مەغریبی دەیوت وازی لێبهێنن ئاساییە. ئەو دەیزانی چی لە من دەکرێت.
بێهۆش کەوتم سەرم خستە سەر شانی فریاد و وتم با ڕووەو ویرسان نەکەوم لەوکاتەدا ڕووداوەکەی ئەبوبەکری باقەلانیم هاتەوە یاد کەچووبوو بۆ لای قەیسەری ڕوس بە پشتە چووە ژورەوە بەسەربەرزی ڕوویکردە قەیسەری ڕوس، لەکاتێکدا بە فێڵ دەرگایەکی بچووکیان بۆ دروستکردن کە هاتە ژوورەوە سەر نەوی بکات ئەویش بە پشتا هات، هەر نەمدەویست سەر نەوی بکەم مردنم پێ خۆشتربوو لەوەی سەر بۆ ویرسان نەوی بکەم.
بێئاگا کەوتم بە سەرشانی فریادا، کە هۆشم هاتەوە لە ماڵی فریاد بووم.
کە بە ئاگا هاتم فریاد بەسەر سەرمەوە بوو لەگەڵ کاکە باز، وتم چی ڕوویداوە ئەوەی ئێوە بینیتان بۆم باس بکەن.
کاکە باز: کاکە کەلەی ئەو پیاوە فەقیرەت تەقاند، خۆ ئەو دوعای بۆ دەکردی بۆ وات لێکرد بەزەییم پیا دەهاتەوە، دوای ئەوەش کە تێت هەڵدا ئەو هەر دەیووت ئاساییە و قەیناکە نەخۆشە.
دەرمانیشی داینێ تۆ لەگەڵ جنۆکەکان قسەت دەکرد.
ماکوان: دەموت چی لەوکاتەدا؟
فریاد: باسی ئەوەت دەکرد کە بێجگە لە خوا سوجدە بۆ کەس نابەم، هەروەها دەتوت من تەرەفی خوام من تەرەفی خوام.
ماکوان: لاحول ولاقوة الا باللّه، چۆن گیرم خواردووە، دەرمانەکە چیبوو بۆی نوسیم؟
فریاد: هەنگوین و زەیتی زەیتون، ئەم دوعایەشی بۆ نوسیت.
دوعاکەم لێوەرگرت و کردمەوە طلسمی سیحربوو، خێرا خستمە ناو ئاو تا ڕەنگەکەی تێك چوو وەرەقەکە لەناو ئاوەکەدا توایەوە، چونکە شێخ برقان فێری کردبووم کە طلیسمی سیحر نەسوتێنن، سوتاندن زیاتر سیحرەکە بەهێزدەکات. جن و ساحیرەکان لە جنسی شەیتانن و شەیتانیش لە ئاگرە، ئەوەی سیحر بەتاڵ دەکاتەوە ئاوی سازگارە یاخود ئاوی زمزم.
زەیتونەکەم ڕشت لەگەڵ هەنگوینەکە.
فریاد: هەنگوینەکە بەیانی دەمانخوارد بۆ فڕێی ئەدەیت.

ماکوان: ئەوە سیحرە براکەم، چەندی لێسەندی پێم بڵێ؟
فریاد: وەڵڵا ١٠٠ ئیورۆ بۆ خوێندنی دوعاکە و ١٥٠ ئێورۆش بۆ دوعا و دەرمانەکان کە فڕێت دا.
ماکوان: ئەگەر من پیاو بم لێی دەسێنمەوە.
کامتان دەزانن قورئان بخوێنن؟
فریاد دکتۆربوو نەیدەزانی بخوێنێتەوە، کاکە باز تا سێی ناوەندی خوێندبوو ئەویش نەیدەتوانی.
ماکوان: فریاد کەسێك ناناسیت قورئان خوێن بێت؟
فریاد: خەڵك دەناسم، بەڵام دوایی شەقێك هەڵنەدەی لە کەلەی.
ماکوان: نا بێخەم بە.
فریاد تەلەفونی کرد بۆ کوڕێکی فەڵەستینی و هات بۆ لامان کوڕێکی دیندار و قورئان خوێنێکی باش و دەنگیشی خۆش بوو، ناوی یاسر بوو.
ماکوان: یاسر روقیە دەزانیت؟
یاسر: دەزانم بەڵام بۆ خۆمم خوێندووە و ئەزمونم نییە.
فێرم کرد چی بخوێنێتەوە، تا ئەو کاتەی چاك دەبم وازم لێنەهێنێت ئەگەر ١٢ سەعاتیشم پێچووە، یاسرم فێر کرد لەدەرەوەی حەمامەکە بیخوێنت بەسەرمدا، ئەگەر حاڵم تێك چوو بمخەنە بەر دوشی ئاوەکە و ئاوێکی سارد بەسەر و گیانمدا بکەن ئەگەر خوێنم لێهات، بەڵام با جلم لەبەردابێت جلەکانم دامەکەنن.
وتم جارێ خۆم دەست دەکەم بەخوێندن، دەست نوێژم گرت و دەستم کرد بە زیکر کردن و قورئان خوێندن سەرەتای سورەتی بەقەرەم دەست پێکرد بەپەلە پەروانە دەرکەوت و نەیهێشت پێنج ئایەت بخوێنم کێشای بەسەرمدا، ئەوەی پێم وتبوون کردیان. بردمیانە بەر ئاوەکە و یاسریش بەدەنگێکی خۆش دەستی پێکرد، دەیویست بکێشێت بەسەرمدا لەگەڵ خوێندنی قورئانەکە و خوڕەی ئاوە ساردەکە بەسەرمەوە وورده وورده وورده هێزی پەروانە کەمتر دەبوو، لەخۆشیدا پێدەکەنیم یاسر وایزانی چاك بووم، ویستی بوەستێت خوای گەورە هێزی پێبەخشیم و پێم ووت: "تا سێ جار هەموو ئایەتەکان تەواو بکە و بیخوێنەرەوە بەسەرمدا".
وورده وورده باش بووم لە دوورەو ڕاقی، حەنانە، برقان، حەزقیل، سەسیل و ڕازی و هەموو جنە نوێ و کۆنەکانی ڕەفیقم وەکو لەدوورەوە بێن بۆ لام چاوەڕێیان دەکردم و پێدەکەنین دەستیان بەرزکردبووەوە بۆ ئاسمان و دوعایان بۆ دەکردم. منیش صڵاواتم ئەدا لەدڵی خۆمدا هەر ١٠ صلاواتم ئەداو دوای ئەوەش ١٠ جاریش دەموت: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير"، بەردەوام بووم دەمتوانی بەدەنگی بەرز بیکەم، لەگەڵ ئەوەی دەمزانی حەمامە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە کە لە حەمامدا زیکر بکرێت، بەڵامماڵەکانی ئەوروپا بچوکن و ناچاریش بووم، بەڵام

سوپاس بۆ خوا ئەنجامێکی زۆر باشی هەبوو زۆر زوو چارەسەر بووم کە ماوەکەی نەچووە نیو کاتژمێر.
خاولیان بۆ هێنام باوەشم کرد بە یاسردا لە پشتی یاسرەوە شێخ بەرقان و حەزقیل سەلامێکیان بۆ کردم و ڕۆشتن.
زۆر سوپاسم کردن و وتم دڵنیابن سوپاس بۆ خودا من تەواو باش بووم، بە پشتیوانی خودا ناهێڵم جارێکیتر توشی ئەو حاڵەتە ببمەوە، چونکە دەزانم لەچیەوە توش بووم. نوێژی عیشامان کردوو و چوینە دەرەوە بۆ پیتزا خواردن ئەو شەوە زۆر ئاسودە بووم هاتمەوە بۆ ماڵی فریاد خەریکی قورئان خوێندن بووم تا دەوری یەکی شەو، ئەوان خەوتن من هەر قورئانم دەخوێند دوای ئەوە دوو ڕکعات شەو نوێژمکرد خەوتم بۆ نوێژی بەیانی هەڵسامەوە نوێژم کردوو دەستم کردەوە بە قورئان خوێندن هەستم کرد زۆر ئاساییم بۆیە کەمێك خەوتمەوە.
هەڵسامەوە تەلەفۆنم کرد بۆ سەیدا حوسێن وتم لە ئاڕنێمم و وەرە بۆئێرە و بچین بۆ لای ڕافی.
لای ئێوارە بوو بە کاکە بازم وت باپڕۆین بۆلای خالید مەغربی ساحیر، چووینە ژوورەوە بۆ لای ئەو ساختەچییە، ئافرەتێکی لابوو کە چوومە ژوورەوە زیکرەکانم خوێند هەر منی بینی ڕەنگی گۆڕا و وتی باش بوویت؟ وتم زۆر باشم ئەو ٢٥٠ ئێورۆیەم بدەرەوە دەنا ئێستا هەرچی لەماڵەکەتدایە دەیشکێنین، بەخوا من قسەکەم تەواو نەکرد کاکە باز شەقێکی تێهەڵدا.
ئافرەتەکە بەرگری لێدەکرد پەلاماری کاکە بازیان دا منیش چوومە لای و ووتم: خۆشت و ئێمەش لە شەڕ لابە پارەی خۆمان بدەرەوە دەڕۆین. ویستی نەیداتەوە کەلەیەکم لێدا لەگەڵ زەویەکەدا تەختم کرد، ویستی هەڵسێتەوە دارێکی لابوو لەخەڵی ئەدا بۆ ئەوەی جنۆکە دەربهێنێت بەو دارە، زوو دەستم دایە دارەکەی و چوار دانەم بەدڵی خۆم پیا کێشا، داخۆ چەندی کێشایێت بە خەڵکدا بەو دارە. بەخوا کاکە باز سەرقاڵ بوو بەشەڕی ژنەوە منیش بەرەو لای کورسیەکەی چووم، زانیم ئەیخاتە ژێر کورسیەکەی چونکە ئیشی ئەو ساختەچیانە وایە دەستم کرد بەژێر کورسیەکەیدا، پڕبوو لە ئێورۆ لەوانەیە ئیشی یەك مانگی بوویێت بەئارەزووی دڵی خۆم دەرمهێنا و خستمە گیرفانم دانەیەکی تریشم پیاکێشا.
ماکوان: کاکە باز ئەوە بۆ پاڵێکی پێوە نانێیت؟
کاکە باز: کوڕە شەڕەکەی خۆشە، من بەلامەوە ئاساییە.
تومەز خۆی هەڵواسیووە بە کاکە بازدا ئەویش زوو زوو دەڵێت شەڕ ئاوابێت حەزدەکەم هەمیشە لەشەڕدا بم.
پاڵێکم نا بە ئافرەتەکەوە و پێم ووت: پڕۆ.
هەندێك پارەی تریشم هێنا، گەڕاینەوە چاوەڕێی حوسێن بووم بێت و بچین بەشوێن ئاڵتونەکاندا بگەڕێم.

## باس کردنی ڕوقیەی شەرعی و مەرجەکانی

لەگەڵ کاکە باز گەڕاینەوە لەشەڕکردن لە ڕێگا کەوتینە قسە و پرسیم: ئەوە کەی تۆ ئەوەندە دەسەپاچە بوویت؟
کاکە باز: دەسەپاچە نەبووم تا بەیانی لێی بدابام هیچم نەدەوت ئافرەت بوو.
ماکوان: لەبەر ئەوەی ئافرەت بوو؟
کاکە باز: هەر خۆشە ئافرەت لێت بدات.
ماکوان "بە پێکەنینەوە": ئەی قوڕ بەو سەرەت، وامزانی گۆڕاوی هەر دەڵێی جارانی کە دەچووین بۆ بەردەم قوتابخانەی کچان، بیرتە لە کچ ئەپاڕایتەوە بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ ببەستیت یادگاریەکی خۆشت بیر بخەمەوە کاکە باز، بەڵام بەڵێنبە تورە نەبیت.
کاکە باز: وەڵڵا کاکە سور هەرگیز لە تۆ تورە نابم، بەڵام توخوا تورەم مەکە.
ماکوان "لێی دوورکەوتمەوە": بیرتە ماکسی دایکت بە تەنافەکەی خۆتانەوە لێکردەوە بردت بۆ کچەکەی قوتابخانەی هاواری کچان؟
هەروام وت شێت بوو.

کاکە باز "بە توڕەییەوە": ئەی بیرتە لەبەردەم قوتابخانەی کچان هاوارت دەکرد عەمبەر بەرید عەرەبانەکەت بە سور وەرگرتبوو؟ باپیرت هات لەبەرچاوی کچەکان سەری کردی بە عەمبەر بەریدەکەدا و دواتر کەچەڵیان کردی پێمان دەوتیت خەسە کەچەڵ.
ماکوان: باشە بەخوا هەر بۆ خۆشی بوو توڕە مەبە، قسەی خۆش دەکەین یادگاری دەگێڕینەوە.
کاکە باز: یادگاریت بیرنەکەوتەوە ماکسیەکەی دایکم نەبێت، بەوە تێکدەچم باسی ئەوە مەکە ئەی بۆ باسی ئەو هەموو یادگاریە خۆشەی تر ناکەیت شەوانی تووی مەلیك و گۆرانی وتن و قسەی خۆش و شەڕە بەردی گەڕەك باس ناکەیت، لایبە باسی ئەوە مەکە.
ماکوان: ڕۆ ئەو پارەیەی لە خالیدە خوێریم برد بیدەین بە دەسڕی تەوالێت بۆ مزگەوت.
بەیەکەوە چووین بۆ مزگەوتێکی تورکەکان لە نزیك بازاڕدا بوو ٨٠٠ ئیورۆم لە خالید مەغریبی بردبوو دامە مزگەوت وە پێشم وتن ئەو پارەیە حەڵاڵ نییە و پارەی خالیدە نابێت بۆ مزگەوت بەکار بێت، مەگەر بۆ چاکردنی زێراب و بۆری و کەرەستەی پاکوخاوێنی تەوالێتەکان...هتد.
کاکە باز: ئەوە زۆر موهیم بوو بەلامەوە کاکە سور نابێت پارەی حەرام بە کاربێت بۆ شتی چاك و پاك؟
ماکوان: خۆی لە ڕاستیدا پارەکە هەر خزمەتە بۆ مزگەوتەکە، بەڵام ناکرێت لە ناو مزگەوتەکەدا بەکار بێت وەکو فەرش و کەرەستەکانی تری ناو مزگەوت، چونکە حەرامە و دەبێت بە ئاشکرا بڵێیت کە حەرامە بەتایبەت لەم وڵاتانە. ئەو پارە زیادەیەی کە دێتە سەر حسابی بانقیەکانمان دەڵێین بیدەن بە هۆکاری چاکردن و کارێك کە بە پیسییەوە پرواتِ مەرجەکەی ئەوەیە کە بزانرێت حەرامە، وەکو خێر کردن حساب ناکرێت بەڵکو نەجات بوونتە لە حەرامەکە، بەڵام ناکرێت ڕقت لە کەسێك بێت و ڕۆی زەرەر لەو بدەیت و پارەکەی بخەیتە مزگەوت. ئەمەی کردمان لەگەڵ خالید وەکو عوقوبەیەك بوو دەنا ئێمە کارمان نییە بەسەریەوە ئەوە کاری ئێمە نییە.
کاکە باز: ئەی ئەوەی ئەو کارە دەکات لە شەرعی ئیسلامدا جێگای دەبێتەوە؟
ماکوان: نەخێر، شوێنی نییە لە شەرعی ئیسلامدا، دەبێت بانگ بکرێت و تەوبەی پێبکرێت و دوای تەوبەکەشی بکوژرێت. کۆمەڵێك دەڵێن لە گۆرستانی موسوڵمانان نانێژرێت، کۆمەڵێکی تر دەڵێن دەنێژرێت لەبەر ئەوەی تەوبەی کردووە.
کاکە باز: بەڕاستی ترسناکە.
ماکوان: بەڵێ؛ بەدڵنیاییەوە ترسناکە، ڕۆ با بچین نانێك بخۆین تەلەفۆن بۆ فریاد بکەین بێت بۆ لامان.

کاکە باز تەلەفۆنی کرد بۆ فریاد و بە قەرەوەیسیانە قسەی لەگەڵ دەکرد، خەڵکی ناوچەی بازگربوو قەرەوەیسی بوو فریادیش تێنەدەگەیشت.
لەگەڵ فریاد و کاکە باز نانمان خواردوو لە کاتی نانخواردندا بووین فریاد پرسیاری کرد: ئێ ماکوان، کاکە ئێمەش فێری ڕوقیەی شەرعی بکە شتێکی نەخوازراو ڕوودات با منیش بیکەم، زۆر نەخۆش هەیە دێتە لامان وەڵاهی سور دەزانم هیچی نییە بەڵام توشی ئەو حاڵەتانە دەبن کە تۆ توشی بوویت، تۆ دەزانیت لە زانستدا شتی وا باس ناکرێت خۆت دەزانی زانست چەسپاوە.
ماکوان: ڕاستە زانست چەسپاوە، لەخزمەتدام ئەوەندە زەحمەت نییە، بەڵام ڕوقیەی شەرعی چەندە خوێندنەکەی گرنگە ئەوەندە ئەوەی دەیخوێنێت گرنگە.
فریاد: زەحمەتە؟
ماکوان: نەخێر؛ زەحمەت نییە زۆر ئاسانە، بەڵکو سیفاتی مرۆڤی ڕوقیە خوێن زۆر جیاوازە لەگەڵ کەسی ئاسایی، هەرچەندە هەموو کەس دەتوانێت بیخوێنێت. ئەو کەسەی دەیخوێنێت کۆمەڵێك سیفەت هەیە دەبێت لەخۆیدا هەبێت ئینجا سەرەکەتوو دەبێت.
فریاد: وەکو چی؟
ماکوان: ئەو کەسەی کە جن دەردەکات یاخود سیحر و جاد و بەتاڵ دەکاتەوە دەبێت ئەم خاڵانەی تیا بێت:
- دەست بە دەستنوێژ و جلو بەرگ خاوێن و بۆن خۆش بێت.
- ڕووە و قیبلە بوەستێت ئەگەر زانی ڕووگە لەکوێیە.
- دەبێت خۆی لە ئایەتەکان و مانای زیکرو فەرموودەکان تێبگات و بەجوانی بیانخوێنێت.
- ئیخلاس و تەمەنای لە خوای گەورە بێت کە کارەکە ئەنجام ئەدات و بزانێت شیفا لای پەروەردگارە.
- دەبێت لەکاتی خوێندی ڕوقیەکاندا بزانێت لە کوێدا فوو دەکەیت بە دەست یاخود فوو دەکەیت بەو کەسەی جنۆکەی تێدایە، بۆ کەسی نزیکی خۆت منداڵ یاخود خێزانت دەتوانیت لە لیکی خۆت کە قورئانی پێدەخوێنیت و کۆدەبێتەوە بدەی لێیان، دەبێت دەست بەدەمی خۆتدا بهێنیت و لێوی ئەوانی پێ تەڕ بکەیت، ئەویش تەنها بۆ کەسە نزیکەکانی خۆت.
- ئەوکەسەی ڕوقیە دەخوێنێت دەتوانێت لەکاتی خوێندیدا دەست بخاتە ئەو جێگایەی کە ئازاری هەیە یاخود پێشەسەری مرۆڤ، ئەگەر نامەحرەم بوو پێویست ناکات، یاخود بەسەر سەرپۆشەوە بیکات.
- چەند جار دووبارەکردنەوەی ئایەت و دوعاو نزاکان لە کاتی چارەسەردا.
- گرنگە نیەت و بۆ چونت بۆ شیفا بێت لە ڕوقیە کە دەیخوێنیت، بیر لە پارەو ناوبانگ نەکەیتەوە.

- گرنگە ئەو کەسە شارەزابێت و لە بواری دەرکردنی جنۆکە و بەردەوام بێت لەگەڵ نەخۆشەکە تا جنەکە دەردەکات وازی لێنەهێنێت بە هیچ شێوەیەك، هەموو جنێك کە دەچێتە لاشەوە لە ماوەی ١٠ خولەك تا ٢٠ خولەك کۆتایی دێت و دەڕوات، ئەگەر زۆر ماندووکەرو درۆزن بێت کاتژمێرێك دەبات، خۆ ئەگەر دەرنەچوو خەتا لە نەخۆشەکەیە تاوانی کردووە یاخود گرێبەستی لەگەڵ کردوون کە دەبێت بەتاڵ بکرێتەوە، یاخود لە ڕێگەی سیحرەوەیە و جنۆکەکان چەقاوەسوو بوون و ناڕۆن، دەبێت دوو کەس بەردەوام ڕوقیە بخوێنن لەسەرەتا بەتاڵ دەکرێتەوە جاری وا هەیە هەفتەیەکی پێدەچێت دەبێت کاتی بۆ دیاری بکرێت چەندین جار دووبارە بکرێتەوە.

- ئەگەر جنۆکەکە کەوتە قسە دەبێت هەوڵی زۆر بدرێت بۆ موسوڵمان کردنی و هیدایەت دانی، بەڵکو خوای گەورە هیدات وەربگرێت لەسەر دەستی ئەو کەسەی ڕوقیە دەکات.

- ئەوکەسەی ڕوقیە دەخوێنێت دەبێت بزانێت ئەو کەسە چەند پێویستی بە ڕوقیەیە بە کورتی یاخود ڕوقیەی درێژ، چونکە زۆر جار ئەوەی ڕوقیە دەخوێنێت دەنگی زۆر ناخۆشە و نەخۆشەکە بێزار دەکات، دەبێت زۆر زۆر نەخوێنێت و پشوو بدات تا نەخۆشەکە بە باشی چارەسەر ببێت.

- ئەگەر ئافرەت بوو پێویست ناکات زۆر بە دەنگی بەرز بەسەریدا بخوێنرێت، هەندێك جار پێویست دەکات هەر بە نهێنی بیخوێنێت و هەندێك جاریش بە دەنگی بەرز.

- ئەوکەسەی دەیخوێنێت پێویستە خاوەن وەرع بێت و حەرام خۆر نەبێت.

فریاد: بەخوا ئەمە بە من ناکرێت.

کاکە باز: بۆ فریاد گیان کوڕێکی بەڕێز و خواناسی وەڵڵا تەنها تۆ دەتوانیت، کاکە سوری برام دەمێکەیە مەلایە. تۆ ئەتوانیت ببیت بە مەلاش و دکتۆریش.

فریاد: ئەی ئەتوانیت پارە وەربگرێت بۆ ئەو کارە؟

ماکوان: لە شەرعدا ڕێگری نەکراوە، بەڵام پێویستە ڕەچاوی باری دارایی خەڵکی بکرێت و ئیستغلال نەکرێت، هەروەکو ووتم پێویستە ئەو کەسەی کە ئەو کارە دەکات خاوەن وەرع بێت و لەخوا ترس بێت، کە درۆی کرد بۆ پارە پەیدا کردن بوو هیچ نییە.

زانایانی ئیسلام دەڵێن هەر کەس ئەوکارە بکاتە پیشە، توشی سێ حاڵەت دەبێت:

یەکەم: شرك

دووەم: داوێن پیسی

سێیەم: حەرام خۆری

لەبەر ئەوە زۆر پێویستە ئەو کەسانەی کە ئەو کارە دەکەن زۆر وریا بن.

کاکە باز: ئەی لە کوردستان خۆ شێخ و شتی زۆر ساختەچی هەیە، بەخوا من یەك دوانێك دەناسم نوێژیش ناکەن.

ماکوان: پێ ناچێت ئەوانە هەر موسوڵمانبن، زۆربەیان ساحیرن.

کاکە باز: ئەی ئەوە زانیم حوکمی لەئیسلامدا کوشتنە، ئەی لە یاسای ئێستا هیچی لەگەڵ ناکرێت؟
ماکوان: لە یاسای عێراقی و هەرێمیش سزای لەسەر دادەمەزرێت، بەڵام بەمەرجێك کەسەکە بچێت سکاڵا تۆمار بکات بەناوی پارە خواردن و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی.
فریاد: ئەی ڕوقیە چییە؟ چۆن من جنۆکە دەربکەم ئەگەر بتوانم ئەو مەرجانە لەخۆمدا پەیڕەو بکەم.
ماکوان: ئاسانە
فریاد: فێرم بکە
ماکوان: بەسەرچاو، سەرەتا سورەتی فاتیحە بخوێنە و دوایی ئایەتلکورسی و دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی بەقەرە. سێ جار خوێندنی سورەتی قولەکان واتا "قل هو الله احد ، قل اعوذ برب الفلق ، قل اعوذ برب الناس"، بەڵام سێ جار و فوو بکە بەدەستدا و بیهێنە بەسەر نەخۆشەکەدا، دوای ئەوە هەر ئایەتێك دەخوێنیت بە ئارەزووی دڵی خۆت، بەڵام هەوڵ بدرێت ئەو سورەت و ئایەتانە بخوێنرێت کە باسی دۆزەخی زۆر تێدایە یاخود باسی قیامەت دەکات، چونکە قورئان هەمووی بەرەکەت و کەلامی خوای پەروەدگارە و موبارەکە.
کاکە باز: جا ئەوە چییە، منیش دەیزانم.
فریاد: تەواو هەر ئەوەندەیە؟
ماکوان: بەڵێ هەر ئەوەندەیە، ئەوەی کە لەفەرموودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەری خوا  هاتووە زانایان ئەوەندەیان باس کردووە.
فریاد: ئەی ئەم هەموو شێخ و مەلایە چییە ئێستا دورست بووە، هەمووی جن دەردێنن.
ماکوان: لەڕاستیدا ئەوانە هاوبەشن لەگەڵ جن و شەیتانەکان دەیانخەنە ناو لاشەی ئەو خەڵکە و تەنها پارە پەیدا کردن و هەندێکیشیان کەرکردنی خەڵکە.
فریاد: ئەی چۆن بزانین کەسێك توشی بووە واتا نیشانەکانی چییە؟
کاکە باز: کولیەی طبی خوێندووە دەیەوێت کولیەی جنیش بخوێنێت، کاکە دەبەسە باپڕۆین کۆنکەنێك بکەین تا لەماکوانی نەبەمەوە ناخەوم بەس بۆ ئەوە هاتووم کۆنکەنێك لە ماکوان بەرمەوە.
فریاد: توخوا پەلەمەکە با ئەوەشمان بۆ باس بکات ئیتر دەڕۆین.
ماکوان: نیشانە سەرەتاییەکانی بەم شێوەیە.
- هەستکردن بە خەم و خەفەتی زۆر و سنگ گوشاری و تەسك بوونەوەی سینە لەزۆربەی کاتەکان، هاورێی کردنی خەمباری بەبێ ئەوەی هیچ ڕوویدابێت لە پڕ دەست دەکات بەگریان.

-هیچ ئیشتهایێك و حەزێکی بۆ خواردن نامێنێت و نان ناخوات، هەر خواردنێکی بدەیتێ دەیخوات تامی خواردنی لا گرنگ نییە، نانی وشك و گۆشت وەکو یەکە لای، واتا هەموو تامەکان لەدەست دەدات.
-تەمەڵی و توانای هیچی نامێنێت و تەنانەت ئەوەشی کە لەسەری واجبە بیکات ناتوانێت هەر دەخەوێت و پان دەبێتەوە هیچی بۆ ناکرێت.
- قلّة النّوم، وأحياناً كثرة النوم بشكل غير معتاد، وقد يصحب ذلك أحلاما مزعجة.
خەوی لێناکەوێت، کە خەوی لێکەوت زۆر دەخەوێت، واتا موعتاد و بەردەوام دەبێت لەسەری. هەمیشە خەوی ناخۆش و بێزارکەر دەبینێت.
- هەمیشە ڕاڕایە سەرئێشەی لەگەڵدایە، هەست بەوە دەکات کە هیچی بۆ ناکرێت و کەسێکی لاواز دەردەکەوێت و حەزی بە مردنە.
فریاد: دەی نەخۆشی دەروونیش هەروایە.
ماکوان: نەخۆشی دەروونیش هەر لە شەیتانەوەیە بەدڵنیاییەوە هەر هەمان شتە، بەڵام هەندێك حاڵەت هەیە جیاوازی دەکات.
فریاد: وەکو چی؟
ماکوان: تۆ پزیشکی و دەزانیت، زۆر ئافرەتمان هەیە هەمان حاڵەتی توش دەبێت، بەڵکو خراپتریش دەڵێت تارمایی دەبینم یاخود شت دێتە بەرچاوی، یان مێرد و باوك و کەسوکارەکەی لەبەرچاو ڕەش دەبێت، یاخود ڕاڕاییەکەی ئەوەندە خراپ دەبێت توشی نەخۆشی تری دەکات. ئەمانە هیچی پەیوەندی نییە بە نەخۆشی نەفسی و بە جنۆکە و شەیتان، بەڵکو کەمی ڤیتامین دی و ڤیتامین سی و ئاسن و تێکچوونی هۆرمۆنەکانیەتی.
فریاد: ڕاستە وایە
ماکوان: پیاوانیش هەمان حاڵەتیان توش دەبێت، بە کەمی ڤیتامین دی و ڤیتامین سی.
زۆربەی خەڵکی کوردستان فێرنین لەبەر خۆردا بوەستن ڕاستەوخۆ خۆر لە پێستیان نادات، بەتایبەت ئافرەتان بۆ ئەوەی ڕەش نەبنەوە هەر ناچنە بەر خۆر.
لەکاتێکدا چارەسەری زۆربەی نەخۆشیەکانیانە.
فریاد: زۆر ڕاستە، ئەو ماوەیە لە ئیمارات بووم لە شاری دوبەی زۆربەی خەڵکی ئەو وڵاتە نوقسانی ڤیتامین (D)-یان هەیە، چونکە ناچنە بەرخۆر.
کاکە باز: هەڵسن باپرۆین نوێژەکانمان دەکەین و دەچین یاری دەکەین لەماڵەوە.
چووین بۆ مزگەوت و نوێژی عیشامان کردوو گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە کۆنکەنی هێنا و دەستمان کرد بە کۆنکەن من و کاکە باز، فریادیش دەینوسی و تەماشای دەکردین و منیش زۆر حەزم پێینەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی تورەیکەم وەرەقەم زۆر لێ دەبرد و بە کوردی خۆمان گزیم لێدەکرد. کە دەیگرتم دەیوت کاکە موسوڵمانی نابێت، منیش دەموت یاری دەکەین خۆ نوێژ ناکەین

..(هەڵەبەت یاری کردن بووە تەنها بۆ خۆشی بووە نەك لەسەر شت کرابێت وەکو قومار.)
لە پڕ زەنگی من لێیدا کەوەڵامم دایەوە وتی: حوسێنم وا هاتووم ناونیشانم بۆ بنێرە.
ماکوان: ئیقباڵت لەگەڵە ؟
حوسێن: نا ئیقباڵ چووە بۆ ئەفغانستان، منداڵەکەی بردەوە خۆی دەگەڕێتەوە لەم ڕۆژانەدا.
ناونیشانەکەم بۆ نارد و هات بۆلامان و کەمێك دانیشت.
حوسێن: ڕافی هەمووی چارەکێك دوورە لێرەوە پرۆ بچین بۆ لای.
ماکوان: ئاڵتونەکانی لایە ؟
حوسێن: نا شتێکی تر ڕویداوە با بچینە لای ئەو، پێت دەڵێم.
ماکوان: ئەمانەی لێرەن هەموو برای منن، بێخەم قسە بکە و هیچ کێشەمان نییە.
حوسێن: کاتێك کە ئاڵتونەکانی لێبردووین، بردوویەتی بیفرۆشێت بۆ خۆی. کە بردوویەتیە بەلجیکا لەوێ کۆمەڵێك مافیای تری جولەکە لێیان سەندووە و زۆریان لە ڕافی داوە، ئێستا لای ئەوانە ئاڵتونەکە.
ماکوان: کە وای وت زۆر تورەبووم و وتم دەستیان خۆش بێت. خۆزگە وەکو سەگ دەیانتۆپاند، باپڕۆین ئەوەندەی تریشی لێبدەین.
هەر وام وت...
کاکە باز: ئەوە من ئامادەم
فریاد: کاکە بیکەن بۆ خاتری خوا شەڕی چی.
حوسێن: سەیدا با هێمن و ئارام بین لەگەڵیدا دەڵێت ئەگەر ئێوەش هاوکاریم بکەن ئاڵتونەکان ئەدۆزمەوە.
ماکوان: ئەترسم لەگەڵ ئاڵتونەکاندا ئێمەش بدزن و بمان فرۆشێت سەیدا حوسێن ئەوە جولەکەیە سیقەیان نییە.
حوسێن: تۆ جارێ واز بێنە تا ئەم خوێڕییە فێری ئەوە نەبێت ماڵی ئێمەی کورد بخوات.
هەڵسایین چووین بۆ ماڵی ڕافی و من و حوسێن و کاکە باز، هەرچی وتم کاکە باز مەیە هەر ڕازی نەبوو وتی دێم. هات و چووین لەدەرگامان دا بەکڵاوێکی جولەکەوە هات بەرەو ڕوومان و کە منی بینی دەموچاوم دابوو بەیەکدا.
ڕافی: حوسێن بە ماکوان بڵێ وەکو دز تەماشام نەکات، بەڵکو ئێمە هاورێین، دەزانم تورەیە.

# کورد و جولەکە و ڕافی

چووینە ماڵەکەی ڕافی وا خۆی نیشان ئەدا زۆر دڵسۆزە، بە کوردی بە حوسێنم وت هەموو گیانی درۆیە بەهیچ شێوەیەك پڕوای پێنەکەیت و دەبێت زۆر بە ئاگاییەوە لێرە بین، چونکە هیچ لای گرنگ نییە پۆلیسمان بۆ بانگ بکات و بڵێ هاتوون بۆ کوشتنم.
کە باسی پۆلیسم کرد بە عەرەبی وتی: ماکوان عەرەبی دەزانیت؟
ماکوان: خراپ نیم ئەتوانم ئیشەکانی خۆمی پێ جێبەجێ بکەم، بەڵام تۆ چۆن عەرەبی دەزانیت؟
ڕافی: ماوەیەکی زۆر لە وەزارەتی دەرەوەی هۆڵەندا کارم کردووە لە کونسوڵی لیبیا بووم، ئیتر فێربووم بەعەرەبی قسەبکەم باشم لە زمانی عەرەبیدا.
بەعەرەبی قسەم لەگەڵدا کرد لێم پرسی: ئەی چەند وەختە بۆ نەت وتووە کە عەرەبی دەزانیت؟
ڕافی: ئاخر من وامزانیبوو کە ئێوە عەرەبی نازانن.
ماکوان: زۆر بتناسین لەوانەیە کورد دەربچیت ڕافی.

ڕافی: من کوردم زۆر خۆشدەوێت.
ماکوان: ڕاست ناکەیت، حوسێن کوردە کەچی ئەویشت هەڵخەڵەتاند و ئاڵتونەکانت دزی.
ڕافی: تکایە ئەموت بەچاوی دز تەماشام مەکە، کە تۆ ڕۆشتی ویستم هاوکاری ئیقباڵ بکەم.
ماکوان: بەدزینی ئاڵتونەکانی هاوکاریت دەکرد؟
ڕافی: جولەکە کوردی خۆشدەوێت هەرگیز پشتی تێناکات.
ماکوان: ڕاست نییە، لەوەتەی ئێوەی جولەکە بوونتان هەیە هەر خەریکی پاشقول گرتن بوون لە کورد.
ڕافی: تەنها ئێمە بووین کە هاوکاری مەلا موستەفای بارزان مان کرد.
ماکوان: ڕاست نییە لەبەر خاتری مەلا موستەفا نەبوو، دژی عیراق بوو دەستتان لەگەڵ کوردا تێکەڵ کرد لەوکاتەشدا زۆر بێ هەڵوێست بوون.
ڕافی: ئێستاش ئێمەی جولەکە لە دونیادا هاوکاریتان دەکەین و پشتگیری گەلی کورد و ڕیفراندۆممان کرد.
ماکوان: بەڕاست؟ ئەی کوا هەڵوێستتان دەرهەق بە ڕیفراندۆم بۆ پشتتان کردە کورد؟
کاکە باز: ماکوان، هەڵسم تۆزێکی لێبدەم؟
ماکوان: بۆخاتری خوا لە ماڵەکەیداین هیچ نەکەیت، باش بوو بێدەنگ بوو.
ڕافی: من زۆر ئاگاداری سیاسەتی ئێستا نیم دەنا ئەوەندەی بزانم کورد و جولەکە زۆر نزیکن لەیەکەوە.
ماکوان: ڕاست ناکەیت ئەی چۆن ئاگات لەڕیفراندۆمە، ئێوە گەورەترین هەڵەی ژیانی کوردن ئەزانی چەندە بێ هەڵوێست بوون لە هەمبەر کوردا ؟
ڕافی: وانیە..
ماکوان: چۆن وانیە؟ دوای دروست بوونی بزوتنەوەی سەهیۆنی لەساڵی ١٨٩٦زاینی (بزوتنەوەیەکی یەهودی بوو هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی بۆ ئیسرائیل دەدا لەسەر خاکی فەڵەستین) وورده وورده یەهودییەکانی کوردستان دەستیان کرد بەگەڕانەوە بۆ فەڵەستین تاك بەتاك، بەڵام بەشێوەی کۆمەڵ نەبوو لەم قۆناغەدا دواتر دوای کۆنگرەی (بازل) لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٠ بۆ ١٩٢٦ زاینی، نزیکەی ١٩٠٠ کوردی یەهودی کۆچیان کرد بەرەو فەڵەستین.
ڕافی: ڕاستە، بەڵام کێشە چییە لەو زانیارییانەی کە دەیڵێیت؟
ماکوان: کێشە خیانەتی ئێوەیە، دەرحەق بە کورد و کوردستان؟
ڕافی: تێناگەم کام خیانەت؟
ماکوان: ئەزانی خیانەتەکەتان چەندە گەورەیە، لەساڵەکانی ٦٧-٣٨ی پێش زایین یەهودییەکانی کوردستان هێز و پارە و سامانیان کۆکردۆتەوە لەکوردستان و ناردوویانە بۆ جەلیل (باکوری فەڵەستین) بۆ یارمەتیدانی یەهودییەکان کاتێك کەوتبوونە بەر هێرش لەلایەن ڕۆمانییەکانەوە.

- لەسییەکان و چلەکانی سەدەی ڕابردوو دوای هەوڵی یەهودییەکانی جیهان بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە کوردستان چەندین بزوتنەوەی سەهیۆنی دروست بوون بۆ کۆکردنەوەی یەهودییەکان و گێڕانەوەیان بۆ ئیسرائیل، لەکوردستانیش بەهەمان شێوە ئەم بزوتنەوانە دروست بوون:
ڕێکخراوی (نەوەی یەهوزا) لەهەولێر.
ڕێکخراوی (نەوەی یەهوزا) لەخانەقین.
ڕێکخراوی (هاجانا) (بەرگری) لەکەرکوك لەساڵی ١٩٤٦.
بزوتنەوەی (حالوتس) لەکەرکوك لەژێر ناوی (قەعەروت) لەساڵی ١٩٤٤.
بزوتنەوەی (حالوتس) لەهەولێر لەژێر ناوی (تەبەریا) لەمانگی ئازاری ١٩٤٧.
بزوتنەوەی (حالوتس) لەهەڵەبجە لەژێر ناوی (تەل حای) لەمانگی ئازاری ١٩٤٧.

یەکێك لەیەهودییە دەوڵەمەندەکانی کوردستان (نورئیل)ە کەدانیشتووی هەولێر بوو وە بەرپرس بوو لە بزوتنەوەی سەهیۆنی لەو ناوچەیە، دەستیان کرد بەیارمەتیدانی بزوتنەوەی سەهیۆنی بەپارەیەکی ئێجگار زۆر بۆ (کیرن کیمپ) (سندوقی دامەزرێنەری یەهودی) هەر بۆیەش بانگهێشتکرا بۆ کۆنگرەی سەهیۆنی پانزەیەمین لەساڵی ١٩٢٧، بەڵام بەزانینی کاربەدەستان لەعێراق ڕێگریان لێکرد لەو گەشتە و نەیانهێشت ئەو گەشتە بکات.

هەروەها (ئیسحاق دانێل) کە بەرپرسی بزوتنەوەی سەهیۆنی کەرکوك بوو لەهەمان کاتدا ئەندام پەرلەمانی ئەو کاتی عێراق بوو، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی پارە بۆ بزوتنەوەی سەهیۆنی.

لەخانەقینیش (ئیبراهیم ساسۆن) کە بەرپرسی بزوتنەوەی سەهیۆنی بوو لە خانەقین، لەساڵی ١٩٣٥ جگە لەکۆکردنەوەی پارە و ناردنی بۆ بزوتنەوەی سەهیۆنی دەستی کرد بەناردنەوەی کوردە یەهودییەکان بۆ ئەو فەڵەستینەی کە لەڕێیەوە دەیانویست دەوڵەتی ئیسرائیلی لێ دامەزرێنن.

ئەمەش مشتێکە لەخەروارێکی هەڵوێستی ئەو یەهودییانەی کە لە کوردستاندا ژیاون، ئەو کوردستانەی یەکەمین لانکەی یەهودییەکان بوو، ئەو کوردستانەی بەتایبەتی ناوچەکانی زاخۆ و بادینان و بارزان وەك بەشێك لە مێژوونوسان باسی دەکەن هێندە شوێنێکی ئارام بووە بۆیان هیچ جیاوازییەك نەکراوە لەنێوان یەهودی و مسوڵمان دا، لێرەدا دەمەوێت ئەوەشت پێ بڵێم کە ئەو سەردەمە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لەسەرجەم ناوچەکانی کوردستان لەوپەڕی لاوازیدا بووە چ لەڕووی داراییەوە و چی لەڕووی پشتگیرییەوە چی لەڕووی هێزەوە بەتایبەتی دوای شکستی شێخ مەحمودی نەمر و دامرکاندنەوەی شۆڕشی بارزانی لە ١٩٣١ و ١٩٣٣ هاتنی مەلا مستەفا بۆ سلێمانی، لێرەشدا ڕۆڵی یەهودییەکان زیاتر دەردەکەوێت کەهەوڵی ئەوان لەڕوانگەی ئاینییەوە ڕوانیویانەتە کوردستان نەك لەڕوانگەی نەتەوایەتییەوە.

ڕافی: من هیچ زانیاریم نییە لەسەر ئەو مێژووە.
ماکوان: جولەکە زۆربەی شتەکان دەزانن، بەڵام کە زۆرتان بۆ هات خۆتانی لێ گێل دەکەن، ئەزانن لە شارەکەی من چ کارەساتێکتان دروستکرد.
ڕافی: سلێمانی؟
ماکوان: بەڵێ سلێمانی.
ڕافی: ئێمە گەڕەکمان هەبوو لەسلێمانی ناوی جولەکان بوو، کوردەکانی ئەوێ دەریان کردین.
ماکوان: ڕاست ناکەیت و خۆت بەدرۆ خستەوە، ئەگەر قسەکەی تۆ وابێت کەواتە کورد جولکەی خۆش نەویستووە کە ڕاست نییە، پاشان کە دەڵێم درۆ دەکەیت ئێوە خەڵکی شاری سلێمانیتان فرۆشت بۆ ئیسرائیل.
ڕافی: پڕوا ناکەم شتی وا ڕووی دابێت.
ماکوان: بۆ زانیاریت من شارەزای مێژووی کورد و ئیسلام و جیهانم بە گشتی، تۆ ناتوانیت لەگەڵ مندا لەسەر مێژوو قسە بکەیت جوان گوێبگرە و خەجاڵەتی بکێشە.
جولەکەکانی شاری سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەری کە چەندە زیانبەخش بوون بەرامبەر بە خەڵکی سلێمانی و ناوچەکە وە چەند دزیان لەخەڵکی شاری سلێمانی کردووە.
بۆ ئەم مەبەستەش چەند بەڵگەیەکی مێژوویت بۆ باس دەکەم.
لە دوایی جەنگی جیهانی دووەم لەسەردەمی ڕەشید عالی گەیلانی دا گرانی ڕووی کردە شاری سلێمانی لە نێوان ساڵی ١٩٤٦-١٩٥٤ دا کە خەڵکی ئەو دەمەش شۆڕشیان دەکرد بەرامبەر ئیمپریالیزم و حکومەتی پاشایەتی و دەرەبەگ و ئاغای ئەو سەردەمە.
لەشاری سلێمانی ڕۆژی وا هەبوو دوو جار تا سێ جار خۆپیشاندان دەکرا، خەڵکی شاری سلێمانی زۆر فەقیر و لێقەوماو و بێ کەس بوون هەروەها خەڵکی لەو کاتەدا بۆ عانەیەك دەچوون بە ئاسماندا، لەهەمان کاتدا جولەکەکان لەناو شاری سلێمانی بڵاوبوونەوە.
لەناسراوەکانیان ( مسقێل، ڕابین، رافائیل، جوزێف، بنیامین) بوو، هەروەها ( موشی و مناحیم ) لەناودارەکانی ناو شارۆچکەی پێنجوێن و هەڵەبجە و سلێمانی بوون.
بنەماڵە بنچینەدارەکانی ئەو سەردەمە لەناو شاری سلێمانی ٢٥٠٠ بنەماڵە لە سلێمانیدا دەژیان، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ دانیشتوانی سلێمانی نەدەگەیشتە سێ هەزار کەس.
ئەوکاتە دەزگای تموین ( بایەعی ) هەبوو کە کەلوپەلی دابەش دەکرد بەسەر خەڵکیدا کە شەکر و چای و خام و بلوری و صابونی ڕەقی و لۆکس و چیتی شیرکەتی و ...هتد ، جولەکەکانی ئەو سەردەمە بەتایبەتی مسقێل لەگەڵ رافائیلدا کە بە میرزا ناسرا بوو ڕێك کەوتبوون لەگەڵ کارمەندەکانی ئەو دەزگایە کەبەهەموو شێوەیەك بازاڕی سلێمانییان مۆنۆپۆل کردبوو،

ئەوەدەمە لەڕێگای حزبی کۆمۆنیستی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی ڕزگاری و حزبی هیوا لەڕێگەی ڕێکخستنەکانیانەوە توانیان زۆرێك لەو خەڵکە دزە و لەگەڵ جولەکەکان دەستگیر بکەن.
فەقێ ڕەشیدی قەشان پیاوێکی بەڕێزی شاری سلێمانی بوو دوکانێکی گەورەی لەشاری سلێمانی دا هەبوو لای قەسرەکەی تۆفیق قەزازەوە لەدوای گرتنی مسقێل و جوزێف و رافائیل و هەندێکی تر لەو جولەکانەی تر کە بەگران شتیان بەخەڵکی دەفرۆشتەوە ئازادکران بەو مەرجە ئازاد کران کە دەبێت جاسوسی بۆ حکومەتی پاشایەتی و ئیمپریالیزم بکەن. پڕیار وابوو کە مسقێل هاتە دەرەوە ناوی هەرچی شۆڕشگێڕەکانی شاری سلێمانی بوو بیدا بە ( حسن ساقی و حسێن ساقی برای ) کە ئەم دووانە بەبنەچە تورکمان بوون وە دوو جەلادی شاری سلێمانی بوون وە هەموو جولەکە و یەهودییەك بووبوون بە جاسوس بەسەر خەڵکەوە.
هەروەها مسقێل و جوزێف کە ئازادکران دامەزران لەلای فقێ ڕەشیدی قەشان بە باش کاتب، لەساڵی ١٩٤٧ دا کەزۆرترین خۆپیشاندان ڕووی ئەدا لەشاری سلێمانی، خۆپیشاندانێکی گەورە لەبەردەم دوکانەکەی فەقێ ڕەشیدی قەشان ڕوویدا بۆ جۆش دان و گەرم کردنی خۆپیشاندانەکە، مسقێل هاواری کرد بژی برایەتی کورد و ئیسرائیل وە لەو کەسانەی زوو دەربازبوون نەگیران لەو خۆپیشاندانە (محمد شەیدا، حسینی سید گوڵ، مجید عبدالرزاق زامدار، حسینی حاجی ئەمین و چەند قوتابییەکی تر) دەربازبوون، خەڵکی شاری سلێمانی ١٧٠ کەسیان لێ گیرا لە خۆپیشاندانەکە، وە ئەوانەشی کەدەستگیریان کردبوون هەر بەفیتی، مسقێل و ماناحم و ڕابین...هتد بوو. هەروەها جولەکەکانی شاری سلێمانی کاریان دەکرد لەسەر ئەوەی کە ئەو بنەماڵە ناودارانە حەیاو شەرمیان بتکێنن و بۆ ئەوەی سەرشۆڕیان بکەن لەناو خەڵکیدا بۆئەوەی لەهەمان کاتدا قسەی خۆیان بەسەریاندا زاڵ بکەن. دەستیان تێکەڵ کردبوو لەگەڵ ڕژێمی پاشایەتیدا بۆ ئەوەی ڕۆژنامەی ژین و گۆڤاری گەلاوێژ هەروەها ڕۆژنامەی خەبات کە زمان حاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو ئەیانویست لەناو خەڵکیدا خوێنەری ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە کەم بکەنەوە هەتا دابخرێ، بۆ ئەمە دەڵێیت چی؟
ڕافی: هیچ زانیاریم نییە لەسەری ببورە.
ماکوان : باشە، کوا ئاڵتونەکان ؟
ڕافی: لە بەلجیکایە لەبن دەستی چەند کەسێکی مافیادایە، هاوکاریم بکەن وەریبگرینەوە دەمەوێت دان بنێم بەوەدا کە من هەڵەم کرد، بەڵام باجی هەڵەکەم داوە دزیان لەمن کرد و ئەوانیش جولەکەن منیان هەڵخەڵەتاند.
ماکوان: من دەڵێم ئێوە دزن باوەڕ ناکەیت، هێشتا دەڵێیت بەچاوی دز تەماشامان مەکە.
ڕافی: تکایە ئازارم مەدە با بتوانین بەیەکەوە ئاڵتونەکان بگەڕێنینەوە.

ماکوان : ئازاری چی، تۆ پێویستە دەستت ببڕێت، ئێستا کاتی ئەوە نیە پلانمان چی بێت؟
حوسێن: من نازانم باسی چی دەکەن؟
ماکوان: پلان دادەنێین بۆ ئەوەی ئاڵتونەکە بەدەست بهێنینەوە.
حوسێن: هەموو پێداویستی ڕێگە و ئۆتۆمبێل و خواردن و خەوتن لەسەر تۆیە ڕافی؟
ڕافی: باشە ڕازیم، بەڵام پێویستە چەند کەسێکی ترمان لەگەڵ بێت لە برۆکسل تا ئەو کەسانە لێمان بترسن.
حوسێن: خەڵکم ئامادە کردووە لەوێ خەمتان نەبێت کوردی باکوری زۆر لێیە.
ماکوان: زۆر باشە ئەم شەو بچین یان بەیانی؟
ڕافی: ڕێگاکەمان سێ کاتژمێرە بەیانی بچین باشترە دەچینە دوکانەکەیان و لەوێ قسەیان لەگەڵ دەکەین.
ماکوان: فێڵ یان درۆ بکەیت  بۆ ئەبەدی خۆم دەتخەمە زیندان، تێدەگەیت چی دەڵێم؟
ڕافی: دڵنیابە تەرەفی تۆ دەبم.
ماکوان  "بە کوردی": ئەگەر پروات پێبکەم لە جێگای تۆبم.
هەڵساین هاتینەوە بۆ ماڵی  فریاد و چاوەڕێمان کرد تا بەیانی و هەموو بەیەکەوە بچین بۆ بەلجیکا، بە دوو ئۆتۆمبێل ڕۆشتین، حوسێن لەگەڵ ڕافی بە ئۆتۆمبێلێك و من و کاکە بازیش بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆم.
چووینە برۆکسل لەوێ لە بازاڕدا دەگەڕام، خۆم کرد بە دوکانێکدا بەس جۆری جیاوازی شکولادەی دەفرۆشت بۆ دیاری  چومە دوکانەکە تا چەند دیاریەك بکڕم بۆ نەرویج. لە جامخانەی ئەو دوکانە فوارەکی شوکولادە دانرابوو زۆر سەرنج ڕاکیش بوو لەلام لە جیاتی ئاو شوکولادەی پێدا دەهاتە خوار، سەرنجی ڕاکێشابووم دۆش دامابووم بەدیاریەوە لە پەنجەرکەوە لە پشتی خۆمەوە حەزقیل و سەسیلم بینی.
ئاوڕمداوە کەس دیار نەبوو تەماشام کردەوە لەجامخانەکەوە هەردووکیان پێدەکەنن، دیسان ئاوڕمداوە  کەس نەبوو حەزقیل چپاندی بەگوێمداو وتی: پڕۆ بۆ سەر ئەو کورسیە دانیشە با قسە بکەین.
ڕۆشتم لەسەر کورسیەکە دانیشتم و حەزقیل خۆی ئاشکرا کرد.
ماکوان: لەدوای ئەو هەموو ناڕەحەتیەم ئەوەندە خوێن ساردیت ئاوا دێن بۆ لام  هەواڵم دەپرسن؟
حەزقیل: ئەوەی بەسەر تۆدا هاتووە زۆر خراپتر بەسەر ئێمەدا هات، تۆ دەبێت بزانیت چەند لە ئێمەوە نزیك بیت و هاوڕێیەتی ئێمە بکەیت، ئەوەندە ئەوان دوور دەکەونە کە تۆ نزیك بوویت لەوان ئێمە توانامان نییە بێینە لات، ئەو بنەمایە بزانە.
ماکوان "بە پێکەنینەوە": حەزە گیان  ئەمە بنەمای جەبریە یان هەندەسیە؟

حەزقیل: ئاگاداربە ئاڵتونەکان لای کۆمەڵێك مافیایە، ڕافی تەزویری کردووە وەکو خۆی دروستی کردۆتەوە تەنەکەیە هەمووی ئەوەتان ئەدەنەوە، بۆ ئەوەی پڕۆن و ئەصلەکەش خۆیان دەیفرۆشن. شێخ برقان سڵاوی هەبوو ئەو وتی ئاگادارت بکەمەوە.
ماکوان: ئەی خوێڕی ڕافی، علینا وعلیکم السلام، ئەی ئاڵتونە ئەصڵەکە لە کوێیە؟
حەزقیل: تەماشا مەکە چاودێریت لەسەرە لەو جێگایەوە بۆیە هاتونەتە ئێرە، بەرانبەرت ئەو گەلەریە کە تابلۆی تێدا دەفرۆشرێت لەوێدایە لە قاتی سەرەوەیە لە ژووری خاوەن گەلەریەکە، بەڵام لە ژێر زەمینەکەیدا ئاڵتونە تەزویرەکە لەوێدایە، ئێوە دەبەنە ژێر زەمینەکە. ئەگەر بزانن ژمارەتان کەمە لێتان ئەدەن و ئازارتان ئەدەن، ئەگەر زانیشیان زۆرن ئەوا ئاڵتونە تەزویرەکەتان ئەدەنێ و بەوە هەڵتان دەخڵەتێنن، ڕوونە ؟
هەر ئەوەندەی ووتی ڕوونە حەزە دیار نەما، منیش دڵنیام لە زانیاری حەزەی برام، کە ووتی خۆت تێك مەدە زانیم چاودێریم لەسەرە لەتەرەفی دزەکانی ڕافی، چوومەوە بۆ بەردەم دوکانەکە و تەلەفۆنەکەم نا بەگوێمەوە بە کامێرەی ڤیدیۆ بە لاری وەستابووم وێنەی هەموو دوکان و بیناکەم گرت و بە ئارەزووی دڵی خۆم بۆ ئەوەی لەبەرچاوم بێت. دوایی چوومە دوکانەکە بۆ کڕینی شوکولادە.

## جەنگی ئێمەی موسوڵمان لەگەڵ مافیا جولەکەکان

دوای ئەوەی کە حەزقیل خۆی نیشاندامەوە و پیلانی ڕافی ئاشکرا کرد بۆم کە چەندە ڤێزەوەنانە کارەکەی کردووە. ماڵی حەزقیل و جنەکانی تریش ئاوابێت جێگاو شوێنی ئاڵتونەکەیان ئاشکرا کرد بۆم. شوێن و جێگای تەزویرەکانیشی بۆ دەست نیشان کردم.
منیش تەلەفۆنەکەم نا بەگوێمەوە بە لاتەنیشتمەوە بەڤیدیۆ وێنەی هەموو ناوچەکە و شوێن و گەلەریەکە و بیناکەیم هەمووی گرت، نزیکەی دە خولەك

زیاتر وێنەم گرت. لە دوکانەکەدا بووم  کاکە باز هاتە لام پرسی: ئەوە چی دەکەیت؟ ئێمە بۆچی هاتووین و تۆ چی دەکەیت چاوەڕێی تۆن دەڵێن با ڕۆین بۆ لای ئەو  کۆمەڵەی ئاڵتونەکەیان لایە.
ماکوان: ڕۆ حوسێنم  بۆ جیا بکەرەوە لە ڕافی و چاوت لەسەر ڕافی بێت نەهێڵیت ڕوات بۆ هیچ جێگایەك و خۆی وون نەکات، تۆزێك خێرا ڕۆ بۆ لایان.
ئەوان لە قاوەخانەیەك لە برۆکسل دانیشتبوون منیش هاتبوومە دەرەوە دەگەڕام بەناوشاری برۆکسل و پێم وتبوو کە ڕیارتاندا ڕۆن بانگم  بکەن، دیار بوو ڕافی شوێنەکەی بە ئێمە نەوتبوو نزیك بووین لە جێگاکەوە بۆیە پێویست بوو حوسێن بێتە لام و پلانەکەی بۆ ئاشکرا بکەم.
حوسێن: سەیدا ماکوان چاوەڕێی تۆین با ڕۆین.
ماکوان: هەڤاڵ با کارەکە دوابخەین ڕۆ  بڵێ ماکوان  وون بووە بۆمان نادۆزرێتەوە، تەلەفۆنم بۆ بکەن بە ئۆتۆمبێل بگەڕێن بەشوێنمدا، بچنە ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانت، ڕافی فێڵ و چاوبەستی لێکردووین دواتر ڕێت دەڵێم چی دەکەین.
ئەوەی کە زۆر منی سەرسام کردبوو سیقە و متمانەی حوسێن بوو.
هیچی نەووت ئەوەی پێم ووت پیت بە پیتی پیادەکرد، ڕافی یان بردە ماڵی هاوڕێیەکی حوسێن نیو کاتژمێریان پێچوو دوای ئەوە تەلەفۆنم کرد هاتن بە شوێن منیشدا و چووین بۆ ماڵی هاوڕێکەی حوسێن کە ناوی ئەحمەد بوو.
ڕافی: لەسەر قەنەفەکانی ماڵی ئەحمەد دانیشتبوو مۆبایلەکەی لەگەڵ پاکەت و چەرخەکەی لەسەر مێز دانا بوو، هەستایە سەرپێ خێراکەن با ڕۆین.
بە پێکەنینەوە چوومە بەردەمی: ببورن کاتم زۆر لێگرتن ون بووبووم باش بوو خۆمم دۆزییەوە هەر وام وت پاڵێکم پێوەنا لەجێگای خۆی دانیشت، دەستم دایە تەلەفۆنەکەی هەڵمگرت و خستمە گیرفانم و بە کاکە بازم وت نەهێڵن ڕاکات یەك دوانێکی پیا کێشە با باش بترسێت.
هەر وام وت حوسێن پێش کاکە باز دەستی پێگەیاند وا لێیدا بوراندییەوە.
ماکوان: یەکجار وام نەووت، هەر ئەوەندە بیترسێنن شتێکی لێبێت چی بکەین.
حوسێن: داخی لە دڵی مندایە ئەو بەس خیانەتی لە ئێوە نەکردووە، تەنها لە منی کردووە.
ماکوان: ئاو بێنن لێی بپرژێنن، ئەگەر کاك ئەحمەد بۆنی زۆر تیژی لایە با بۆنی پیا بکات، بەڵکو هۆشی بێتەوە ئەم سەگە ئیشمان بەو دەڕوات، تەلەفۆنەکەی کۆدی لەسەرە بزانن کۆدەکەی لێناسێنین.
هەرچۆن بوو هۆشی هاتەوە.
ڕافی: بۆ وام لێدەکەن، مادام وادەکەن فەرموو بمکوژن و شوێنەکەتان پێنالێم.
ماکوان: پێویستمان بە شوێنەکە نییە، چونکە تۆ درۆت لەگەڵ کردووین.
ڕافی: درۆی چی فەرموو با ڕۆین ئاڵتونەکان بهێنینەوە.

ماکوان: باشە بۆ ئەوەی متمانەت پێبکەم تەلەفۆنەکەت بکەرەوە با تەماشایەکی بکەم بزانم کێ تەلەفۆنی بۆ کردوویت؟
ڕافی: باشە بەسەرچاو کۆدەکەی کردەوە بریتی بوو لە (١٩٤٨) کە من پێم وابوو ساڵی دامەزراندنی دەوڵەتی یەهودە لەسەر خاکی فەلەستین.
تەماشای تەلەفۆن و نامەکانم کرد هیچی تێدا نەبوو، زانیم پەیوەندیەکان لە تەلەفۆنەوە نەبووە. گەڕام بەشوێن ڤایبەردا هیچی تێدا نەبوو، بیرم کردەوە وتم حەتمەن فەیسبووکە. کە فەیسبووکەکەیم کردەوە تەماشای مەسنجەر و نامەکانیم کرد لەوێدا شتی زۆری تێدابوو، بە زمانی عیبری نوسرابوو. داوای کۆمپیتەرم کرد لە کاك ئەحمەد، لاپتۆپی بۆ هێناین لەگەڵ کاکە باز دەستمان کرد بە وەرگێڕانی نامەکان لە گۆگل ترانسلەیت، یەکێکمان دۆزیەوە کە قسەی لەگەڵ کردبوو ناوی ئارنێست بوو، هەموو ئەو پلانەی کە حەزقیل باسی کردبوو بۆ من بێ کەم و زیاد لەگەڵ ئارنێستدا باسی کردبوو، نامەکانیش هەمووی مێژووەکەی دەگەڕاوە بۆ ڕۆژێك پێشتر، کە بەهەموو نامەکاندا گەڕاین و بینیمان کە هەردوو پلانەکە ئەوان دایانڕشتبوو.
پلانەکە بەم شێوەیە داڕێژرا بوو کە دەچینە ناوەوە تا پێنج کەسیش بین دەست بەسەرمان دەکەن و لە دوای لێدانێکی زۆر چەند پارچەیەك لە مۆرفین و هێرۆین دەخەنە گیرفانمان و دوای ئەوە شکاتمان لێدەکەن و ئەوەشیان باس کردبوو کە کامێرا و سیستەمی کامێراکە لە کار دەخەن بەناوی ئەوەی نوێی دەکەنەوە.
کە ئەوەمان بینی هەمووومان تورە بووین حوسێن ویستی لێی بداتەوە هاوارم کرد نەکەی بۆ خاتری خوا دەیکوژی، کاکە باز تۆ پیای بکێشە. ئەویش دەستی داهێنایەوە بکشێت بەدەمیدا هاوارم کرد لەویش بۆ خاتری خوا چی دەکەیت بکێشە بە پشتە ملیدا، کابرا دیلە لەبەردەستماندا دروست نییە وای لێبکەن.
کاکە باز: دیلی چی خۆ لە شەڕدا نەگیراوە تا یاسای جنێفی بەسەردا بسەپێت، واز بێنە با ئەم سەگە بتۆپێنم، ئەزانی چ پلانێکی داناوە بۆ ئێمە، خەریکبوو سەری هەمووومان بکات بە قوڕا.
ماکوان: ئێمە خودامان هەیە ئەوان کێیان هەیە؟ خودای گەورە ئاشکرای کرد بۆمان بەدڵنیاییەوە دیلە و لەشەڕدا گیراوە، ئەگەر نانمان خوارد دەبێت لە خواردنی خۆمانی بدەینێ، پێداکێشانیش تەنها بۆ تەئدیبە، نەك قاچ و دەستی بشکێنیت. خۆ بەعسی نین ئێمە.
واز لەوە بهێنن وەرن با خێرا نامەیەك بنووسین بە عەرەبی و تەرجومەی بکەینەوە بە عیبری بۆ ئەوەی وا نەزانن شتێك ڕوویداوە.
نامەیەکمان نووسی بە زمانی عەرەبی وەرمانگێڕا بۆ زمانی عیبری، لە نامەکەدا نووسیبووم ئەو کوڕەی کە خاوەن و کەسی یەکەمی گروپی کوردەکانە ناوی ماکوانە، ون بووە بەشوێن ئەودا دەگەڕێین کە دۆزیمانەوە ئاگادارتان دەکەینەوە. بۆیە لە کاتی خۆی دواکەوتووین، هیچ دەرفەتی

نوسینم نییە بۆیە ناتوانم بنوسم، بەڵام دڵنیاتان دەکەمەوە کە پلانەکە وەکو خۆیەتی و هیچ نەگۆڕاوە.
وەڵامی نامەکەم بۆ هاتەوە..
سوپاس بۆ ئاگادارکردنەوەکەت، هاوڕێکانمان لێرە لە دڵەڕاوکێدا بوون تا چوار کاتژمێری تر دەتوانین چاوەڕێتان بکەین ئەگەر هاتن ئێمە هەمووماں ئامادەین لە گەلەریەکە.
ڕافیم بەستەوە و کاك ئەحمەدم بەدیاریەوە دانا حوسێن و کاکە بازم بانگکردە ژوورێکەوە وێنەی گەلەریەکەم نیشاندان کە بە تەلەفۆنەکەم گرتبووم لەبەرچاوماندا بوو هەمووی.
بە حوسێنم وت ١٠ کەسمان پێویستە، واتا حەوت کەسی ترمان پێویستە ئەوان تەنها حسابی سێ کەسیان کردووە، بەڵام دەبێت بە موفاجەئە ببینە ١٠ کەس تا بتوانین شەڕ بکەین و ئەگەر بتوانن چەکیش پەیدا بکەن ئەگەر چی منداڵانەش بێت لەماوەی ئەم چوار کاتژمێرەدا، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەبێت چەقۆ و بۆکس خەنجەر یاخود تێلا و دار بشارینەوە، هەرچی بێت پێمان بێت نەوەکو شەڕ ڕووبدات و شتی نەخوازراو بێتە پێشەوە، با بتوانین دەست بکەینەوە.
حوسێن "ئەحمەدی بانگ کرد": پێویستمان بە دە کەسە، چەند شك دەبەیت بێتە لامان لە ماوەی کاتژمێرێك دا.
ئەحمەد: تەلەفۆنی کرد دەستبەجێ بۆ دوو دوکاندار لە برۆکسل هەر یەکە چوار کەسیان نارد، پێمان وت خۆمان پارەی ئیشەکانیان ئەدەینێ، تەلەفۆنیان کرد بۆ کەمپێك لە نزیك برۆکسل سێ تورك و کوردێکی تریش هاتن.
واتا نزیکەی ١٥ کەس دەبووین بە سێ سەیارە چووینە ناو بازاڕ، پلانم ئاوا داڕشت.
من و حوسێن و کاکە باز دەچینە سەرەوە سێ کەسی تریش پاسەوانیمان دەکەن لەپشتمانەوە هەر هەنگاوێکمان هەڵهێنایەوە تەنها دوو پلیکانە لێمان دوور دەبن، پێنج کەسیش بۆ خوارەوە لەوێ ئاڵتونە ساختەکان بهێنن دووانیان دەڕوات سێ دانە پاسەوانی دەکات، دوو کەس لە ناو گەلەریەکەدا بێت و دوانیش لە دەرەوەی گەلەریەکە. من جلەکانی خۆمم گۆریەوە لەگەڵ کەسێك زۆر لەیەك دەچووین ئەوم دانا بچێتە ژێر زەمینەکەوە.
جلەکانی ڕافیم کردە بەری کەسێکیان، پێم وت لەدوورەوە لەگەڵ ئەو کوڕەبە کە جلەکانی منی کردۆتە بەری و ئەوانی تر لە پێشەوە بڕۆن سەرەتا تەنها سێ کەس خۆی بکات بەژووردا، دووانی تر بەدوایدا دەرگاکە کۆنترۆڵ بکەن من و حوسێن و کاکە باز لە کۆتاییدا دەڕۆین، وامان دانابوو کە غەڵبە غەڵب و قەرەباڵغی دروست بکەن تا سەریان لێ تێك بچێت و بچینە سەرەوە و ئەوانیش بۆ خوارەوە. دوو دەمانچەی منداڵانەمان دەست کەوت کە زۆر منداڵانە دیار بوو دەترسام لەوەی کە بە دەستیانەوە دیار بێت کە مناڵانەیە،

بۆیە پێم ووتن با هەوڵ بدەن دەرنەکەون وەکو لاشە، بەڵام شکڵی دەمانچەکان دەربکەوێت بزانن کە دەمانچەیە.
چووینە نێو ناوچەکە و چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد یەك کاتژمێرمان مابوو لەو مەوعیدەی کە دایان نابوو لەگەڵ ڕافی چووینە ژوورە بۆ ناو گەلەریەکە ئەوەی لەوێدابوو حەپەسابوون، هەمووی واقیان وڕمابوو. نەك هەر دەستیان بۆ نەکراوە، بەڵکو خەریك بوو زیرەیان دەکرد، هەردوو ئاڵتونەکانمان هێناو هاتینە دەرەوە بەبێ ئەوەی هیچ ڕوویدات.
حوسێن خێرا سەرو ١٠٠ ئێورۆی دا بە هەریەك لەو کوڕانەی لە کەمپەوە هاتبوون، هەموو کارەکەش نیو کاتژمێری نەخایاند. ئەوانەشی کە لەدوکانەکانەوە هاتبوون سەرو ١٥٠ ئێورۆی پێدان و خوا حافیزیمان لەوان کردوو ڕافی-مان هەڵگرتوو ٥٠٠ ئیورۆشمان دایە ئەحمەد و بەرەو ئاڕنێم هاتینەوە لە بەردەم ماڵی خۆیاندا ڕافی-مان دابەزاند بەرەو ماڵی فریاد ڕۆشتین، حوسێن بە ئەڵمانی بە ڕافی وت: بێیتە ئەڵمانیا قاچ و دەستت ئەشکێنم.
گەیشتینەوە ماڵی فریاد و نزیکەی کاتژمێر ٩ی شەو بوو، ئاڵتونەکەم پێبوو دامە دەست حوسێن وتم مافی خۆتی لێ هەڵبگرە و بیفرۆشە و پارەکەی بدەرەوە بە ئیقباڵ.
حوسێن: ئەی تۆ؟
ماکوان: من پارەم ناوێت، ئەگەر فرۆشتتان بەشی کاکە باز و سامان بدەن خۆ ئەگەر پێشتان خۆش بوو بەشەکەی من بدەن بە منداڵی هەتیوو. من سروشتم وایە ئەگەر زۆر بەدوای دەوڵەمەندیدا بگەڕێم ئیتر فەقیر و زۆر هەژار دەبم.
حوسێن: من ناڕۆم لێرە تا تۆ نەیەیتەوە بۆ ئەڵمانیا و لەماڵی مندا نان نەخۆیت و مەجلیسێکی زیکرمان بۆ بگریت، تەکیەمان هەیە لە کۆڵن دەبێت بێیت بۆ ئەوێ، چونکە من باسی کەرامەتی تۆم بۆ شێخەکەم کردووە.
ماکوان "قاقای پێکەنیم لێدا": کەراماتی چی و شێخی چی؟ تۆ تەواوی حوسێن گیان، من جنۆکەم لەگەڵدایە جنۆکە.
حوسێن: دەزانم، دەزانم، بەقوربانی خۆت و جنۆکەکانیشت بم، ناڕۆم هەردەبێت بێیت بۆ کۆڵن.
ماکوان: کاکە من نایەم بۆ کۆنڵ بەیانی زوو دەگەڕێمەوە.
حوسێن: بەخوا ناڕۆم، خۆ ئەگەر نەیەیت ئەو ئاڵتونانەش دەخەمە ناو ئەو دەریایەوە و نامەوێت.
ماکوان: باشە دێم، بەڵام من لە زیکر و تەکیە و ئەو شتانە نازانم سەیدا حوسێن بیکە بە خاتری خوا با توشی لەخۆبایبوون نەبم، من کەسێکی سادەم برای خۆم دێمە ماڵەکەت نان دەخۆم و دەڕۆم، باشە؟
فریاد: وەڵڵا بەیانی جومعەیە و منیش ناچم بۆ نۆرینگەکەم و دێین بۆ کۆڵن بۆ لای تەکیەکەی کاك حوسێن.

ماکوان: دە مادام وایە با سەیدا حوسێنیش نەڕوات ئەمشەو بەیەکەوە دەبین و بەیانی هەمووومان دەڕۆین.
حوسێن ڕازی بوو، تەلەفۆنمان کرد بۆ ئیقباڵ و زۆر خۆشحاڵ بووین ئەو شەوە من و کاکە باز کۆنکەنمان دەکرد، زوو زووش فریاد بە حوسێنی دەوت ئەوە شێخەکەتانە کۆنکەن دەکات.
بەیانی کەوتینە ڕێ بەرەو کۆڵن، حوسێن ئێمەی برد بۆ دوکانەکەی خۆی نان و چای بەیانیمان لای ئەو خوارد تا نیوەڕۆ من لە بازاڕ بووم لەگەڵ کاکە باز و فریادا.
کاکە باز: کاکە سور، توزاتی خوا منیش حەزدەکەم ئەو جنۆکانەی هاوڕێت ببینم.
ماکوان: ئاخر خۆ بەدەست من نییە.
کاکە باز: ئەی چۆن دێن بۆ لات و ئەم زانیارییانەت ئەدەنێ؟
ماکوان: بەخوا نە بانگیان دەکەم نە داواشیان لێدەکەم، هەر وەکو هاوڕێیەتی دەیکەن، تۆ ئەگەر هاوکاری من بکەیت و بزانی پێویستم بەشتێکە پێویست دەکات پێت بڵێم؟
کاکە باز: نەوەڵڵا کاکە سور لەخزمەتام.
ماکوان: دەوەڵڵا ئەوانیش لە خزمەتمان.
کاکە باز: ئەی چۆن بیانگرم و بینە هاوڕێم.
ماکوان: بۆ وا دەزانی ڕیشۆڵەن بیانگری؟ ئەوان ناچن بۆ لای هەموو کەسێك ئەوەی خۆیان مەبەستیان نەبێت.
کاکە باز: ئەی چۆن دێن بۆ لای تۆ، بۆ تۆیان مەبەستە؟
ماکوان "بە پێکەنینەوە": ئاخر من لە زمانیان دەزانم.
فریاد: هەر بەڕاستیمە ماکوان ئەوانیش خاوەن زمانی تایبەتی خۆیانن یاخود وەکو ئێمە قسە دەکەن؟
ماکوان: لەگەڵ مندا بە زمانی خۆمان قسە دەکەن، قسەیان لەگەڵ کردووم بە عەرەبی و کوردی و نەرویجی.
فریاد: ئەی خاوەن زمان و نوسینی خۆیانن؟
ماکوان: بەڵێ؛ پێم وایە خاوەن زمان و نوسینی خۆیان بن.
فریاد: ناوی چییە نوسین و زمانەکەیان؟
ماکوان: زمانی جنۆکە و نوسینی جنۆکە.
فریاد: چۆن بزانین و ببینین؟
ماکوان: یەك نوسخە هەیە ئەمریکا کڕیویەتی لەوێیە، کاتی خۆی ئیسپانیا ١٠٠٠ دانەی لێ چاپ کرد یەك کتێبیان لێ فرۆشت بە ٨٠٠٠ دۆلار.
فریاد: باسی چی دەکات ئەو کتێبە؟
ماکوان: شەش بەشە.
بەشی یەکەم: باسی گژو گیا و دەرمان و جۆری سیحرەکانی دەکات، ئەو گژوگیایانەی کە باسی دەکات زانایان لەسەر زەویدا تا ئێستا نەیاندۆزیوەتەوە.

بەشی دووەم: باسی فەلەك و گەردون ناسی دەكات، باسی دوانزە سەرچاوەی گەردونی دەكات لەگەڵ تەختی زەوی بەخڕی و باسی بورجەكان دەكات.
بەشی سێیەم: زیندەوەرزانی (احیاء) باسی كۆمەڵێك ئافرەتی ڕووت دەكات كە بەستراون بەیەكەوە لەڕێگای بۆری ئاوەوە، وێنەی ناو سكی مرۆڤ و هەموو ئەندامەكانی ناوەوەی لاشەی.
بەشی چوارەم: كێشانی وێنەی زەوی بە تەختی و بە شێوەیەكی زۆر ئاڵۆز و وێنە و جوگرافیای زەوی كە پێك هاتووە لە ٦ دورگە، وەكو ئەوەی پێناسە بێت بۆ كیشوەرەكان.
بەشی پێنجەم: بریتیە لە بەشی دەرمان سازی وێنەی جۆرە ڕەگ و گیا و جۆرە دەرمانێكی عەطاری، لە بابەتی هاڕاو بەهارات.
بەشی شەشەم: پێناسە، هەر پێناسەیەك و ئەستێرەیەك لە تەنیشتیەوە دانراوە.
فریاد: نوسینەكە چۆنە؟
ماكوان: لە لای چەپەوە دەست پێدەكات، بۆ لای ڕاست.
فریاد: تۆ لە كوێ بینیووتە؟
ماكوان: لە مەملەكەتی خۆیان.
فریاد: تێناگەم؟
ماكوان: مەملەكەتی جنۆكەكان.
فریاد: چۆن چوویت؟
ماكوان: لە سلێمانیەوە بۆ مەملەكەتی ئەوان.
فریاد: بۆ سلێمانی؟
ماكوان: پروا بكە لە ئیسكانەوە لە نزیك مەكەتەبی كاوە بردیانم.
لەوكاتەدا پیاسەمان دەكرد لەناكاو ویرسان بەرەو ڕووم هات.

## ساحیرەكان و پەیمانی سولەیمان و موستیلەكەی

لەبازاڕ پیاسەمان دەكرد چاوەرێی حوسێن بووین بمان بات بۆ تەكیەیەك لە كۆڵن، نزیك عەسر بوو چاوەڕوانی نوێژی عەسرمان دەكرد كە قەسرو جەمعی بكەین پاشان بڕۆین بۆ نان خواردن بۆ تەكیە. لەگەڵ فریاد دا باس و خواسێكمان كردبوەوە لە باسی زمان و نوسینی جنۆكە كە ناسراوە بە (VOYNICH).

تا ئێستا هیچ كام لە زانكۆ و ئەكادیمیاكانی جیهان نەیان توانیووە ئەم پەرتووكە و كۆدەكانی بشكێنن و لێی تێبگەن كە باسەكەی چییە، ڤینچ یاخود ڤینش كە بەو شێوەیە دەخوێنرێتەوە. ئەم پەرتوكە و شێوازی نوسینەكەی جێگای پرسیاری ملیۆنەها خەڵكی سەر زەویە. لەم قسانەدا بووین لەگەڵ فریادا لە دوورەوە ویرسانم بەدی كرد ڕووەو من دەهات.
ترسێك لە دڵمدا دروستبووبوو، چونكە ئەوەندەم ئازار خواردبوو بەدەستیان بۆیە هەوڵمدا خۆمی لێ گێل بكەم و وانیشان بدەم نەمدیووە.
بەجێم هێشت و دیسان ئاوڕم بۆ دواوە دایەوە نەمابوو، پاشان سەرم بەرز كردەوە دووبارە بینیمەوە بەلام ئەمجارە لە دووری چەند مەترێك دیسانەوە ڕووەو من دەهات، بۆ جاری دووەم خۆم لێ بێدەنگ كردەوە. لەو كاتەدا فریاد و كاكە باز پرسیان: بۆ وا شڵەژاویت؟
ماكوان: نا- هیچ نییە، لێرەدا بوەستن ئێستا دێمەوە لاتان، بۆ جاری دووەم لێم ڕەت بوو، وام دانابوو ئەگەر بیبینمەوە ئەمجارە منیش ڕووەو ئەو دەچم. دیسانەوە بینیمەوە وەكو یاری كردن و تێكدانی باری دەرونیم ڕەفتاری لەگەڵم دەكرد، هاوڕێكانم جێهێشت و ئەم جارە من بەرەو ڕووی ئەو ڕۆیشتم بەپەلە، كە زانی من دوای كەوتووم ڕێگاكەی گۆری و ڕۆشتنەكەی خێراتر كرد. ناو بازاڕی كۆڵن زۆر قەرەباڵغ بوو، منیش هەر شوێنی كەوتم تا چووە جێگایەك كە تاڕادەیەك خەڵكی كەم لێبوو، لە پشتیەوە هاوارم كرد ویرسان! كە ئاوڕیدایەوە ووتی: ماكوان بزانە ئەم شەو چیت بۆ دەكەم.
بەقسەم بكە قەت ئەو هێزەت لە دەست مەدە. هەركە وای وت لەبەرچاوم نەما.
لە كۆدەكەی تێنەگەیشتم و دووبارەم دەكردەوە بەڵكو شتێكی لێ تێبگەم و بزانم مەبەستەكەی چییە، ( ماكوان ئەم شەو بزانە چیت بۆ دەكەم، بەقسەم بكە و قەت ئەو هێزەت لە دەست مەدە)
گەڕامەوە بۆ لای هاوڕێكانم و لەگەڵیاندا كەوتینەوە قسە، دووبارە پرسیاریان كرد كە چی ڕوویداوە؟
ماكوان: یەكێك لە جنۆكەكانم بینیەوە بە كۆد قسەی بۆ كردم و جێیهێشتم.
فریاد: باشە بۆ ئەم جنۆكانە دێن بۆ لای تۆ؟
ماكوان: جا چی بكەم، ئیتر بۆلای كەسێك دەچن كە خۆشی لێیان نایەت ئەگەر حەز دەكەیت پێیان دەڵێم، بەڵكو هەڵت بژێرن و بێن بۆ لای تۆش.
فریاد: بیكە لەڕای خوا شتی وانەكەیت من نامەوێت.
كاكە باز: من كەسێك دەناسم لە سلێمانی ناوی شێخ لازۆیە زۆر تەواو نییە لە ڕووی لاشەو جسمەوە كەچی زۆر شتی عەجیب و سەرسوڕهێنەر ئەنجام دەدات، نوشتە دەنوسێت و شێت چاك دەكاتەوە و نەخۆش چارەسەر دەكات...هتد
ماكوان: ئەوە بزانە، زۆرێك لە جنۆكە شەیتانەكان دەچن بۆ لای ئەو كەسانەی كەم ئەندامن و ئەوان هەڵدەخەڵەتێنن، چونكە لە ژیان بێزارن. ئەو

توانا و هێزە ئەدەن بەوان لەڕێگای ئەوانەوە كاری سیحر و خورافیاتەكانیان ئەنجام ئەدەن و خەڵك كافر دەكەن. ئەگەر تەماشا بكەن لە هەموو جیهاندا زۆرێك لەوانەی كە دەردەكەون بە كاری سیحر و جادووبازی و شتی زۆر سەرسوڕهێنەر لەو كەسانەوەیە كە یان قەمورن، یاخود توانای ڕۆشتنیان نییە، یان لاڵ و كەڕن ...هتد.
بەناوی شێخ دەریان دەخەن و كاری خراپ و كوفر لە ڕێگای ئەوانەوە دەكەن، جا كاكە باز ئەگەر نەخۆش چاك دەكاتەوە خێرە ناتوانێت خۆی چاك بكاتەوە؟
كاكە باز: من جارێك هەمان قسەی تۆم بەو شێخە ووت، لەوەڵامدا وتی ئێمە وەكو نیشانەیەك وامان لێكراوە تاكو خوا لە ڕێگای نوقسانەكانەوە ساغەكان چاك بكاتەوە وە بۆ ئەوەی ڕێزی كەم ئەندام و خاوەن پێداویستی تایبەت بگیرێت.
ماكوان: ئەو قسەیە بۆ دەرباز بوونە لە سیحرو جادووەكەی، ئەی بۆ كەم ئەندامەكانی تر ناتوانن ئەوە بكەن؟ تەماشا بكەن زۆرێك لەو ئافرەتانەی كە داوێن پیسن و كاری فاحیشە دەكەن دوای ئەوە دەست دەكەن بە فاڵگرتنەوە و نوشتەو سیحرو جادوو، لە زۆرێك لە شارەكانی كوردستان ئەو دیاردەیە دەبینین. ئافرەتی داوێن پیس خەڵك دەچێت بۆ لای لەهەمان كاتدا دەستی لەگەڵ دەزگا ئەمنی و بەرپرسە داوێن پیسەكانیش تێكەڵ كردووە. هەر كەس لە گەڕەك و كۆڵانەكانیاندا قسەیەكیان پێبڵێت خێرا دەیدەن بەگرت، ئەوانەشی كە داوێن پیسن لە شارو شارۆچكەكاندا دەزگا ئەمنی و بەرپرسەكان دەیانپارێزن بە هۆكاری حەزە شەهاوانیەكانی خۆیان.
كاكەباز: وەڵڵاهی ماكوانی برام ڕاست دەكەیت لە شارۆچكەی سەیدسادق ئافرەتێكی وا دەناسم، هەمان كار دەكات كە تۆ باسی دەكەیت داوێن پیسە و خەریكی فاڵگرتنەوە و سیحر كردنە، تەنانەت مێردەكەشی دەزانێت.
ماكوان: ئەی چۆن قبوڵ دەكات كە دەزانێت ژنەكەی فاحیشەیە؟
كاكە باز: وەڵڵا دەڵێ ئەگەر تەڵاقی بەم من منداڵم پێ بەخێو ناكرێت.
ماكوان: هەر وایە لەوانەشە كێشەیەك بۆ مێردەكەی دروست بكات لە ڕێگای سیحرو جادوو و داوێن پیسی خۆیەوە، پێویستە ئەوانە وێنەیان بگیرێت بە دزیەوە و وەزارەتی ناوخۆیان لێ ئاگادار بكرێتەوە.
كاكە باز: لەشاری سلێمانی دانەیەكی لێبوو دەیووت من موستیلەكەی سولەیمانم پێیە، بەرپرسی حیزبێك هاتبوو بۆلای ١٨ دەفتەر دۆلاری پێدابوو نەیئەدایە، ساحیرەكە داوای ٢٥ دەفتەری لێدەكرد. ئەی ئەوە چییە كاكە سور؟
ماكوان: ئەویش درۆ دەكات، ئەوە موستیلەیەكە بە شێوەی ئەستێرەیەكی پێنج چوكولەیی، یاخود خوماسی بسم الله الرحمن الرحیم لەسەر نوسراوە. ئەوە زیاتر ساحیرەكان بە كاری دەهێنن هیچ پەیوەندی نییە بە حەزرەتی سولەیمانەوە هەمووی درۆ و دەلەسەیە.
كاكە باز: ئەی توخوا پێم بڵێ ٧ پەیمانەكەی سولەیمان چییە؟

ماکوان: ئەمانە چۆن دەزانی کاکە باز، کەی تۆ تاقەتی ئەو شتانەت هەبووە؟
کاکە باز: وەڵڵا ڕاستیت ئەوێت من ژنم هێنا لە کوردستان هیچ کێشیەکم نەبوو لە ڕووی جنسییەوە، بەڵام ئەو خێزانەی خۆم کە بەقەدەر هەردوو چاوم خۆشم دەویست دەهاتە لام یەکسەر لە پیاوەتی دەکەوتم، ئیتر ناچار وازم لێهێناو جیابووینەوە. ئەو کچە زۆر گوناحیش بوو، بۆ زانیاریشت لەوانەیە چوبێتمە لای ٥٠ دانە لەم ساحیرو جادووبازانە بۆ ئەوەی ڕزگارم بێت. یەکێك دەیووت بەستراوی، ئەوی تر دەیووت سیحرە بە قژی ئافرەت، یەکێکی تر دەیووت تۆجادوو لەجلوبەرگەکەت کراوە. ئیتر ماکوان ماندووبووم دەستبەرداری خێزانەکەم بووم.
بەدڵ پڕییەوە بۆی دەگێڕامەوە..
ماکوان: ئەی فریاد دەزانێت؟
کاکە باز: بۆم باس کردووە.
فریاد: باسی کردووە لەڕووی پزیشکی و زانستیەوە چەندین جار وتوومە پڕۆ پشکنین بکە، بەڵام دەڵێت هیچ کیشەم نییە.
ماکوان: ئەی بۆ ناچیت بۆ لای دکتۆر؟
کاکە باز: ئێ ماکوان هیچ عەیبم نییە.
ماکوان: یەعنی مضبوطی؟
کاکە باز: زەوق و توانا سێکسیەکانم عەیبی نییە، بە هەموو شتێکی ئافرەت ئارەزووم بێت ئەوروژێم و ورژاندوشمی.
ماکوان: سەیرە، تۆ بڵێی سیحرت لێکرا بێت؟
کاکە باز: وەڵڵاهی نازانم ئەوەیە کێشەکەم، بەڵکو بەو جنۆکانەی هاوڕێت بڵێیت بۆم چارەسەر بکەن لەڕێگای ئەو دەردەمەوە دوعایەکیان بۆ کردووم بەناوی حەوت پەیمان و عەهدەکەی سولەیمان لەوە دەزانم کە ئەوەش هەیە.
ماکوان: وەڵڵا براکەم ئەوەش شیرکە و خورافیاتەو نە پەیوەندی هەیە بە سولەیمان پێغەمبەرەوە سەلامی خوای لێبێت نە هیچ، ئەوە شیرکەو هەر کەس ئەوە هەڵگرێت موشریکەو هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە.
کاکە باز: ئینجا خۆ من هەمیشە پێمە و ئەوەندەی دەمانچەیەك بە گرنگی دەزانم بۆیە هەڵمگرتووە.
ماکوان: بیکە لەڕای خوا فڕێی بدە ئەوە هەموو شیرکو کوفرە، کوا بمدەرێ ؟ با جنۆکە هەلا هەلات نەکات، ویرسان بزانێت لە ڕێگای تۆوە دێت بۆ لای من و تۆش وێران دەکەن.
کاکە باز: بەڕاستە؟ وەڵڵا نەم زانیبوو، ئەی چارە؟
ماکوان: من پێموایە دەبێت تەوبە بکەیت و موسوڵمان بوونی خۆت ڕابگەیەنیت چونکە بەو کارانەت کافر بوویت لە ئیسلام دەرچوویت، هەر کەس پڕوات بۆلای ئەو ساحیرو جادووبازانە پێی کافر دەبێت.
کاکە باز: لەئێستاوە تەوبە دەکەم و هەزارجار استغفرالله.

ماکوان: بەسەرچاو هەوڵئەدەین کێشەکەت بدۆزینەوە لەگەڵ فریاد، ئەگەر بزانین سیحرە بەتاڵی دەکەینەوە، ئەگەر نەخۆشیش بێت ئەوە لەڕێگای دەرمانەوە چارەسەر دەکرێت، بەڵام پێم باشە سەرەتا بچیتە لای دکتۆر وە خێزانەکەشت ئەگەر تەڵاقت نەداوە بگەڕێنیتەوە بۆ لای خۆت.
کاکە باز: وەکو تەڵاق، تەڵاقم نەداوە، بەڵام ئەوە ماوەی مانگێکە هاتوومەتەوە بۆ ئەوروپا لەداخا سەری خۆم هەڵگرتووە، خێزانیشم هەر لە کوردستانە لە ماڵی باوکیەتی. بەڕاستی کاکە سور زۆر شەرمەزارم نازانم چی بکەم لەئاستی ئەو ئافرەتەدا، زۆر خەفەتم خواردوو خەفەتی خوارد، ژیانم تێك چووە چیم لێدەکەن؟
ماکوان: ئەوەی بەمن بکرێت سوارە گیان کەمتەرخەمی ناکەم، بە پشتیوانی خوا چارەسەری دەکەین و زۆریش ئاسانە، دەبوو زوو قسەت بکردایە، ئێستا خێرا تەلەفۆن بکە بۆخێزانت و دڵی بدەرەوە، خۆشەویستی زۆری بۆ دەربڕە و بڵێ بۆیە گەڕاومەتەوە مانای وانیە دەستم لە تۆ بەردابێت، بەڵکو هاتووم چارەسەری خۆم بکەم، ئەی وەزعی ماددیت چۆنە؟
کاکە باز: وەڵڵا ژێر سفرم جاروبار فریاد هاوکاریم دەکات.
ماکوان: وەرە با تا ئەو بانکە بڕۆین، چووین ٥٠٠ ئێورۆم بۆ دەرهێنا، تەلەفۆنم لەگەڵ دایکم کرد کە ١٠٠٠ دۆلار بداتە خێزانی کاکە باز.
چووین بۆ نوێژ و لە مزگەوت نوێژمان کرد دوای نوێژ بە کاکە بازم ووت: تەلەفۆن بکات بۆ خێزانی.
کاکە باز تەلەفۆنی کرد بۆ خێزانی و لە دوورەوە ئاگام لێی بوو دەگریا، من و فریادیش وا خۆمان نیشان دا کە ئاگامان لێیی نییە، هاتەوە بۆ لامان و هەستمان کرد خۆشی و دەم بە پێکەنینی زیاتر بوو زۆر لە پێشووتر ئارامی دڵ و دەروونی پێوە دیار بوو.
حوسێن تەلەفۆنی بۆ کردین وتمان لە مزگەوتین.
حوسێن: ماکوان هەموو تەکییە چاوەڕێن بچین بۆ ئەوەی زیکر بکەین، مەڕۆن من دێم بە شوێنتاندا لە مزگەوت بن.
ماکوان: بەخوا من حەزم بەو جۆرە کارانە نییە و لە ژیانیشمدا نەچوومەتە تەکییە و خانەقا، من بۆ خۆم هەر بڕوام بەو شتانە نەبووە، بابچین بەڵام شتێك بدۆزینەوە کە بتوانین لەوێ خۆمان بدزینەوە. لەگەڵ ئەو جەوانەدا ڕانەهاتووم و حەزم پێیی نییە.
فریاد: باشە ئەچین بەدڵمان بوو دادەنیشین بە دڵمان نەبوو زوو هەڵدەستین و دەڵێین ئیشمان هەیە.
ماکوان: چی بکەین بۆ سوارە، نابێت هەروا بڕوات تۆ دکتۆری فریاد پرسیاری لێبکە بزانە چییە؟
فریاد: یەك دوو جار پێم وتووە با پشکنینت بۆ بکەین بزانین چییە، بەڵام بەلالوتەوە وەڵامی داومەتەوە وەکو ئەوەی پێی ناخۆش بێت، ئیتر منیش قسەم نەکردووە و بەدوایدا نەچومەتەوە.

ماکوان: ڕوومکردە کاکە باز، نابێت بەسەرتدا پرواتا بەیەکەوەین دەبێت چارەسەری ئەمەی تۆش بکرێت باشە؟
کاکە باز: چی دەڵێن لەخزمەتاندام ئەوەی ئێوە دەیڵێن لەقسەتان دەرناچم، بەڵکو خوای گەورە بیکات بە بەهار شاد ببمەوە، بەخوا زۆر بێزارم و بەهاریشم زۆر خۆش دەوێت ماکوان.
ماکوان: بەهار کچی کێیە؟
کاکەباز: کچی وەستا تاهیری کۆستەرە.
ماکوان: ئێ خۆ ئەوە ئەو کچەیە کە لەکاتی قوتابخانەی ناوەندیەوە دڵتان بەیەکەوە بوو، بیرتە بە کۆڵانەکەیاندا دەڕۆشتین، ئێواران لەبەردەم دوکانەکەی مندا گۆرانی بەهار هاتەوە گیان، بەهار هاتەوەت دەخستە سەر کە دەهاتەوە لە قوتابخانە "بە پێکەنینەوە دەمگێڕایەوە" ئەویش دایە گریانێکی قوڵ و جێی هێشتین، ئیتر زانیم زۆر بریندارە بۆیە زۆر بەزەیم پێداهاتەوە، بۆ فریادم گێڕایەوە ئەو کوڕە لە منداڵیەوە ئەو کچەی خۆش دەویست، بەڵام زۆر هەژار بوون ساڵی ١٩٩٧ پێش من دەرچوو، لەبەر هەژاری کاکە باز شەش ساڵی پێچوو تا گەیشتە ئەوروپا خۆی کارو کەسابەتی دەکرد، پێی دەرچوو هاوکاری ماڵەوەشیانی دەکرد، نابێت بهێڵین ژیانی تێك بچێت.
فریاد: چی دەڵێیت دەیکەین، من کاکە بازم زۆر خۆش دەوێت لەڕێگا کە هاتم چوومە ئەسینا تەنها کاکە باز بوو هات بەدەممەوە لەوێ ئەویش دەری کردم بە خۆرایی لە پاترا.
حوسێن هات بەشوێنماندا و منیش کابۆیەك و کراسێکی ڕەش و چاکەتێکی چەرمی ڕەشم لەبەردابوو لە شۆفێری ماتۆڕ دەچووم، کەڵکی ئەوەم پێوە نەبوو بڕۆم بۆ تەکییە و ئەو جێگایەنە بۆیە داوام کرد لە حوسێن کە بچم خۆم بگۆڕم چاکەت و پانتۆڵ لەبەر بکەم.
دوای ئەوەی کە خۆم گۆڕی و چوین بەرەو تەکیە هەر چووینە ناو تەکیەکەوە من وا هەستم دەکرد دەچین دەستی شێخەکەیان ماچ دەکەین و ئەوان زیکرو تەهلیلەو دەف لێ ئەدەن.
منیش وەکو کەسێکی ئاسایی فریاد و حوسێنم پێش خست و خۆم و کاکە بازیش بە تەنیشت یەکەوە دەڕۆشتین، کەچوومە ژوورەوە خوایە گیان چیم دی، یەك هاتوو هاوار دەستی پێکرد ئەوەندەم زانی هەموویان ڕووەو من هاتن. منیش خەریك بوو لە ترسا ڕاکەم، ووتم بەقورئان شتێکمان کردووە خۆمان پێمان نەزانیووە بۆیە وا هاتن بەرەو ڕوومان، ترسام لەوەی کە حوسێن پێی وتبێتن کە ئەمانە قاچاخ چین و بیانەوێت شتێکمان لێبکەن و ئاڵتونەکە بەرێت بۆ خۆی.
گەیشتنە لام ووتم کاکە باز چەقۆ، ئەبو ئەڵقە، دەرنەفیز، بۆکس خەنجەر شتێکت پێیە؟
کاکە باز: بۆچیتە؟

ماکوان: ئەو خەڵکە ڕووەو من و تۆ دێن بەپەلە، هەتیو هیچی خراپت نەکردووە؟
کاکە باز: نەبەخوا، چی بکەین ڕاکەین؟
ماکوان: پەلەمەکە بزانین چی ڕوودەدات، ئەگەر شتێك بوو ڕادەکەین باشە ؟ لەم قسانەدا بووین ئەو خەڵکە زۆرە هاتنە لامان و هەموویان پەلاماری دەستی منیان دا بەسەرە ماچیان دەکرد، منیش هەر لە بەرخۆمەوە دەمووت استغفرالله، یەك و دە و پەنجا نەبوو هەر تەواو نەدەبوون، لەدڵی خۆمدا وتم بەزاتی خوا دەموچاوم گۆڕاوە، کاکە باز دەم و چاوم ماکوانە ؟
کاکە باز: ئەی قابیلە بایەعەکەتان بێت، هەر خۆتی.
ماکوان: ئەی ئەو خەڵکە بۆ وا کەر بووە دەستم ماچ دەکەن، دەستم هەمووی تفە خەریکە ئەیکڕێننەوە. یرۆ بە حوسێن بڵێ نەجاتم بدات، بەخوا لێیان تێکچووە پێیان بڵێت ئەمە ماکوانە، ماکوان شێخەکەیان نییە.
حوسێن هات بەو خەلکەی دەووت: لە شێخ دووربکەونەوە با بێزار نەبێت، ئێستا قسەمان بۆ دەکات.
ماکوان: چپاندم بە گوێی حوسێن دا ووتم ئەو خەڵکە بۆ وادەکەن؟ منیان لێ تێکچووە لەگەڵ شێخەکەیاندا.
حوسێن: نا- نا سەیدا من باسم کردوویت، ئەو کەسەی کە یەکەم جار هاتە لات و دەستی ماچ کردی ئەوە شێخ عوبێدە شێخی ئێمەیە.
ماکوان: ئەوەی دەستی ماچ کردم منیش سەریم ماچ کردەوە ئەوە شێخی ئێوەیە؟
حوسێن: بەڵێ سەیدا.
ماکوان: ئەی بۆ دەستی من ماچ دەکات، ئەبێت من دەستی ماچکەم.
حوسێن: ئیتر تۆ شێخمانیت و طریقەت لە تۆ وەردەگرین.
ماکوان: ئەی قوڕ بەسەر خۆم، ئەو ماوەیەی کە من و فریاد و کاکە باز لە بازاڕ بووین حوسێن چووە بۆ تەکیەو درۆی وای کردووە بە دەمی منەوە کە گوایە من کەرامەتم هەیە و بەرماڵم بەسەر ئاوەوە دەگەڕێت، لە دوایدا بۆم دەرکەوت درۆی وای کردبوو قسەی وا قۆڕی کردبوو بەدەممەوە کە بەخەویش خۆم نەمدیووە. کورسی دانراو هەموو بە پێوە وەستابوون منیش وەکو پاشا و شتی وا خستمیانە سەر کورسی، ووتم: حەتمەن ئەمە مەشهەدەکەی وەیخڕ پاشایە.

# ویرسان و تەکیەی عەلەوییەکان

لە تەکیە لەسەر کورسی شێخایەتی دانرام و هەموو بەدەورمدا وەستابوون، منیش هەر دانەنیشتم ڕووم نەبوو لەخزمەت ئەو پیاوانە دابنیشم، دەستم کرد بە قسەکردن ئەوانیش هەموو بە پێوە بوون. دەبوو شێخەکە ڕێگەیان بدات تا دابنیشن، منیش ئەوەم نەدەزانی من لەبەر ئەوان دانەدەنیشتم ئەوانیش لەبەر ڕێزی من.
بەڵام ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا زۆربەی تەکیەکە وێنەی ئیمامی عەلی بوو.
هەموو تەماشای منیان دەکرد ناچار چوومە لای شێخەکەیان بە ناوی شێخ عوبێد پیاوێکی بەڕێز و بەتەمەن بوو هێنامە لای خۆمەوە پێم ووت دانیشە لەسەر کورسیەکە وەکو ڕێزێك کەچی ئەو منی دانا، من دانیشتم و هەمووی دانیشت، منیش خۆم بە مەلیك و پاشا هاتە بەرچاو تەریق بوومەوە هەڵسامەوە سەر پێ، هەرچی لەوتەکیەدا بوو هەڵسانەوە چووم سەری

شێخ عوبێدم ماچ کرد وەکو ئەدەبێك و دەستیم گرت و خستمە سەر کورسیەکەی و خۆم لە تەنیشتیەوە دانیشتم و هەموو دانیشتنەوە.
شێخ عوبێد: سەیدا شێخ قسە ناکەیت؟
ماکوان: قوربان استغفرالله، جەنابت زانا و مامۆستا و شێخی ئێمەن.
شێخ عوبێد: دەستی کرد بە قسەکردن و بە بسم الله دەستی پێکرد، بەڵام قسەکانی و پێشکیەکەی زۆر شیعانە بوو، بەخێرهاتنی منی کرد و خۆشحاڵی خۆیان دەرپڕی کە شیعانە قسەی کرد گومانێکم بۆ دروست بوو، ئینجا ئەو هەموو ڕەنگە سەوز و سورە تێکەڵ کرابوون، ئەو هەموو وێنەیەی ئیمام عەلی هەڵواسرا بوو. بیرم چوو بۆ ئەوەی کە ئەمانە بەدڵنیاییەوە شیعەن، بەڵام لەدڵی خۆمدا وتم با پەلە نەکەم تا کاتی نوێژی مەغریب ئینجا قسەی خۆم دەکەم.

شێخەکەیان هەندێك قسەی کرد لەدوای سڵاوات لە پێغمەبەر  پاشان چوو بۆ ئالو بەیت و ئینجا سڵاواتی نارد بۆ أبو شعیب محمد بن نصیر العبدي البكري النمیري، کە وای ووت زانیم ئەمانە تایفەی شیعەی عەلەوین و باطنی بوون.
لە دڵی خۆمدا وتم ئەی قوڕ بەسەر خۆم چۆن تێکەوتین.
هەڵسام بۆ ئەوەی هەرچیمان کردووە بڕۆین، هەر من هەڵسام هەرچی تێدابوو بە شێخ عوبێدیشەوە هەڵسانەوە. (لەدڵی خۆمدا) خۆ ئەگەر ڕاشکەم حەتمەن ڕادەکەن بە شوێنمدا. وتم ببورن دانیشن دەچم دەست نوێژ نوێ دەکەمەوە، کاتی نوێژ نزیکە. هەر وام ووت هەمووی بەدوامدا قوڵی هەڵکرد بۆ دەستنوێژ، لەدڵی خۆمدا وتم بەس نەبوو نەموت تارات دەگرم خۆ زێرابەکە دەگیرا.
هیچ چارەم نەما دانیشتنەکەیانم تێکدا و هەرچۆن بوو فریاد و کاکە بازم بانگکرد، کاکە فریاکەون چۆن بچینە دەرەوە؟
فریاد: بۆ چیبووە، تەماشای ئەو خەڵکە بکە چی ڕێزێکت لێدەگرن؟
ماکوان: ڕێزی ئەوانەم ناوێت، ئەوانە شیعەی عەلەوی باطنین، ئێمە و ئەوانە زۆرمان فەرقە.
فریاد: ماکوان بیکە بەخاتری خوا، ئەزانی چی ڕێزێکمان لێدەگرن تێکی مەدە و پاش کەمێکیتر دەڕۆین، ئاخر نابێت ئێستا بچینە دەرەوە، خۆ ئەمانە جولەکە نین موسوڵمانن.
ماکوان: ئەمانە جاهیلن موسوڵمانی چی زۆر خەتەرن لە بیرو باوەڕیاندا.
فریاد: باشە ناوی شیعەی عەلەویم بیستووە، ئەی باطنی چییە؟
ماکوان: باطنییەکان دوو کۆمەڵە بوون لە فاطمییەکان جیابوونەوە، کۆمەڵێکیان کوڕانی(مستعریە)یان پێ ئەوترێ، کۆمەڵەکەی تریش پێ یان ئەوترێ (نزاریە)، مستعریەکان توانیان سوڵتە و دەسەڵاتی فاطمی بگرن بەدەستەوە، بەڵام نزارییەکان لەڕێگای مونەزیرێکیانەوە کەناسراوە بە(حسن

کوڕی صباح) یان ابنو صباح لەگەڵ (ابنو عطاش)دا هەردووکیان جیا ئەبنەوەو دێن بۆ ناوچەکانی شام لەوێ بەدرۆ خۆیان بەئەهلی سونەت نیشان ئەدەن تا ئەچنە ناوجەرگەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، دوای ئەوەی چەند قەڵا و جێگا و قولەیەك ئەگرن لەموسوڵمانان لەوێدا دەوڵەتی خۆیان دروست ئەکەن،(حسن کوری صباح )یەکەم کەس بوو حەشیشەی دۆزییەوە بۆیە پێ یان ئەوترێ شیعەی حەشاشین یان شیعەی اسماعیلی حەشاشین، سەرەتا کە ئەم گوڵەی دۆزییەوە، باخچەیەکی دروست کردوو ناوی نا(بەهەشت) گوڵەکە ناوی خەشخاش، ئافرەتی ئەکردە ئەو باخچەیە بەردەوام خەڵکی خومار ئەکرد وە پێیانی دەوت ئەگەر ئێوە لەم بەهەشتە بمێننەوە بەخۆشی و شادی لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا ڕائەبوێرن و بەردەوام خوماریشن، هەر کارێکی پێ بکردنایە ئەی ناردن وە دواتر بەهۆی تلیاکەکەوە ئەبوایە گەڕابانایەتەوە بۆ لای حسن کوری صباح وە زۆربەی زۆریشیان ئەکوژران یان ئەگیران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وازیان نەئەهێنا لەبەرئەوەی حسن کوڕی صباح هەموویانی فێری تلیاك و حەشیشە کردبوو، بۆیە ئەمانە لەمێژوودا ناسراون بە (ئیسماعلی حشاشینی  باطنی) زۆربەی زۆری ئەهلی سوننە و جەماعەت بەدەستی باطنییەکان شەهید ئەبوون، ئەوە ئەو تواناو هێزە حەشیشەییە بوو کە لەو سەردەمەدا تازە دۆزرابوویەوە ئەمانە سەرەتای دروستبوونی باطنیەکانن لە ناو ئیسلامدا.

کاکەباز: واتا حەشیشەمان ئەدەنێ؟

ماکوان:  نا ئەوانە بەو هۆکارەوە ناسران و هێزیان پەیدا کرد، لەوانەیە ئەمانە هەر نەزانن چییە.

فریاد: ئەی عەلەوی چین؟ ئەوە هەموو دەست نوێژ دەگرن خۆ ئاو بەکارناهێنن بۆ وا وەستاون قسە دەکەن؟ پروا مەکە تا سەعاتێکی تریش بەرمانکەوێت، تەماشایان بکە خۆ  هیچی  قاچی ناشوات، سەیرە دەستونێژەکەشیان لەوەی خۆمان ناچێت، هیچیان لێدەزانیت؟

ماکوان:  کەمیك شارەزایانم لە ڕووی مێژوویەوە ئەو کەسەی کە ئەم بیرو هزرەی دامەزراند ناوی "أبو شعيب محمد بن نصير البصري النميري" لە ساڵی٢٦٠ کۆچی دامەزراوە، بەناوی ئەوەوە ناونرا نوصەیریەکان. ئەم کەسە تاوانبارترین کەسە لەسەر ڕووی زەوی ئەم بیر و باوەڕە لە شاری "حەلەب" لە سوریا دامەزرا. پاشان بڵاویان کردەوە بە جیهانی ئیسلامیدا دوو کەسی سەرەکی بوون کە یەکێکیان لە میسر بەناوی"أبو محمد عبد الله بن محمد الجنان الجنبلاني" ٢٣٥-٢٨٧کۆچی ئەوی تریشیان لەشاری بەغداد بەناوی "علي الجسري" ٢٣٠ کۆچی لە دایك بووە.

لە میسر بانگەشەی نوصەیری لە ناو دەوڵەتی عوبەیدیەکاندا پەرەی سەند تا دامەزراندنی دەوڵەتی حەمدانی لە حەڵەب و موسڵ، سەنتەری ئەم بیروباوەڕە لە شاری حەڵەب سەرچاوەی گرتبوو تا دوایی گواسترایەوە بۆ شاری "لازقيه" لە سوریای ئێستادا.

فریاد: بیروباوەڕیان چۆنە چۆن بیر دەکەنەوە لەخۆمان ناچن، وانیە؟
ماکوان: کورە زۆر ترسناکن ئەمانە، بیروباوەڕی عەلەویە نوصەیریەکان بەمشێوەیە دامەزراوە.
پڕوایان بە حلول و تنسیخ هەیە..
کاکە باز: حلول چییە؟
ماکوان: حلول: بریتیە لە تێکەڵبوونی ڕۆحی ئیمامەکانیان بە خوا، وە تێکەڵبوونی خوا لەگەڵ جەستەی ئیمامەکانیان، واتە: (خواو ئیمام بەیەکەوە حوکمی سەر زەوی دەکەن)؛ بۆیە پێیان وابوو کە ئیمام ئولوهیەتی خودای تێدایە.
(تنسیخ) واتە: (ئیمامەکانیان نامرن، ڕۆحەکانیان لە جەستەی تردا دێنەوە سەر زەوی و بەزیندوویەتی دەمێننەوە)، بەگشتی پێیان وایە ئیمامەکانیان لە دوای مردنیان دەگەڕێنەوە بۆ دونیا و بە هەمیشەیی دەمێننەوە، هیچ پڕوایەکیشیان بە قیامەت نییە، ئەوەی کە پێی دەوترێت زیندووبوونەوە لە ژیانی قیامەت لای نوصەیرییەکان هیچ بنەمایەکی نییە و بە ڕاستی نازانن، هەموو ڕۆحی مرۆڤەکانیش لە گیانلەبەری تردا دێنەوە ژیان لەسەر زەویدا ئەگەر کەسانی پاك بن ئەوا لە گیانلەبەرە جوان و پاکەکان دێنەوە سەر زەوی وەك پەپولەو ئاسك و چۆلەکە.. هتد، بەڵام ئەگەر خراپ بوون ئەوا وەك قالۆنچە و مشك و کرم دێنەوە سەر زەوی.
فریاد: جا ئەمە چۆن لکاندوویانە بەم ئیسلامەی ئێمەوە؟
ماکوان: ئەم فیکرەیە لە دوای زەمەنێکەوە دادەمەزرێت کە لە مێژوودا ناونراوە بە (حیرة الشیعە) لە دوای مردنی "حەسەن عەسکری" کە منداڵێکی بە جێهیشت لە دوای خۆی بە ناوی محمد کوڕی حەسەنی عەسکری لە لای شیعەکان ناسراوە بە "موحەمەدی مەهدی" بە نەخۆشی کۆچی دوای کرد، ئیتر هیچ ئیمامێکیان نەما لەناویاندا لە ساڵی ٢٦٠ کۆچی بۆ ئەوەی بزوتنەوەکەی بەردەوام بێت بۆ دەسەڵات دژی عەباسی و ئەمەویەکان. ئەم بزوتنەوەیە سەرەتا هیچ سەرچاوەیەکی لە بیروباوەڕی نەبوو تەنها بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێری بوو، بۆ دەسەڵات هەوڵی ئەدا و بەناوی بنەماڵەی پێغەمبەرەوە  دەسەڵات وەربگرێت، ئیتر لەو سەردەمەوە چەند بیروباوەڕێك بڵاوکرایەوە کە گوایە محمد کوڕی حەسەن عەسکەری ناسراو بە مەهدی چۆتە شاخێك لە "سەماڕا"و دوایی خۆی کردووە بە سەردابێکدا یان ژێر زەمینێکدا. ئیتر لەو سەردەمەوە لەو سەردابەدا دەژی تا ئێستا نەهاتۆتە دەرەوە وا بڵاوکرایەوە کە چوار کەس دەچن تشریع و ئامۆژگاری لەم ئیمامە وەردەگرن کە ڕاستەخۆ شیعە لەلایەن ئەوەوە ئاراستە دەکرێن مەهدیش ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە وەحی بۆ دێت، ئەو چوار کەسە ناسراون بە " باب المهدی" واتا دەرگاکانی مەهدی یاخود بە "سفیر المهدی" واتا سەفیرەکانی مەهدی بۆ خەڵك.

ئەم فیکرە بڵاوبوویەوە لەناو شیعەدا بەگشتی، بەڵام لەدوای ئەوەی کە محمد نوصەیری ئەم باوەڕەی گۆڕی وای بڵاوکردەوە کە ئەو بۆ خۆی بە تەنها لەگەڵ مەهدی قسە دەکات و هیچ سەفیر و دەرگایەکی نییە جگە لە محمدی نوصەیری، پاشان بەوەشەوە نەوەستا محمدی مەهدی کردە خوا و خۆشی کردە نێدراوی ئەو کە گوایە پێغەمبەرە، پاشان زیاتر ئەم باوەڕە خورافیەی نوسیەوە بە ناوی ئەوەی کە عەلی کوڕی ئەبوتالیب خوایە و محمدی پێغەمبەری ناردۆتە سەر زەوی، نوصەیرییەکان کە ئێستا ناسراون بە عەلەوەی پاشان وایان بڵاوکردەوە کە سەلمانی فارسیش خوایە، چونکە دەبێت بنەمایی ئەم فیکرە بگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی فارسەکان لە ڕێگای "أبو محمد عبد الله بن محمد الجنان الجنبلاني" کە بۆ خۆی فارسە بە راهیبی فارسی ناسراوە، چۆتە میسر و ئەم بیروباوەڕەی لە هاوڕێکەیەوە بڵاوکردەوە محمدی نوصەیری، دوای ئەوەی کە بڵاویان کردەوە عەلی خوایە، پاشان خوایەتی داوە بە سەلمانی فارسی، دوای ئەوە سەلمانیش پێنج خوای تری دروست کردووە بۆ ئەوەی کاروباری ئیداری ئەم کەون و بوونە بەڕێوەبەرن بە ناوەکانی:
یەکەم: مقدادی کوڕی ئەسوەد: کە ئەمەیان خوای هەورە بروسکەیە باران و بەفرو ڕوبارو...هتد.
دووەم: ئەبوو زەری غیفاری: خوای رۆژو ئاسمان ئەستێرەکانە کە دەبێت بیانسوڕێنتەوە ئاگاداری ئەم کەونە بێت.
سێیەم: عەبدوڵای کوڕی رەواحە: ئەمیان خوای با و ڕۆح کێشانە بۆ ئەم کارە دانراوە لە لایەن سەلمانەوە.
چوارەم: عوسمانی کوڕی مەعزوم: ئەمیش سەرما و گەرما و نەخۆشی مرۆڤەکانی بەدەستە.
پێنجەم: قەنبەری کوڕی کادان: ئەمیش ڕۆح کێشان و خستنەوەی ڕۆحی مرۆڤەکان بە گیانلەبەرانی تر وەك تەنسیخ کە بۆم باسکردن.

کاکە باز: کاکە ئەوە دەست نوێژ ناگرن، ئەوە دەستنوێژ نییە ئەوە چی دەکەن؟
فریاد: بەخوا زۆر تەماشایان دەکەم لەو کاتەوە هەندێکیشیان دەمو چاو ناشۆن.
ماکوان: برایان ئەمانە زۆر پیسن  با ڕاکەین، دواتر ئەو ئاڵتونەش لە حوسێن دەسێنینەوە. نوێژی چی و دەست نوێژی چی ئەمانە هەر بیروباوەڕیان بەناو ئیسلامە.
_ غوسڵ و لەش پیسی و دەستنوێژیان نییە.
_ لە نوێژدا سوجدە نابەن بەس ڕکوعیان هەیە، نوێژیان وەك نوێژی موسوڵمانان نییە، پێنج فەرزەی نوێژ واتا ( عەلی، حەسەن، حوسێن،

موحسین و فاتیمە) وشەی محسین کە بەکاریدێنن ڕەمزە بۆ دەستنوێژ و غوسڵ.
_ بڕوایان بە حەج نییە ئەوەی بچێتە حەج بە کافری دەزانن پێیان وایە موشریکن و خەریکی بت پەرستین.
_ پیاوانیان ڕۆژو ناگرن تەنها رۆژو لەسەر ئافرەتان فەرزە.
_ شەراب لایان زۆر پیرۆزە، خواردنی بە بەندایەتی دەزانن ڕێزی ڕەزە ترێ و ترێ بە گشتی دەگرن و پیرۆزە لایان.
_ بڕوایان بە زەکات نییە، بەڵام پارەیەك دابینكراوە لە لایەن شێخەکانیانەوە کە دەبێت وەك زەریبە ساڵانە بیدەن.
_ رقیان لە هاوەڵانی پێغەمبەرە  بەگشتی و بە بەندایەتی دەزانن جنێو بدەن بە ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان و خاتوو عایشەی دایکی موسوڵمانان ڕەزامەندی خوا لە هەموویان بێت.
_ لە کاتی شایەتومانیاندا پەنجە بەرز دەکەنەوە ئەم سێ وشەیە دەڵێن (ع،س،م) کە ڕەمزێکی عەلەویەکانە.
_ دەڵێن سەلمانی فارسی قورئانی فێری محمد کردووە لە ژێر ناوی جوبرئیل دا.
_ عەقیدەیان باطنیە هەموو کەس بۆی نییە لێی بکۆڵێتەوە تەنها زاناکانی خۆیان نەبێت، ئەوەی کە ظاهیرە بۆ گشتی دەریدەخن.
فریاد: ئەی ماکوان ئەمانە ڕێز لە تۆ دەگرن بۆ شتێك ناکەی، بەڵکو خوا هیدایەتیان بدات.
ماکوان: ڕەوشەکە زۆر لەوە ترسناکترە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە، دەبێت شتێك بکەین بۆ دەرچوون لێرە بەبێ ئەوەی کەس بزانێت و دڵی حوسێنمان لێ بێشێت.
کاکە باز: کافرن ئەمانە؟
ماکوان: لەبەر ئێوە قسەم نەکرد، بەدڵنیاییەوە کافرن. جولەکە و یەهودی باشترن لەمانە.
فریاد: بیکە لەڕای خوا باسی چی دەکەیت؟
ماکوان: بڕوا بکە زۆر موجریمن تایفەیەکی زۆر ترسناکن، ئەمە مشتێکە لە خەروارێك نوصەیرییەکان کە ئێستا ناسراون بە عەلەویەکان و لە سوریا حوکمی ئەو خەڵکە دەکەن بە ئاگر و ئاسان، کوشتنی ئەو ٦٠ هەزار کەسەی بە دەستی بەشاری موجریم شەهید بوون، عەلەویەکان بە بەندایەتی دەزانن بۆ خۆیان، لە سەردەمی باوکی تاوانباری کە ناسرابوو بە حافز ئەسەد ٣٠ هەزار کەسی لە شاری حمص شەهید کرد، لەگەڵ ئیسرائیل دا دەستیان تیکەڵە و لە ڕێگای شیعە دورزیەکانەوە بەشدارن لە حوکومەتی ئیسرائیلی لە ناو کەنیسەتدا بەناوی شیعەی دورزی کە سەرۆکەکەیان باوکی وەلید جومبلاطە، ئێستا وەلید سەرۆکایەتی ئەو تایفە شیعەیە دەکات.

ئەم تایفە شیعە تاوانبارە ناسراون بەنوصەیری(عەلەوی) ئەمانە لە ئێستا کەمینەی ناو سوریان لە ساڵی ١٩٨٥کە سەرژمێری سوریا کراوە پێك هاتوون لە ١١٪ کە لەڕاستیدا ئەم ژمارەیە هیچ ڕاستییەکی تێدا نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا ٥٪ی دانیشتوان پێك دەهێنن، ئەو ژمارە زۆرەی کە دانراوە تەنها بۆ ئەوەی رای گشتی پێ چەواشە بکەن، ناوی عەلەویش بۆ پیرۆزی نوصیرەییەکان ئیستعماری فەڕەنسی ئەم ناوەی بۆ داناون کە هەموو مێژووەکەی ناگەتە ١٠٠ ساڵ، ڕاستی ناوی ئەم تایفەیە نوصیریە نەك عەلەوی.

فریاد: ئایا ئەم تایفەیە کافرن یان موسوڵمان؟

ماکوان: بەدرێژایی مێژووی ئەم ئیسلامە کە ئەم گروپە دەرکەوتن هیچ کاتێك لەلایەن زانایان بە موسوڵمان هەژمار نەکراون.

زانایان بە گشتی دەڵێن: بە هیچ شێوەیەك سەرپراویان دروست نیە و نانی دەستیان ناخورێت، ژن و ژنخوازیان لەگەڵدا دروست نیە، نوێژیان لەسەر ناکرێت و لە گۆرستانی موسوڵمانان نانێژرێن، بەهیچ شێوەیەك پاسەوانی و سەنگەرنشینیان پێناگیرێت لەگەڵ موسوڵماناندا، ئەمە ڕای زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەیە.

لەبارەیانەوە شەیخول ئیسلام پیاوچاکی کوردان قەڵەمی ئەم ئومەتە ئیبن و تەیمیە دەفەرموێت:[٢]

ئەم گەل و هۆزە کە ناسروان بە نوصەیری، بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ شیعەی قەرامیطە- کافرترن لە یەهود و نەسارا، بەڵکو کافرتریشن لە هاوبەشدانەرەکان (موشرکین) زەرەرمەندیان بۆ موسوڵمانان لە زەرەری کافری شەڕکەرە هاوشێوەی تەتار و فرنجە و سەلیبیە کە دونیای ئیسلامیان تێکوپێك دا، ئەمانە خراپترن لەوانەش هەمیشە دژی موسوڵمانان بوون، تێیاندایە لەگەڵ نەسارەکاندا بوون دژی موسوڵمانان ئەمانە لەگەڵ تەتار دەستیان تێکەڵ بوو بۆ ڕوخاندی خەلافەتی عەباسی و هەمیشە دەستی دوژمنانی ئیسلامیان گرتووە بۆ ئەوەی سەربکەون بەسەر ئەمیر و سوڵتانی موسوڵماناندا هەمیشە لە گەڕ و پلان و گێرە شێوێنیدا بوون دژی موسوڵمانان.

جێگاو شوێنی نوصیرییەکان لە ئەمڕۆدا

یەکەم: لازقیەی سوریا ناسروان بە(عەلەوی).

دووەم: ئەنادۆڵی شەرقی و ئازربایجان (قزڵباشی) واتا کڵاوسورەکان.

---

[٢] هؤلاء القوم المسمَّون بالنصيرية -هم وسائر أصناف القرامطة الباطنية- أكفر من اليهود والنصارى، بل وأكفر من كثير من المشركين، وضررهم أعظم من ضرر الكفار المحاربين مثل التتار والفرنج وغيرهم.. وهم دائمًا مع كل عدو للمسلمين، فهم مع النصارى على المسلمين، ومن أعظم المصائب عندهم انتصار المسلمين على التتار، ثم إن التتار ما دخلوا بلاد الإسلام وقتلوا خليفة بغداد وغيره من ملوك المسلمين إلا بمعاونتهم ومؤازرتهم".

سێیەم: كوردەكانی توركیا بەشێكی كەم بەناوی (عەلی خوایەكان).
چوارەم: توركیا و ئەلبانیا ناسراون بە (بەگتاشیەكان).
پێنجەم: هەنێكی تریش لە لوبنان و فەڵەستین دەژین.
فریاد: چی بكەین ؟
ماكوان: با ڕاكەین.
كاكە باز: ڕاكردنی چی؟ نابێت حەیامان دەچێت، ئەزانی هەموویان تەماشای تۆ دەكەن تۆیان لێبووە بە ئیمامی عەلی. شتێكیان بۆ باس بكە و دەڕۆین.
ماكوان: بۆ زانیاریتان نوێژو شت ناكەن، بەتەمای نوێژی مەغریب نەبن. مەگەر ئێمەش بچینەوە قەسرو جەمعی بكەین لەماڵی حوسێن یان تەلەفۆن بكەم بۆ سامان بێت بە شوێنماندا، لەوكاتەدا تەلەفۆنم كرد بۆ سامان و وتم دێینەوە بۆلای تۆ.
فریاد: سامان كێیە؟
ماكوان : دواتر بۆت باس دەكەم ئێستا پرۆ حوسێنم بۆ بانگ بكە، دەچم بۆ تەوالێت كە هاتمەوە بڵێ ماكوان ئیشی پێتە.
چووم بۆ تەوالێتەكە ویرسان لەبەردەم تەوالێتەكەدا ئامادەبوو.
ویرسان: چۆن سەڵتەنەتێكت هەیە ؟ سەیركە ئەو خەڵكە موسوڵمانە ئاوا تۆیان خۆش دەوێت و منیشیان خۆش دەوێت، دەڵێی چی خۆم ئاشكرا بكەم؟
ماكوان: هیچ وەڵامم نەدایەوە و خۆمكردەوە تەوالێتەكە و بە قاچی چەپم چوومە ناوەو وتم: اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث، ویرسان نەما.
هاتمە دەرەوە لە دوورەوە حوسێن هات بۆ لام لەتەنیشت كورسیەكەوە قەرەباڵغی دروست بووبوو.
حوسێن: سەیدا شێخی گەورە هاتووە زۆر شانست هەیە كە لە دوورەوە تەماشام كرد هەموو سوجدە دەبەن بۆ ویرسان و خۆی ئاشكرا كردووە، حوسێن ڕۆشت ئەویش سوجدە بەرێت تەنها من و فریاد و كاكەباز سوجدەمان نەبرد بۆ ویرسان.
كە ئەوەم بینی بەدەنگی بەرز دەستم كرد بە خوێندنی قورئان، ئایەتەلكورسیم تەواو كرد ئەوەندەم نەزانی هەرچی خەڵك بوو لەو تەكیەدا دەیقیژاند و ڕووەو من دەهاتن تا پەلامارم بدەن نەشیان دەوێرا، ویرسان بە دەم پێكەنیەوە ڕۆیشت و ئەوانی دەورووپشتی هەمووی تەماشای منیان دەكرد، ڕێزو ئیحترام بوو بەوەی پەلامارم بدەن. هاوارم كرد لە فریاد و لە كاكە باز ڕاكەن، حوسێن بەدوامان‌دا هاتە دەرەوە.
حوسێن: ماكوان چی ڕوویداوە سەرم خەریكە ئەتەقێت ؟
ماكوان: دێیت لەگەڵ ئێمە، شەیتان زانی من لەوێم هجومی هێناوە دواتر بۆتان باس دەكەم چی ڕوویداوە، ڕامانكردە دەرەوە.
حوسێن: دەچین بۆ ماڵی خۆمان.
ماكوان: نا دەچین بۆ لای سامان چاوەڕێمان دەكات تۆش وەرە بۆ ئەوێ.

## هاتنی حوسێن بۆ ناو ئەهلی سونەت و جەماعە

چووین بۆ ماڵی سامان و هەردوو هاوڕێکانم بە سامان ناساند و باسی سامان و ناسینی و حوسێنمان کرد بەیەکەوە، حوسێنیش لەوێ بوو.
دوای پشوویەك من و حوسێن چووینە بەلەکۆنەکە پێموت برام تۆ پیاوێکی باشی بۆچی واز ناهێنیت لە بیروباوەڕی شیعەگەری و نابیتەوە بەئەهلی سوننەت و جەماعەت براکەم وەڵلا عەلەوی بوون کوفرە، هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەتیەوە نییە. بۆیە داوات لێدەکەم کە پیاوێکی عەزیزو بەڕێزی وازیان لێبهێنە و بگەڕێوە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، خۆشم دەوێیت با توشی کێشە نەبیت لە دونیا و لەقیامەت.

حوسێن: خۆ من ژنەکەشم سوننەیە خەڵکی دیاربەکرە.
ماکوان : براکەم وەڵلا تەنانەت ژنەکەشت دروست نییە بەدیارتەوە بێت، تۆ دینت خۆش دەوێت بۆ بەڕاستی و دروستی شوێنی ناکەویت.
حوسێن: خۆ من عەلەوی نیم، هەر شیعەی دوانزە ئیمامیم.
ماکوان: ئەوان تاڕادەیەك لە عەلەویەکان باشترن، بەڵام براکەم ئەوانیش هەر فیرقە و تایفەن زۆر دوورن لە ئیسلامی ڕاستیەوە.
حوسێن: ئەوان بە کافر دەزانیت؟
ماکوان: نەخێر، بە تایفە و فیرقەی ئیسلامیان دەزانم و تاوانبارن و بیرو باوەڕیان تەواو نییە زۆر کاری قێزەوەنتان هەیە، دوورن لە ئەهلی سونەتەوە.
حوسێن: چۆن؟
ماکوان: چۆنی ناوێت بە دە خاڵ بۆت ڕوون دەکەمەوە ئەگەر وا نەبوو بڵێ ماکوان ڕاست ناکەیت، بزانە چەندە جیاوازن لەگەڵ سونەت و جەماعەتدا.
حوسێن: تۆ دەزانی من زۆر تۆم خۆش دەوێت دەشزانم ڕاستگۆیت تکایە ڕاستیەکانم بۆ ڕوون بکەرەوە، ئەوەی تۆ بیڵێیت پروات پێدەکەم.
ماکوان: بارك الله فیکم سەیدا حوسێن گیان، منیش لەو کاتەوەی جەنابتم دیووە ئەو کاتەشی کە بۆ شەڕکردن هاتیتە لام هەر خۆشەویست بوویت.
حوسێن: گەلێك سوپاس سەیدا گیان.
ماکوان: جا لەبەر ئەم جیاوازییانە.
یەکەم: شیعە- پێی وایە تا ئیستاش وەحی بۆ ئیمامەکانیان دێت لای جوبریلەوە -علیە السلام-، بەڵام ئێمەی ئەهلی سوننەت پێمان وایە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر □ وەحی کۆتایی هاتووە.
دووەم: شیعە- پێی وایە هاوکار و هاوبەشکار هەیە لە کارەکانی خوای گەورە لە بەڕێوەبردنی ئەم گەردوونە. شیعە دەڵێت: ئیمامەکان لە قیامەتدا خەڵکی حەشر دەکەن و ئیمامی عەلی بڕیار ئەدات کێ بچێت بۆ جەهەنەم و کێ ناڕوات بۆ بەهەشت لەگەڵ مەهدی، یاخود پێیان وایە ئیمامەکانیان باران دەبارێنن و ڕزق و ڕۆزی خەڵکیان بەدەستە. ئێمەی ئەهلی سوننەت- باوەڕمان وایە کە خوای گەورە تاك و تەنهایە و توانا و هێزی و زانستی بەسەر هەموو کاروبارەکاندایە بێ نیازە و پێویستی بە کەس نییە و ئێمە هەموومان پێویستمان بەوە بە پێغەمبەریشەوە □ بە ئیمامی عەلیشەوە ڕەزامەندی خودای لێبێت و هەموو خەڵکی بە گشتی.
سێیەم: شیعە- پڕوای وایە قورئان دەستکاری کراوە ئەم قورئانەی کە ئێستا لەبەر دەستدایە تەحریف کراوە، قورئانی ڕاستی لای ئیمامی مەهدیە و شاردویەتیەوە لە ژێر زەمینێکدا لە کۆتایی زەمەندا دەری دەهێنێت و ئەو قورئانە بەخەڵکی دەناسێنێت، ئێمەی ئەهلی سوننەت و جەماعە دەڵێین قورئان دەستکاری نەکراوە هاوەڵان لە پێغەمبەری خواوە □ گواستوویانەتەوە لەسەرەتای دابەزینی قورئانەوە لە مەککەوە نوسراوتەوە، پێشمان وایێت دزی ئەسڵی و تاوانباری سەرەکی ئیمامی مەهدیە کە ئەم قورئانەی بردووە

و شاردۆتەوە، ئەگەر قورئانی خوایە لە چی شەرم دەکات بۆ ئاشکرای ناکات بێتە دەرەوە لەو ژێرزەمینەدا.

چوارەم: ئێوەی شیعە- پێتان وایە لە دوای پێغەمبەری خوا هەموو هاوەڵان مورتەد بوونەتەوە وازیان لە ئیسلام هێناوە، تەنها پێنج هاوەڵ نەبێت ئەوانیش: عەلی، حەسەن، حوسێن، سەلمان فارسی و عەبدوڵای کوری زوبێر، لای ئێمەی ئەهلی سوننەت و جەماعە هەموو هاوەڵان لە دوای پێغەمبەری خوا  ئیسلامیان بە جوانترین شێوە گەیاندووە و هەموویان دادپەروەر و ڕاستگۆن.
پێنجەم: شیعە- پێیان وایە ئیمامەکانیان لە پێغەمبەران بەڕێزترن، بەڵام ئێمەی ئەهلی سوننەت پێمان وایە کە پێغەمبەران ئەشرەفترین مەخلوقن لەسەر زەویی.
شەشەم: شیعە- کە دەڕۆن بۆ حەج بۆ شەیتان ڕەجمکردن هەر سێ شەیتانەکە بە ئەبوبەکر،عومەر و عوسمان دەزانن، ئەوان ڕەجمی هاوەڵانی پێغەمبەر  بە عیبادەت دەزانن، ئێمەش بڕوامان وایە کە ئەوانە لەدوای پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت باشترین خەڵکی سەر زەوین.
حەوتەم: ئێوەی شیعە- دایکی ئیمانداران خاتوو عایشە بە داوێن پیس دەزانن قسە و جنێوی پێئەدەن، بەڵام ئێمە بە حومەیرای پێغەمبەر **ی** دەزانین و بە داوێنپاکترین ئافرەتی سەر زەوی دەزانین.
هەشتەم: شیعە – پێی وایە کە کورد لە جنۆکەیە نابێت مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، بەڵام ئەهلی سوننەت پێیان وایە کورد ڕزگارکاری قودسە لە ڕێگای سەلاحەدینی ئەیوبی. کورد خاوەنی هاوەڵی پێغەمبەرە  وەك کاوانی کوردی.
نۆیەم: شیعە- نەجەف و کەربەلایان زۆر لا پیرۆزترە لە مەککەو مەدینە، ئێمەی ئەهلی سوننەت ڕێك پێچەوانەکەی ئەوانین.
تلك عشرة كاملة
دەیەم: شیعە- مەرجەعیان ئیمامەکانیانە ئەهلی سوننەت و جەماعە قورئان و سوننەتە.
ئەگەر ڕاست نیە بڵێ ماکوان درۆ دەکەیت.
حوسێن: نا ڕاست دەکەیت و منیش تا ئێستا بڕوام وایە.
ماکوان: دەی برا بەقسەی من مەکە، تەماشایەکی هاوسەرەکەی خۆت بکە دینداری ئەو تەواوە یاخود تۆ؟
حوسێن: وەڵڵا ئەو زۆر لە من باشترە.
ماکوان: تەوبە بکە و لەگەڵماندابە نەك لەبەر ئێمە دەست بکەیت بە توقیە نوێژ بکەیت، من نەمزانیبوو شیعەی لەگەڵ ئێمەش نوێژت کرد وەکو ئەهلی سوننەت، جا برا عەزیزەکەم کۆتایی پێبهێنە و بگەڕێوە بۆ ڕێگای ڕاست، باشە؟

حوسێن: تۆ چی بڵێیت وادەکەم.
دەستم لەسەر شانی حوسێن بوو بە پێکەنینەوە هاتینەوە ژوورەوە، لەبەرچاوی ئەواندا ئەملاولام ماچ کردوو هاوارم کرد الله اکبر حوسێن وازی لە شیعە هێنا و بووە بە ئەهلی سونەت و جەماعە، ئەوانەی تر زۆر بە سارد و سڕی وەریان گرت تا کێشام بە فریاد و کاکە بازدا، هەڵسن ئەملاولای ماچ کەن و پیرۆزبایی لێبکەن.
فریاد: خۆ ژنی نەهێناوە.
تورە بووم بە زۆر هەڵمساند کەچی زۆر بەسادەیی وەریانگرتبوو ئەوە سامان هەر تێنەگەیشت مەوزوع چییە.
نەمهێشت کەسیان دانیشن ووتم دەچین بۆ ماڵی سەیدا حوسێن لەوێ نان دەخۆین.
چووین بۆ ماڵی سەیدا حوسێن، خێزانی ناوی صدەف خاتوون بوو، نان و خواردنێکی جوانی بۆ دروستکردین و بە جەماعەت نوێژی مەغریب و عیشامان کرد، بە خێزانیم ووت: صدەف خاتون سەیدا حوسێن لە خۆمانە و ئەهلی سوننەتە پەیمانی داوە کە ناگەڕێتەوە سەر شیعەگەراییەکەی، ئەگەر وانەبوو ئاگادارمان بکەرەوە. بە پێکەنینەوە قسەم دەکرد و لەگەڵ وتەکانی خۆم جدی بووم.
مەجلیس مەوزوعی تێدا نەما ڕوومکردە فریاد، لەڕووی پزیشکییەوە هۆکاری دروستبوونی ئەم حاڵەتە بۆچی دەگەڕێتەوە کە سوارە توشی بووە؟
ئەوان کەسیان نەیاندەزانی کە کاکە باز ناوی سوارەیە ، خۆشی دانیشتبوو چپاندم بەگوێیدا وتم ئاسایی وەریگرە دەمەوێت هەندێك شت بزانم چونکە کاتم نییە، بەس من و تۆ و فریاد ئەم شتە دەزانین وا گوێگرە کە مەوزوعەکە کەسێکی ترە، چونکە من کاتم نییە با سوود لە کات وەرگرم لە ماڵی حوسێن باشە؟
کاکە باز ڕازی بوو ئاساییم کردەوە دانیشت و هەمووومان گوێمان گرت لە فریاد وەکو پزیشکێك بۆی ڕوون دەکردینەوە.
فریاد: لاوازی جنسی لای پیاوان شتێکی ئاساییە لای زۆربەی ئەو هاوسەرانەی کە تازە هاوسەرگیرییان کردووە، بەڵام قابیلی چارەسەرە و هیچ جێگای نیگەرانی نیە.
لە ڕووی پزیشکیەوە چەندین هۆکار هەیە تا ئەم حاڵەتە دروست ببێت، لەوانە:
نەخۆشییە درێژخایەنەکان، بەکارهێنانی دەرمان بۆ چارەسەری نەخۆشی دیکە، خەمۆکی و گرژی باری دەرونی، زۆر بیرکردنەوە و ترس و دڵەڕاوکێ.
بەڵام هۆکاری تریش هەیە لەوانە کێشەی میزڵدان و بۆری میزو و گورچیلەکان، ئەگەر ئەمەیان هۆکار بێت ئەوا دەبێت بچێتە لای دکتۆری تایبەت تا ڕێنمایی و چارەسەری تەواو وەربگرێت.
ماکوان: جگە لەمانە هۆکاری تر هەیە وەکو ئەوەی تۆ پزیشکی؟

فریاد: لاوازی جنسی لای پیاوان زیاتر هۆکارەکەی خەمۆکی و دڵەڕاوکێیە، ئەگەر پیاوان نیگەرانی کارێك بن و زۆر بیر بکەنەوە لە ئیش و کاری ڕۆژانە و داهاتوو وە چۆن بتوانن ئەو خێزانە تازەی کە دروستیان کردووە بتوانن بەڕێوەی ببەن ئایا سەرکەوتوو دەبن یاخود نا، زۆر بیرکردنەوە لەم شتانە دەبێتە هۆی لاوازی جنسی لای پیاو.

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی نەخۆشی شەکرەیە، کە ئەگەر پیاوەکە شەکرەی هەبێت ئەبێت نە شەرم بکات وە نە بشترسێت بە دکتۆری تایبەتی خۆی بڵێت تا لە ڕێگای دەرمان و بەرنامەی خواردنەوە چارەسەری بۆ دابنێت.

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکان نەخۆشیەکانی دڵە بەهەموو جۆرەکانیەوە، هەروەها پرۆستات دەبێتە هۆکاری لاوازی جنسی بەتایبەت ئەو کەسانەی کە نەشتەرگەری پرۆستاتیان بۆ کراوە.

ماکوان: ئەی باشە ئەم حاڵەتە چۆن چارەسەر دەکرێت؟

فریاد: بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتە دوو ڕێگا هەیە.

یەکەم: کەسەکە بوێری ئەوەی هەبێت بچیتە لای دکتۆر.

دووەم: پزیشکەکە هۆکارەکەی دەستنیشان بکات و چارەسەری بۆ دابین بکات.

ماکوان: پزیشك چۆن هۆکارەکەی دەست نیشان دەکات؟

فریاد: بەپرسیارکردن لە کەسەکە و لەسەر ئەو وەڵامانەی کە دەیداتەوە هۆکارەکەی دەست نیشان دەکرێت.

ئەگەر هۆکارەکە دەرونی بێت، ئەوا ڕێنمایی دەکرێت بەوەی بچێتە لای دەروناسێك تا لەڕێگەی ئەوەوە ڕێنمایی بکرێت بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتەکەی.

خۆ ئەگەر هۆکارەکەی جەستەیی بێت ئەوا دکتۆرەکە خۆی چارەسەر و ڕێنمایی تەواوی دەداتێ تا باش دەبێت، بەڵام بۆ هەریەك لەو هۆکارانەی کە بۆم باس کردن شێوازی چارەسەری جیاواز هەیە.

باشە با من لێرەدا پرسیارێك لە تۆ بکەم ماکوان لە ڕووی دەرونیەوە لە ڕووی سیحرەوە چۆن و چی ڕوو ئەدات.

زۆر کەس هاتوونەتە لای ئێمەی پزیشك نەمان توانیووە دەستنیشانی نەخۆشیەکەیان بۆ بکەین، هەرچی پرسیاری لێ دەکەین هەموو ئامرازەکانی جەستەی ئاساییە کەچی توانای نییە لەگەڵ خێزانیدا جووت ببێت.

ماکوان: ئەوەندەی من شارەزایم هەبێت خۆی لە چەند بوارێك دەگرێت لەوانە:

سیحری بەستن: بریتیە لە تۆری ماسی یاخود شلیف و گونیە و تەلیسمەکانی پیادا دەخوێنن و بە تێپ یاخود پەڕۆ یان عەلاگە بەدەوریدا دەیبەستن، یاخود تەلیسمی سێکسی بە دەوریدا دەئاڵێنن و نوسینی تەلیسمی تایبەت هەیە بۆ ئەو سیحرە. هەر کەس بیکات ڕاستەخۆ کافر دەبێت و لە ئاینی ئیسلام دەچێتە دەرەوە، هەندێك جاریش لە وێنەی

خێزانەکە دەکرێت یاخود بەشێك لە جلوبەرگی یاخود مووی لاشەی پیاو دەبەن بۆ ساحیرەکە و ئەویش سیحری لێدەکات و دەبێتە هۆکاری ئەوەی یان بێز و قێز لە خێزانی بکاتەوە، یاخود کە دەیبینێت وا هەست دەکات دایکیەتی یاخود خوشکێتی یان زۆر ئەترسێت، هەروەها پێچەوانەکەی ئافرەت ڕقی لە مێردەکەی دەبێتەوە و توانای نییە و بێز دەکاتەوە زۆرجار لەکاتی سەرجێیدا دەڕشێتەوە یاخود دەگری.

لەم بارەیەوە زانایانی ئیسلامیش زۆر قسەیان لەسەر کردوە لەوانە ئەبو قودامەی مەقدیسی باسی هەمان حاڵەت دەکات.[٣]

فریاد: ئەی چارەسەر چییە؟

چارەسەری ئاسانە گەڵای هەر دارێك لە قورئاندا ناوی هاتبێت حەوت گەڵا لێبکەرەوە و لە بەینی دوو بەرد دا وردی بکە و بیخە ناو ئاوی زمزم یاخود ئاوی باراناو، وەکو گەڵای سیدرە، هەنجیر، هەنار، مۆز، خورما یان زەیتون ...هتد

ئینجا سورەتەکانی -قل -ی بەسەردا بخوێنە کە بریتین لە چوار سورەت (قل یا الکافرون، قل هو الله احد، قل اعوذ برب الفلق و قل اعوذ برب الناس)، دوای ئەوە ئایەتەل کورسی و ئینجا با کەسەکە خۆی پێبشوات، بە پشتیوانی خوا چارەسەر دەبێت هیچ کێشەی نامێنێت بە مەرجێك نەچوبێت بۆ لای ساحیر.

فریاد: ئەگەر چوو بۆ لای ساحیر چی ڕوو دەدات؟

ماکوان: ئەو کەسەی بچێت بۆ لای ساحیر و جادووبازەکان کافر دەبێت، پێویستە تەوبە بکات و سەرلەنوێ موسوڵمان بوونی خۆی ڕابگەیەنێتەوە و دوو ڕکعات نوێژی تەوبە بکات.

فریاد: هۆکاری تر هەیە بۆ ئەوەی پیاو نەتوانێت بچێتە لای هاوسەرەکەی؟

ماکوان: دەبوو ئەمەیان تۆ باسی بکەیت، زۆر پیاو بە هۆکاری ئەوەی لە کاتی گەنجیدا توشی کەبتی و پوکانەوەی سێکسی بووە زیاتر ئارەزووی نێربازی کردووە توشی ئەو کارە بووە، کە ژنی بۆ دەهێنن ناتوانێت لەگەڵیدا جوت ببێت، ئەوەش هۆکارێکی ترە کە زۆر ترسناکە، من دەپرسم خۆ ئەوە نەخۆشی نییە؟

فریاد: نا، نەخۆشی نییە تەنها حەز و ئارەزووە.

ماکوان: دەتوانێت وازی لێ بهێنێت؟

فریاد: بەڵێ حەزێکی شازی سێکسیە، وەکو جگەرە وایە دەتوانێت وازی لێ بهێنێت نەخۆشی نیە و ئارەزووە، ڕاستە ئەوە هۆکارێکی ترە کە بەداخەوە لە ناو گەنجەکاندا زۆر بەربڵاوە.

ماکوان: دیاردەیەکی تر هەیە لە هەندێك پیاوی بەحورمەت و خاوەن ڕەوشت ڕوودەدات ئەویش بەو هۆکارەیە کە لەژیانیدا پرۆسەی سێکسی ئەنجام

---

[٣] قال ابن قدامه: (وقد اشتهر بين الناس وجود عقد الرجل عن امرأته حين يتزوجها فلا يقدر على إتيانها وإذا حل عقده يقدر عليها بعد عجزه عنها حتى صار متواترا لا يمكن جحده ) ( المغني - ١٠ / ١٠٦)

نەداوە، بەهۆکاری ئەوەی یەکەم جارێیەتی و تۆشی شۆك دەبێت توانای ئەو پرۆسەیەی نیە.
فریاد: ئەوەش ڕاستە، کێ ئەم کارە خراپانە دەکات.
ماکوان: ئەوەی ئەوکارە دەکات خەڵکیتر بە پارە فێر دەکات تەنها ساحیرێکی عێراقییە کە خەڵکی موسڵە و صابئیە و لەدەرەوەی عێراق دائەنیشێت و شوێنی نادیارە، ماڵی زۆر کەسی وێران کردووە ناوی (الساحر السفلي كرم الزمان الصابئي) سیحرەکانی زۆر پیسە و دەوڵەمەندەکانی خلیج و عێراق زۆر مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و هەموو سیحرەکانیشی بە ئاشکرا دادەنێت و باسی کوفر و پیسی و خراپەی خۆی بە ئاشکرا دەکات و کەچی سبحان الله خەڵکی موسوڵمانیش دەچێت بۆ لای نازانێت کافر دەبێت.
کاکە باز: ئەی لەکوردستان نیە لەو ساحیرانە؟
ماکوان: زۆرن ڕوا بکە بەهەزارەها ساحیری تێدایە، بەڵام بەناوی شێخ و مەلاو ڕۆحانیەتەوە خۆیان دەناسێنن و هەموویان دەجال و خراپەکارن و ماڵی خەڵکی وێران دەکەن و کۆمەڵگایان شێواندووە بەسەر یەکتردا.
شەو گەڕاینەوە بۆ ماڵی سامان بۆ خەوتن لەڕێگا کاکە باز پرسی: کاکە سور من چارە دەکرێم؟
ماکوان ئەوەی پێم وتی بیکە دڵنیابە چارە سەر دەبێت.
کاکە باز: مادام بلیتم بۆ ببڕن دەگەڕێمەوە بۆ کوردستان.
ماکوان بەسەرچاو هەر لە دوسلڈۆرفەوە پڕۆرەوە بلیتەکەشت لەسەر من، بە سامانم ووت بیبڕە بە کارتەکەی من. فریادیش ١٠ وەرەقەی پێدا لای بێت، بلیتمان بۆ بڕی و بۆ دوو ڕۆژی تر ڕواتەوە.
ئەوشەوە خەوتین بۆ بەیانی هەڵساین من داوام کرد دەگەڕێمەوە بۆ نەرویج و ئەوانیش یەکشەمە بوو ووتیان با ئەمڕۆش بەیەکەوە بین سبەینێ دووشەمە هەموو دەگەڕێینەوە، کاکە باز داوای کرد جێی نەهێڵین تا سواری فڕۆکە دەبێت، سامانیش ووتی: مەڕۆ، بەیانی دوو شەمەیە ئیقباڵ دەگەڕێتەوە.

# کەمینێك بۆ ماکوان بەناوی جیهاد و کوشتار

چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد ئیقباڵ بگات و ئێوارەکەشی کاکە باز ڕەوانەی هەرێم بکەینەوە، کارەکان بە باشی دەڕۆشت کە ئیقباڵ هات باوەشم پێدا کرد.
ماکوان: کوڕی الله بەخشە و باوك موسوڵمان خۆی ناوی ئیقباڵی لاهوری هەڵگرتووە کوڕەکەشی سلامو اللەیە.
کە تەماشای سەرسنگیم کرد زنجیرێکی سەلیبی لەسەر سنگ بوو.
ماکوان: تۆ مەسیحی یان موسوڵمانیت؟
ئیقباڵ: من موسوڵمانم، ماکوان بۆ ئەو پرسیارە دەکەیت؟
ماکوان: ئەی ئەو سەلیبە چییە لەملتا؟
ئیقباڵ "بە پێکەنینەوە": ئەوە تەنها کەدێم بۆ ئەوروپا دەیکەمە ملم کاتی خۆی کە ئیقامەم وەرگرتووە وتوومە مەسیحیم لە فەڕەنسا، دەنا من هەر موسوڵمانم.
ماکوان: جانتاکەی بەدەستمەوە بوو دامەوە دەستی، هەموو گیانم سور بوویەوە: ئەی ئەحمق خەڵك بۆ ماڵی دونیا و ئیقامە دینی خۆی دەگۆڕێت؟
ئیقباڵ: من تەنها بۆ ئیقامە کردوومە مەبەستم ئیقامە بووە، من هەر موسوڵمانم لەگەڵ ئێوە نوێژم دەکرد خۆ من کافر نیم بۆ وا تورە بوویت؟
ماکوان: باوکت دەزانێت؟
ئیقباڵ: نا، جا بۆ ئەو بزانێت.

ماکوان: بەخوا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت باوکت وەکو سپاردەیەك تۆی ناردووە بۆ لای من سوێند بەخوا لێرە جێم دەهێشتی، ئەو سەلیبە لە ملتا لابە و فڕێیدە، یان ئێستا بڕۆ بەدیاری بیدە بە کڵێسایەك ئینجا دوای ئەوە قسە دەکەین.
هەتا هاتمەوە قسەم لەگەڵ نەکرد دوایی بۆم باسکرد ئەگەر موسوڵمان بەدرۆشەوە بڵێت وازم لە ئیسلام هێناوە کافر دەبێت، مەگەر زۆری لەسەر بێت و ڕۆحی بپارێزێت، خۆ تۆ ئیقامەت لەسەر مەسیحی بوونت وەرگرتبێت هەر دروست نیە، لەبەر ئەوە تۆ کافری و بێدین و مورتەدی.
فریاد: کاکە وازی لێبێنە کەیفی خۆیەتی، حەقت نەبێت بەسەریەوە با توشی گۆبەنگێکت نەکا.
ماکوان: کاکە فریاد بەبۆنەی ئەم هەتیوە توشی زۆر کێشە هاتم بمزانیایە ئاوا دونیا وویستوو ژیان وویستە بۆم نەدەکرد وامزانی پیاوە، بەڵام خوڕیە.
ئیقباڵ: باشە من چی بکەم ئێستا؟
ماکوان: بڕۆ خۆت بشۆ و شایەتومان بهێنەرەوە، بگەڕێوە بۆ فەڕەنسا و لەوێ بڵێ من موسوڵمان بووم لەڕێگای کوڕێکەوە کە کوردە ناوی ماکوانە ئەو موسوڵمانی کردوومەتەوە و بڕوام بە مەسیحیەت نەماوە دینەکەم دەگۆڕم.
ئیقباڵ: بۆ تۆ کێشە نییە وابڵێم؟
ماکوان: بۆ کێشەیە زیرەکەی، خۆ موسوڵمانم کردوویت، نەمکردوویت بەدز یان بە مافیا.
ئیقباڵ: وەڵاهی نەمزانیبوو ئاوا قورسە حوکمەکەی دەنا هەرگیز وام نەدەکرد.
ماکوان: ئەوە لە نیشانەی نەزانیتانە، ئەگەر لە ئیسلام و بیروباوەڕی شارەزابن ئا ئەو دینە هێندە بەلاتانەوە ئاسان نیە، نەخوێنەوارن بە ئاینی ئیسلام و بیروباوەڕەکەی.
ئەوان چوونەوە بۆ ماڵەوە منیش زۆر بێتاقەت بووم، ئەو پەندە کوردیەم بەسەر خۆمدا دەهێنا کە دەڵێت: بۆ بۆرە پیاو خۆمان هیلاك کرد، ئەویش پێمان پێدەکەنی. من لەبەر خودا و دینداری هاوکاریم دەکرد ئەویش مەسیحی دەرچوو.
لەم قسانەدا بووم لەگەڵ خۆمدا حەزقیل لە تەنیشتمەوە دەڕۆشت: حەزە گیان ئەوە بۆ بێدەنگی؟
حەزقیل: ماکوان ئاگاداری خۆتبە، بانگت دەکەن بۆ کۆڕێك لە شارێك کە فێڵە دەیانەوێت بەناوی گفتوگۆوە کێشەی یاسایت بۆ دروست بکەن.
ماکوان: چۆن دەزانیت، کام شار و کێن؟
حەزقیل: هاوڕێکانمان باسیان کرد، ناوی شارەکە دیاری نەکراوە بۆیە نەمتوانی بۆت بهێنم و جەماعەتەکەش گروپێکن لەکوردستان خۆت باش دەیانناسیت، بۆیە هاتم ئاگات لە خۆت بێت پێش ئەوەی بچیت پۆلیسیان ئاگادارکردۆتەوە لەڕێگای کەسێکی خۆیانەوە کە لەگەڵ دەزگاکانی پۆلیسی ئەڵمانی کاردەکات، قسەکانیشت هەموو تۆمار دەکەن.

ماکوان: ئەی نەتانزانی باسەکەیان چیە؟
حەزقیل: جیهاد و قیتال.
ماکوان: ئەوە چییە حەزە گیان بۆ وا بێتاقەتی؟
حەزقیل: خەفەت بۆ ئەوە دەخۆم وامزانی تەنها ئەوانەی ئێمە ڕقیان لێتە، کەچی لەخۆتانن زۆر پیسن بەدوای ملشکاندنتەوەن، دەستی سەسیل خۆش بێت دەیوست هەموویان توشی حۆلیوو گێژی بکات، بەڵام شێخ برقان نەیهێشت. ڕایسپاردم کەوا بێم بەخۆت بڵێم بزانم چی دەڵێیت؟
ماکوان: هیچ ناڵێم با تەلەفۆن بکەن ڕێك ڕازی دەبم، دەچم باسی جیهاد و قیتال دەکەم.
حەزقیل: نا مەڕۆ، با تووشی کێشەت نەکەن بەقسەمان بکە و بگەڕێرەوە بۆ نەرویج و بڵێ کاتم نییە، لەبەر خاتری من.
ماکوان: حەزە گیان خاتری تۆ لەسەر سەرو سەرچاوم، بەڵام وانەیەکیان فێردەکەم کە هەتا ماون بیریان نەچێتەوە، ئەگەر دروست بوایە دەمناردن ئیشم بۆ بکەن، بەڵام حەرامە. دەستی تۆ و شێخ برقان خۆش بێت، ئەگەر بۆتان کرا بەئارەزووی خۆتان و توانای خۆتان هاوکاریم بکەن لەزانیاری، بە کاکە سەسیل بڵێ خۆشەویستە و ڕێزمان هەیە بۆی چاومانە، حورمەت و ڕێزی تایبەتیشم بگەیەنە بەشێخ برقان.
حەزقیل: علینا وعلیکم السلام، من دەڕۆم ئەو موستیلە و دیاریەی من بۆ لەگەڵ خۆت هەڵناگریت؟
ماکوان: وەڵاهی حەزە گیان بیرم نیە، بەڵام پرسیارم هەیە حەنانە دیار نییە لەگەڵ ڕاقی؟
حەزقیل : حەنانە لەسەر شێوەی ئەو ئافرەتە خۆی نیشانی تۆ داوە ناتوانێت خۆی بگۆڕێت هەمیشە لەگەڵماندایە و خۆی نیشانی تۆ نایات، چونکە شێخ برقان وتی دروست نیە.
ماکوان : زۆر سڵاوی تایبەتی من بگەیەنە بەو خوشکە جنۆکەیەم.
حەزقیل: هەرکات زانیمان هەر شتێکی نەخوازراو ڕوودات بێخەمبە ئاگادارت دەکەینەوە.
ماکوان: ماڵتان ئاوابێت.
تەلەفۆنەکەم زەنگی لێدا و منیش هەڵمگرت، جەنابت کاك ماکوانی؟
ماکوان: بەڵێ، فەرموو!
من ناوم ئاودێرە ڕۆژنامەنوسم، لە کەناڵێکی ڕادیوێی ئەڵمانیم کۆڕبەندی کوردی لە شاری کۆڵن ئامادەکاری بۆ جەنابت دەکات لەسەر ڕەوشی ئێستا و جیهاد و قیتال لە ئیسلامدا، ئایا دەتوانیت ڕۆژی چوارشەمە میوانداریت بکەین و هوتێل و پێداویستی خۆشت دابین دەکەین تا دوای کۆڕەکە لە ئەمڕۆوە، نازانین لە چ شارێکی لە ئەڵمانیا ؟

ماکوان: باشە بەسەرچاو پێویست ناکات من لە نۆیسم نزیکم لە کۆڵن ناونیشانی هۆڵ یاخود ئەو جێگایەم بۆ بنێرە ڕۆژی چوارشەمە ئامادە دەبم بە پشتیوانی خوا، بەڵام کاتژمێر چەندە و ئایا کۆڕەکە کراوەیە؟

ئاودێر: کاك ماکوان لە هوتێل (ماریتیم) دەکرێت، وەرە بۆ ئەو ناونیشانە.

ماکوان :سوپاسم کرد و چوومەوە بۆ ماڵی سامان.

فریادو سامان هاتن لەلام دانیشتن و دەستیان کرد بە قسە کردن: کاکە ڕەق مەبە لەگەڵ ئیقباڵ زۆر گریاوە هاتۆتەوە بۆ ماڵەوە زۆر بێزارە .

ماکوان: وازی لێبێنن با هەست بە هەڵەی خۆی بکات بزانێت چەندە گەورەیە.

تەلەفۆنم کرد بۆ حوسێن: وەرە بۆ ئێرە ئیشم پێتە.

حوسێن: ئاڵتونەکان بهێنم.

ماکوان: نا پێویست ناکات خۆت وەرە.

وایزانی بۆ ئاڵتونەکان بانگی دەکەم ڕوومکردە سامان، باپرۆین جوانترین بلەیزەر بکڕم لەگەڵ کابۆیەك و جوتێك پێڵاوی خورمایی.

چووم دەستم کردە ملی ئیقباڵ و ئاشتم کردەوە: برا تەوبە بکە وانایێت، کاری وا دووبارە مەکەرەوە.

ئیقباڵ: سوێند بەخوا نەمزانیبوو، زۆر شەرم دەکەم تۆ بڵێیت خوا لێم خۆشبێت؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە ئەگەر ڕاستگۆ بیت خوا لێت خۆش دەبێت.

حوسێن هات و بۆم باس کرد کە دوو سبەی کۆڕم هەیە و پێویستم بەهاوکاری و پارێزگاری هەیە لە دەرەوە و ناوەوەی هوتێلەکە، نەك خوانەخواستە شتی نەخوازراو ڕووبدات.

حوسێن ئامادەیی خۆی نیشان دا، بە ئیقباڵم وت کە پارە سەرفکراوە لەلایەن حوسێنەوە بۆ گێرانەوەی ئاڵتونەکان پێوستە هەمووی بدرێتەوە کە ئاڵتونەکان فرۆشراو بەشی ئەویش بدرێت و ئیتر ئەوە کاری خۆتانە من هیچم ناوێت، هەموو ڕازی بوون. چوینە بازاڕ جلوبەرگم کڕی، چوارشەمە کاتژمێر سێی نیوەڕۆ لەدەوری هوتێلەکە دەسوڕاینەوە، حوسێنکورێکی هاوڕێی ئەڵمانی ناردە ناو هوتێلەکە و خۆشی بەدوایدا چوو، هەواڵیان هێنا کە خەڵکیکی زۆر لە صالۆنی ئەو هوتیلە ئامادەیە و بەناوی کۆڕبەندی کوردی بۆ ماکوان کەریم سازدراوە.

کەوایان وت زانیم کارەکە فەرمیە، چونکە ترسی شتی ترم هەبوو کە هیچ نەبێت و حەزقیلیش ڕاستم لەگەڵ نەکات، بەڵام دیاربوو ئەوەی حەزە گیان وتی ڕاستە. خۆمان ئامادەکرد بۆ چونە ژوورەوە. سامان و فریاد لەگەڵمدا هاتنە ژوورەوە حوسێن و چوار کەسی تر لەدەرەوە بەناوی چاودێر هەڵدەسوڕان و باجی هوتێلەکەیان درایە.

بەخێرهاتنێکی گەرم کرام لەلایەن کاك ئاودێرەوە و منی بە ئامادەبووان ناساند منیش دەستم کرد بەقسەی سەرەتایی واپڕیار بوو لە کۆڕبەندەکەدا

من سەرەتا هەندێك قسە بکەم لەسەر ڕەوشی ناوچەکە و پاشان لەسەر جهاد و ئەوانیش پرسیار بکەن.
ماکوان کەریم: لەدوای بەسمەلە سڵاوم لێکردن بە سڵاوی ئیسلام و بەم شێوەیە دەستم پێکرد.
کۆرەکەم ناونابوو: شۆڕشگێری وسیاسەت لە ئیسلامدا بنەماکەی جیهادە.
هەموو کۆمەڵ و دەستەیەکی ئیسلامی پێویستیان بە تیۆرێك هەیە بۆ سیاسیەتی بزاڤی ئیسلامی واتا پێش ئەوەی باسی دید و تیۆری ئیسلامی بکەم پێویستە بزانین سیاسەتی ئیسلامی چییە؟
کەواتە سیاسیەت: بریتیە لە حیکمەت پاشان (کۆمەڵ)ی لێ دروست بکرێت تا (دەوڵەت) بە بانگەوازێکی گشتی و جیهانی (خیلافەت)بۆ لوتکە و ترۆپك و جێ نیشینکردن (شارستانیەت) بەرەو ڕاستی و حەق.
ئەم چەمکانە هەموو پێویستیان بە شیکاری هەیە.
حیکمەت و کاری بە کۆمەڵ:
هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە حیکمەت واتا هەستی پێگەیشتوو ڕاستی لە بیرکردنەوە و کۆکردنەوەی کۆمەڵێك خەسڵەت بە بانگەوازچی کە تایبەتمەندیەکەی ئەوەیە لە واقیعدا ئەو ئیسلامە دەکاتە ئایدۆلۆژیا، تا بە بانگەواز و گەیاندنی ئیسلامەکە بیگەیەنێتە ئامانج.
ئەمەی باسم کرد تێگەیشتنە لە چەمکی حیکمەت لە لایەن تاکی موسوڵمان.
ئەگەر بە تەواوی دیاری بکەین کە حیکمەتی کاری بە کۆمەڵ چیە دێینە سەر ئەو ڕایەی کە هەموو بڵێین واتا سیاسەت، کەواتە لە ئیسلامدا چەمك و حیکمەت و تێگەیشتن لێی واتا سیاسەت، ئەگەر بڵێین حیکەمەت سیاسەتی تاکی موسوڵمانە، کەواتە سیاسەت ئەوەیە کە حیکمەتی کاری بەکۆمەڵە. لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین دید و بۆچونی سیاسی ئیسلامی دیارە و ئەمە بنەماکەیەتی لەژێر ڕۆشنایی چوار حیکەمەت کە بریتیە لە: ( ڕەوش- واقیع، ڕاستی- حەق، مرۆڤ و ئامانج )
ئەم گرێدراوانە بەیەکەوە هەمووی توخمی ئەو ئاستە کۆمەڵسازیەیە لە بانگەواز و دیاری کردنی چوارچێوەی گشتی تیۆری سیاسی بۆ بزاڤ و گۆڕانکاری.
هەریەکێك لەم چوار توخمە ئەگەر نەبوون لەکاری کۆمەڵسازی و بانگەوازەکەدا، ئەوە لە ئاستی دیاریکردنی بزاڤە گۆڕانکاریەکە کەم دەکاتەوە لە چوارچێوەی خۆیدا نایهێڵێت، هەموو ئەم تیۆرەی کە باسم کرد و پارێزراوە بە هێزی سەربازی و خەباتکاری کە جیهادە، واتە جیهاد یەکێکە لە فەرزەکانی ناو ئیسلام. زۆرێك لە زانایانی کۆن و نوێ لەوانە (عزی کوری عبدول سەلام) تا دەگاتە (عەبدوڵڵا عەزام) هەندێك لەوانە پێیان وایە جیهاد ڕوکنێکە لە ئیسلام، واتا لەگەڵ شایەتومان و نوێژو ڕۆژو زەکات و حەج کردوویانەتە شەش پایە ئەویش جیهادە.

جیهاد و شۆڕشگێڕی لە ئیسلامدا لەسەرەتادا دژی کافر و موشریکەکان کراوە، جیهاد لە سەرەتاوە هەر لە مەککەوە فەرزکراوە پاشان خەڵکانێك لێیان تێکچووە لە گەڵ قیتالدا کە لەساڵی ٢ی کۆچی لە مانگی شەعبان دا فەرزکرا، بۆیە جیهاد پێنج جۆرە:
یەکەم: جیهادی نەفس.
دووەم: جیهادی قیتال و سەربازی.
سێیەم: جیهادی بەخشینی موڵك و سامان.
چوارەم: جیهادی وتنی حەق بە زمان بەرانبەر بە دەسەڵاتی خراپەکاران و زاڵمان.
پێنجەم: جیهادی شەیتان.
لەشیکاری ئەم باسانەدا بووم شێخ برقان هاتە تەنیشتم وتی ماکوان کەس نامبینێت چیت ویست هۆڵەکەم پڕکردووە لە برا جنۆکەکانت هەمووی فەقێ و زانا و دانشمەندن، بێخەمبە و قسەی خۆت بکە.
لەم وەستانەدا بووم کە گوێم بۆ شێخ برقان گرتبوو پرسیارێك بە ئەڵمانی هات، چونکە قسەکانی من هەمووی دەکراوە بە ئەڵمانی چەند بەناو مامۆستای زانکۆ دانیشتبوون، بەڵام من پڕوام نەکرد زانیم هەموویان جاسوس و موخابەراتن.
پرسیارەکە نوسرابوو: لێت دەپرسم تۆ ڕات چییە بەرانبەر بە جیهاد و قیتال لەم کاتەدا؟ کێن موجاهدەکان و ڕای تۆ چۆنە لەسەریان و چۆن دەتوانیت بۆمان باس بکەیت، دەکرێت ڕوونتر قسە بکەیت.
ماکوان: هەموو ئەم جیهادانەی باسمان کرد پەیوەستن بەتاکی مرۆڤەکانەوە، تەنها ئەدەبیاتی سەربازی و جیهادی قیتال نەبێت، کە پەیوەستە بە دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامی یاخود گروپ و حیزبە ئیسلامیەکان.
ئەم خەبات و شۆڕشگێڕیە لە جیهاد بووە بە سێ بەشەوە لای هەندێك لەو ڕێکخراو و گروپ و حیزبانە.
یەکەمیان: یەکخستنی جیهاد زۆر شلگیرن وەك هەندێك لە حیزبەکان نزیکن لە گروپی قادیانیەکانەوە کە پڕوایان بە جیهاد نەماوە وەك کاری مەیدانی، تەنها لەتیۆردا باسی فەزڵ و کاری شۆڕشگێڕی جیهادی دەکەن، بەڵام لە واقیعدا بوونی نیە و پەکیانخستوە (تعطیلیان) کردووە، تا ئەم کاتەی من تێیدا دەژیم بەم شێوەیە هەنگاویان ناوە ئیتر لە داهاتودا ئەگەری ئەوەی هەیە کە گۆڕانکاری لەخۆیاندا بکەن.
دووەمیان: زیادەڕەوی هەموو ئیسلام لە جیهادی قیتال دا دەبیننەوە، سەنگەر و جەبهەیان لەگەڵ هەموو دونیادا کردۆتەوە، ئەوەی لەگەڵ خۆیان نەبێت بە کافر و مورتەدی دەزانن، کوشتن و لەملدانی حەڵاڵ دەکەن. نموونەی ئەم جۆرانە زۆرن، ئێستا گروپی بۆکۆ حەرام و داعش یان هەندێکی تر لەو کۆمەڵانە کە ئێستا تاڕادەیەك نەماون وەك هیجرە و تەکفیر...هتد.

سێیەمیان: ئێوەندگیرن واقیعەکە دەناسن بە گوێرەی ڕەوش و واقیعەکە بیردەکەنەوە دەستدرێژی ناکەن و سەنتەری هێزی خۆشیان دەپارێزن، لەوانە حەماس و حیزبی تەحریر و...هتد.

پرسیارکەرێکی کورد: ناوم فازل ئەحمەدە سەرۆکی ڕێکخراوی مادلیام، بە هەردوو زمان پرسیارەکە دەکەم بۆ ئەوەی ئەو مامۆستایانەش کە هاتوون لە زانکۆی هانۆڤەرەوە تێبگەن. جیهادی تەڵەب و دەفع چییە؟ کاك ماکوان بێزەحمەت بۆمان باسکە هەر ئەم دوو جۆرە قیتالە هەیە؟

ماکوان: بەڵێ ڕاستە جیهادی قیتال و سەربازی دوو جۆرە لە ناو ئیسلامدا جۆری یەکەم پێی دەوترێت جیهادی دەفع واتا پاڵپێوەنان و خۆپاراستن وە جۆری دووەم پێی دەوترێت جیهادی طەڵەب (داواکردن).

جیهادی دەفع برتییە لەو خەبات و کۆششەی کە خەڵکی دەیکات لەسەر خاك و نیشتیمان و سەروەت و سامانی خۆی و ماڵ و خێزانەکەی وە پاراستنی شەرەف و کەرامەتی خۆی و خانەوادەکەی ئەمە لای هەمووان ناسراوە ئەم جیهاد و کۆششە پێی دەوترێت دیفاع لە خۆکردن و پاراستنی گیانی خۆتە.

جیهادی طەڵەب برتییە لەو کۆشش و خەباتەی کە تا ئێستا موسوڵمان بەکەمی لێی تێگەیشتوون بۆیان قوت ناچێت لەم سەردەمەدا لەبەر ئەوەی کە خۆمان دواکەوتوو و هیچ نەزانین شارەزانین لە دینەکەمان بۆیە زۆر بە دەگمەن دەبینی خەڵکانێکمان هەبێت لە جیهاد وکۆششی طەڵەب تێبگەن کە بانگەوازێکە بۆ ئەم دینە و ئەم ئیسلامە کە دینی کۆتاییە لەدوای ئەم ئاینە هیچ ئاینێکی تر نایەت کە وشەکانی وشەی خوای باڵا دەستە و لەسەر شانی یەك بە یەکمان پێویستە ئەم دینە بۆ خەڵکی ڕوون بکەینەوە و بانگەوازی بۆ بکەین تا ئێستا چواریەکی جیهان ئەم ئاینەی پێگەیشتوە. مەبەستیش لەوەی کە پێغەمبەر ی ناردووە خۆ تەنها بۆ عەرەب نییە، بەڵکو بۆ هەموو جیهانە کەواتە یەکەم کاری کۆشش و خەباتی جیهادی طەڵەب برتییە لە بانگەواز کردن بۆ ئاینی ئیسلام، نەوەك ئەوەی خەڵکی تێگەیشتووە شەڕکردنە لەپێناوی ئیسلامدا. دوو تێگەیشتنی جیاوازە، بیروباوەڕ بەزۆر بڵاو ناکرێتەوە، بەڵام بانگەواز لەسەر هەموو لایەکە مەرج نیە طەڵەبەکەی بە چەك و قیتال بێت.

دەبێت لەوە تێبگەین کە ئەرکی سەرشانمانە بگەڕێین بەم جیهانەدا بۆ بانگەواز کردنی ئەم ئاینە ئەگەر موسوڵمان ڕوونی نەکاتەوە خۆ ئەم ئەوروپیانە دەڵێن عیسا کوڕی خوایە یان خەڵکانێکی تر گا ئەپەرستێت یان خەڵکانێك هەر نازانن پەرستن چییە، هەیە دار دەپەرستێت یان ڕۆژ دەپەرستێت ...هتد

فازیل ئەحمەد: واتا مەسیحی و دینەکانی تر ڕاست نین؟

ماکوان: قسەکانم تەواو نەکردووە با تەواوی بکەم وەڵامی ئەوەشت ئەدەمەوە تکایە با بیرۆکەکەم بگات.

موتەرجم: تكايە كاك ماكوان هێواش قسە بكە بۆ ئەوەی بتوانین بەباشی تەرجومەی بكەین.
ماكوان "بەسەرچاو": كەواتە كێن ئەوانەی كە ئەو نەوە نوێیە تێبگەێنن كە خوا لە كەس نەبووە و لەكەسیش نایێت؟ كێن ئەوانەی كە بەخەڵكی دەڵێن خواكەتان مانگاو و مشك نییە؟ كەواتە لەسەرمانە كە هەوڵ بدەین بۆ بانگەوازی دینی خوا، بەندایەتیەكی ڕاست و دروست لە ناو خەڵكیدا بڵاو بكەینەوە كە خوای گەورە ئێمە بە ئومەتێكی شاهێد ناوزەد كردوە دەبێت بپرسین بۆ؟
كە خوای گەورە دەفەرموێت: { وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا } (البقرة-١٤٣).
واتە: هەروەكو چۆن ڕێنمایمان كردن بۆ قیبلەی ئیبراهیم (علیه السلام)، ئا بەم شێوەیە كردوومانن بە ئومەتێكی دادپەروەر وە چاكترینی ئومەتەكان بۆ ئەوەی لە ڕۆژی قیامەت ببن بە شاهێد لەسەر خەڵك كەوا پێغەمبەرەكان پەیامی خواییان بە خەڵكی گەیاندوە وە پێغەمبەریش ببێت بە شاهێد لەسەرتان كە پەیامی خوایی بە ئێوە گەیاندووە.
لێرەوە كە ئەركەكەی خۆتت زانی كە تۆ شاهێدی، سبەی ڕۆژ لە قیامەت خوای گەورە لێت دەپرسێتەوە، دەڵێی خوایە گیان ڕۆیشتم دینەكەی تۆم بڵاو كردەوە گوێیان بۆ نەگرتم یاخود بۆیان گرتم كاری تۆ لێرە تەواو بوو، بەڵام تا ڕۆژی مردن تۆ دەبێت هەر بانگەواز بكەیت، ئەمە جیهادی طەڵەبە گوتاری جیهاد و شۆڕشگێڕی ئیسلامیم لەسەر دامەزراندووە، نەك تەنها قیتال مەبەستم بێت.
لێرەدا دەبێت شتێكمان لە بیر نەچێت ئەویش بریتیە لەوەی كە سروشتی مرۆڤ وا هەڵكەوتووە یان پروات پێدەكات یان بە درۆت دەخاتەوە، وە یان خەڵكانێك ئەوانیش بیروباوەڕێكیتر دەپەرستن خەڵكانێكی تر سود وەردەگرن بەم پەرستنە سەروەت و سامانیان دەست دەكەوێت ڕێگریت لێدەكەن، یان دەسەڵات دارێكی زاڵمە بۆ مانەوەی دەسەڵاتی خۆی كە خەڵكەكەی لە چواردەور بمێنێتەوە سودی لە بێباوەڕی ئەوان وەرگرتووە بۆ هاتنە سەر دەسەڵات بێ شكو گومان دژایەتیت دەكات بۆسەو كەمینت بۆ دادەنێت وە بە سوپاو شمشێرەوە دێنە بەردەمت خۆ ناكرێت تۆ بڵێیت ملم ئامادەیە بۆ سەرپڕین، بێ گومان دەبێت تۆش سوپات هەبێت شمشێرت هەبێت بۆ گەیاندنی بانگەوازەكە ئەگەر دەوڵەت و دەسەڵاتت هەبوو.
ئەم چەمكی بانگەوازە پێویستی بە شمشێر نییە لە ئیسلامدا، بەڵام كاتێك بەرانبەرەكەت ڕێگات پێ دەگرێت و شمشێرت لێدەردێنێت ئەوكات تۆ پێویستت بە سوپا و شمشێر دەبێت كەواتە فكر بە فكر، گفتوگۆ بە گفتوگۆ هەر كات بەرانبەرەكەت شمشێری دەرهێنا دەبێت تۆش ئامادەبیت.
موسوڵمانان كەدەچنە جێگایەك خەڵكی ناكوژن لە سەر ئەوەی كە موسوڵمان نین، بانگەوازەكە دەكەن كێ وەریگرت سەرفرازە ئەوەی وەری

نەگرت و گوێی بۆ نەگرت خۆی زەرەرمەندە و بەجێی دێڵیت بۆ خوای گەورە، ئەوە خوا خۆی حوکمی دەدا لە قیامەت، کەواتە تۆ بۆت نییە هیچی لێبکەیت تەنها بانگەواز بۆ خەڵکەکە دەکەیت، وەك ئیمامی عومەر فەرمووی بە سوپاکەی کە بچونایە بۆ جیهاد ئاگاتان لە جوتیاران و خەڵکی ڕەش و ڕووت بێت، چونکە بە سروشتی حاڵ خەڵکی بە دوای ژیاندا دەگەڕێت و حەزی بە ئاژاوە نیە، ئەوەی کە ئاژاوە دەنێتەوە ئەوەیە کە دەسەڵاتی لە کیس نەچێت، لەڕاستیدا ئەوەی خێر بێت خەڵکی خێرا دوای دەکەوێت.[٤]

موسوڵمان هەرگیز ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتە ناکوژێت، بەڵکو شەڕی شەڕەفمەندانە لەگەڵ هێزو تواناداراندا دەکات، چونکە موسوڵمان تەنها لەگەڵ سوپادا دەجەنگێت، ئەوە مایەی سەربەرزی موسوڵمانانە کە لە هیچ مێژوویەکی باوەڕ پێکراودا نەبووە کە موسوڵمانان خەڵکی ڕەش و ڕووت بکوژن بۆیە چونەتە هەر جێگایەك خۆشەویستیان لە دڵی خەڵکیدا چەسپیووە وە خەڵکی زوو باوەشی بۆ کردوونەتەوە کە لە واقیعدا ڕەوشەکە لەبەر چاوە نموونەی وەك میسر. سەربازی ئیسلام بەرەو میسر ڕێکەوتن مەسیحیەکانی میسر ڕاستەوخۆ چوونە ناو سوپای عەمری کوری عاص دژی سوپای ڕۆم جەنگیان کرد ئەم مێژووە موسوڵمان نەینوسیووە قەشە یوحەنا نوسیویەتی بەناوی مێژووی میسر کە دەڵێن میسر واتا لیبیا و سودانی ئێستا، چونکە خەڵکی میسر بێزاربوون لە دەسەڵاتی ڕۆمی ئەرتۆدۆکسی، وڵاتی میسر تا سەدەی ٨ی هیجری زۆرینە هەر مەسیحی بوون ناسرابوون بە ئەرسیوونەکان بە حوکمی ئیسلام ڕازی بوون، لەگەڵ موسوڵمان دژی خاچ پەرستان جەنگیان کردووە. تەماشای ئەڵمانیا بکەن مزگەوتەکان هێندەی کڵێسکانن، لەبەرئەوەی موسوڵمانان بە ئاشتی هاتوون ڕێگەیان لێنەگیراوە، خەڵکی لەگەڵ کلتورەکەدا ئاوێتە بووە چەندین کڵێسا کڕدراوەتەوە و کراوە بە مزگەوت.
کەواتە موسوڵمانان تەنها دەجەنگن لەگەڵ گومڕاو دەسەڵاتدارانی خاوەن بەرژەوەندی خۆیان و ورگە زلەکانیان، بۆیە پێویستە سوپا لەگەڵ خەڵکانی بانگەوازچیا بن کەواتە بانگەواز ناکرێت مەگەر سوپای ئیسلام پاڵپشتی نەکات، ئەمە جیهادی طەڵەبە کە دەوڵەت ئەنجامی ئەدات نەك تاك.
پرسیارکەری کورد: ناوم ڕێبوار نوریە دەرچووی زانستە سیاسیەکانم لە ئەڵمانیا، پرسیارم ئەوەیە ئایا موڕتەد لە ئیسلامدا دەکوژرێت؟
ماکوان: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە دەکوژرێت. ئەم ڕێسا و یاسایە (حوکم)ە گشتیە، چونکە بە فەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەری خوا  حوکمەکە دامەزراوە. دەقی فەرمودەکە " من بدل دینه فاقتلوه"

---

٤ دەفەرموێت: {عمر بن الخطاب رضي الله عنه يخاطب الجيوش الفاتحة فيقول: اتقوا الله في الفلاحين، اتقوا الله في عموم الناس. وهم المغلوبون على أمرهم، الذين لا يهمهم مصلحة الحاكم هذا أو ذاك، إنما يريدون أن يتعلموا أين الخير فيتبعوه، اتقوا الله في هؤلاء، يقول: ولا تقتلوا إلا من قاتلكم}.

هەرکەس ئاینەکەی گۆڕی دەبێت بکوژرێت.
شیکاری لەسەر ئەم فەرموودەیە:
ئەگەر بەچاوێکی گشتی تەماشای ئەم فەرموودەیە بکەین، کەواتە ئەوەی لە ئاینی مەسیحیش بێتە ناو ئاینی ئیسلام دەبێت بکوژرێت، چونکە ئاینەکەی گۆڕیووە یاخود کابرای جولەکەش موسوڵمان ببێت، هەر دەبێت بیکوژین چونکە دینی جولەکەی گۆڕیووە بە ئیسلام.
ئایا تەفسیری ئەم فەرمودەیە چۆن دەکرێت؟
لە فەرموودەیەکی تردا کە ئەویش ڕاستە (صحیح)ەو کۆڕای لەسەر دروست بووە واتا(متفق علیه)ە تەفسیری فەرموودەکەی پێشترمان بۆ دەکات دەفەرموێت: خوێنی موسوڵمان حەرامە کە شەهادەتی هێنا بە خودای موتەعال و پێغەمبەر ﷺ ، مەگەر بەم سێ کردەوەیە خوێنی حەڵاڵ دەبێت.[٥]
- یەکەم: کەسێك کە هاوسەرگیری کردبێت و زینا و خیانەت بکات.
- دووەم: کەسێك بەناحەق کەسێکی تر بکوژێت.
-سێیەم: هەر کەس واز لە ئاینەکەی بێنێت و لە کۆمەڵی موسوڵمانان دابیڕێت.
لێرەدا مەبەست لەو کەسەیە کە موسوڵمان بووە، پاشان وازی لە ئاینەکەی هێناوە، یان لەبەشێکی یاخود لە هەمووی ئەگەر لە نوێژکردنیش بێت، بانگەشە بۆ کوفرەکەی خۆی دەکات و ئەو بڕیار ئەدات بۆ موسوڵمان. بانگەشە بۆ داهێنانی خۆی بکات واتا کەسە هەڵگەڕاوەکە پێناسەی ئاینی ئیسلام بکات بەردەوام تانە و تەشەر و قسەی بێسەروبەر بکات، ئەمە گومانی تێدا نییە کە دەکوژرێت. واتا ئەو کەسە دەبێتە دوو کاراکتەر: یەکەم خوا، پەنا بەخوا - ئەو بڕیاری ئاین ئەدات، کاراکتەری دووەمی جێگرەوەی پێغەمبەرە ئەو بڕیار و یاسا و ئەحکام دەردەکات بەبێ هیچ بنەمایەك، لە کۆمەڵی موسوڵمانان جیاواز دەبێت نێوانیان تێك ئەدات و خەڵکی لاڕێ و سەر لێشواو دەکات. ئەم کەسە دەبێت بکوژرێت نەك لە ئیسلامدا تەنانەت لەهیچ بەرنامە و دید و بۆچونێکی تردا ڕێگا نادرێت بەکەسێك لە خۆیەوە پێناسە بۆ بنەمایەك بکات کە هیچ وجودێکی نیە، واتا ناکرێت ئەندازیارێ پیشەی پزیشك بەکار بهێنێت و بڵێت من هەندەسەم خوێندووە لە کاری پزیشکیش دەزانم و نەشتەرگەری دەکەم. ئەو دەمە سەندیکای ئەندازیاران و پزیشکان هەردوولا سزای ئەو کەسە ئەدەن، بەهیچ شێوەیەك ئەمە جێگای قوبوڵکردن نییە چجای ئەو کەسەی کە باس لە ئاینێك بکات کە لەلایەن خوداوە هاتووە لەکاتێکدا ئەو وازی هێناوە لە ئاینەکە و پێناسەی بۆ دائەتاشێت داهێنانی تێدا بکات.

---

[٥] دەقی فەرمودەکەیە: " قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ الثَّيِّبُ الزَّانِي وَالنَّفْسُ بِالنَّفْسِ وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ " (متفق عليه)

یاخود کەسێکە لەناو دەزگایەکی گەورەی دەوڵەتی ئیسلامدا کار دەکات و هەڵدەگەڕێتەوە، ئەمە لە عورف و یاسای ئەمڕۆدا لەهەموو سەرزەویدا بە خیانەتی گەورە و جاسوسی هەژمار دەکرێت، جا هەندێك وڵات وەك ئەمریکا بە کورسی کارەبا دەیکوژێت، لە ڕوسیا دەخنکێنرێت، لە چین و کۆریا ئەتەقێنرێتەوە، لە ئێران لەسێدارە ئەدرێت و لە وڵاتانی ئەوروپا زیندانی هەتا هەتای دەکرێت، لە هەندێك وڵات ٢٥ساڵ زیندان دەکرێت بەگوێرەی ئەو یاسایەی لەو وڵاتەدا دەردەچێت، لە ئیسلامیشدا سزاکەی کوشتنە.
ئەمەش هیچ کەس ناتوانێت ڕەخنەی لێبگرێت، چونکە دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە گیانی خەڵکیتر لەدەست بچێت یاخود سەروەری وڵات و زیان بە دەوڵەت بگات و نهێنی ئاشکرا دەکات جا لە ڕووی سیاسی بێت یان ئابوری، یاخود سەربازی...هتد.
لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە دەڵێت: باشە من واز لە ئیسلام دێنم بێ ئەوەی بانگەشە دژی بکەم تەنها خۆم پروام پێی نیە، ئایا ئەم کەسە دەکوژرێت؟
بێگومان نەخێر ناکوژێت، بە بەڵگەی ئەوەی کەسێك لە ئەعرابیەکان هاتە شاری مەدینە بە پێغەمبەر  ی ووت: من موسوڵمان دەبم و بەیعەتت ئەدەمێ لەسەر ئیسلامەتی، بیعەتی دایە.
پاشان ڕۆیشت و ئازارێك هات بەسکیدا و ماوەیەك بەو ئازارەوە مایەوە، کەسە ئەعرابیەکە گەڕایەوە و وتی من بووم بە ئیسلام بۆیە وام لێهاتووە چووەوە بۆ لای پێغەمبەر  ووتی: من واز لە بیعەتەکەم دێنم و لە ئیسلام پاشگەز دەبمەوە، پێغەمبەری خوا  چەند جارێك ناڕەزای دەربری، بەڵام لە کۆتایدا کەسەکەی ئازادکرد لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕیدا، چونکە زۆرکردن نیە لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕ.
کۆتا پرسیار لەبەر ئەوەی کات نەما
کەسێك بەناوی سالار وەهاب، بەئاشکرا وتی: من کۆمەنیستم و مولحیدم پروام بە ئاین نییە.
کاك ماکوان هەست ناکەیت ئیسلام بە شمشیر بڵاوبۆتەوە؟ بە شمشێرو داگیرکاری دینەکەی بڵاو کردۆتەوە؟
ماکوان: باشە چەند ملیۆن موسوڵمان هەیە؟
سالار: زۆرە لە ملیارد تێپەڕیووە.
ماکوان: ڕاست دەکەیت، ئێستا ملیارێك و حەوسەدو پەنجا ملیۆنە.
چەند دەڵەوتێکت پێدەڵێم کە زۆرینەی موسوڵمانان پێك دێنن، ئیسلام یەك تاکە سەرباز و جوندی نەناردۆتە ناوی وەك چین، ئەندەنوسیا، مالیزیا، یەمەن عومان، فلیپین، تەتارستان، بۆتان و مەنگۆلیا، بیزەحمەت وەڵامت چییە بۆ ئەمەیان؟
سالار پاش کەمێك بێدەنگ بوون: بڵێم چی.

ماکوان: هیچ مەڵێ، ئەی پێت چۆنە سەربازی ئیسلام بەرەو میسر ڕێکەوتن مەسیحیەکانی میسر ڕاستەوخۆ چوونە ناو سوپای عەمری کوڕی عاص دژی سوپای ڕۆم جەنگیان کرد ئەم مێژووە موسوڵمان نەینوسیووە قەشە یوحەنا نوسیویەتی بەناوی مێژووی میسر کەدەڵێن میسر واتا لیبیا و سودانی ئێستا، چونکە خەڵکی میسر بێزار بوون لە دەسەڵاتی ڕۆمی ئەرتۆدۆکسی. وڵاتی میسر تا سەدەی ٨ی هیجری زۆرینە هەر مەسیحی بوون بە حوکمی ئیسلام ڕازی بوون، لەگەڵ موسوڵمان دژی خاچ پەرستان جەنگیان کردووە، ئەی بۆ ئەمەیان دەڵێت چی؟ پێشتریش باسم کرد.

سالار: کاك ماکوان من شارەزای مێژوو نیم کێ دەڵێت وایە؟

ماکوان: جا کاکی خۆم خۆ من قسە لە گیرفانم دەرناهێنم دەتوانیت دوای قسەکانمان دانیشیت و لە گۆگڵ بنوسیت یان لە ویکیپیدیا بنوسیت زانیاری تەواو دەخاتە بەردەستت.

سالار: ئەی کوردستان بە شمشێر داگیر نەکراوە؟

ماکوان: نەخێر.

سالار: ئەی هەموو مێژوەکان و خەڵك وا دەڵێن.

ماکوان: کوڕی باش تۆ ئێستا ووتت لە مێژوو نازانم، خەڵك کێیە تا لەخۆیەوە وابڵێت؟ دەبێت سەرچاوەیەك هەبێت واز لە خەڵك و مێژوو بێنە، تۆ لە هیچ جێگایەکەوە یان لە هیچ سەرچاوە و خەڵکێکەوە بیستوتە موسوڵمانان چوبێتنە سەر دەوڵەتێکی کوردی و داگیریان کردبێت؟

سالار: نازانم شارەزا نیم.

ماکوان: ئەی چۆن دەڵێیت کوردستان بە شمشێر داگیر کراوە؟

سالار: من ناڵێم خەڵك وادەڵێت.

ماکوان: تۆ واز لە خەڵك بێنە کاکە تۆ قسەی خۆت بکە، وەرە بە ئەقڵێکی ماددی بیر بکەینەوە لە ئەمریکا ساڵی ١٩٦٠ی زاینی لەهەموو وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا ١٣٠ هەزار موسوڵمان هەبووە، ئێستا ٨ ملیۆن موسوڵمان هەیە بەچی بڵاوبوویەوە؟

بەشمشێر؟

سالار بێدەنگە!

ماکوان: واز لە ئەمریکا بهێنە و وەرەوە بۆ ئەوروپا لە بەریتانیا، فەڕەنسا، ئەم ئەڵمانیایە و سوید، دانیمارك و نەرویج یان بابڵێین ئیتحادی ئەوروپی تەنها ١٦ملیۆن موسوڵمانی تێدایە، هەموو ئەوروپا جگە لە تورکیا ٥٣ ملیۆن موسوڵمانە، ئادەی پێم بڵێ کام شمشێر ئەمانەی موسوڵمان کرد؟

سالار: زۆر باشە من پروام بەو شتانەی تۆ نییە خۆم بە دواداچوون دەکەم و قسە دەکەینەوە.

ماکوان: لە ئێستاوە تا مردنی من کات بۆ تۆ کراوەیە کە زانیاریت هێنا لەسەر بەدرۆخستنەوەی قسەکانی من پەیمان بێت، کۆڕبەندێکی ترت بۆ بگرم لەسەر داوای خۆم.

دەستکرا بەپێکەنین و هەندێك لە کوردەکان هاتن بۆ لام و ئەڵمانیەکانیش زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردین و بوفێ ئامادەکرابوو بۆمان.

## بانگێشتی ماکوان بۆ ڕێکخراویی ماسۆنیەت

لە بوفێ خەریکی هەڵبژاردنی خواردنی ئێوارە بووم یەکێك لە ئەڵمانیەکان هاتە لامەوە ووتی: بەڕێز ماکوان حەزدەکەم لەسەر مێزی ئێمە نانەکەت بخۆیت و هاوڕێکانیشت بانگ بکەیتە لای ئێمە.
تەماشایەکم کرد و ووتم با بیرێکی لێبکەمەوە، چونکە ماندووم حەزدەکەم بە تەنها نان بخۆم.
بیرم لەوە کردەوە کە ئەمە دەیەوێت بمجولێنێت بۆ قسە و منیش تەرکیزم نەبێت و سوود لە کونێك وەربگرێت، چونکە ماندوو بووم و برسیشم بوو.
چووم بۆ لای سامان و فریاد سەیردەکەم سامان ئەوەندەی خواردن هێنابوو سەرم سوڕما: ئەوە دەیبەیتەوە بۆماڵەوە؟ ڕۆڵە بەشی خۆت بهێنایە.

سامان: وەڵڵا كاك ماكوان هەمووی دەخۆم.
ماكوان: ئەیكەیتە كوێ بۆ خاتری خوا، ئەوە بیكەیتە عەلاگەوە پڕی دەكات خۆ سكی من زلترە لەوەی تۆ.
فریاد لەولاوە كوڵاوە لە پێكەنیندا.
حوسێنم بانگ كرد: وەرە دانیشە نان دەخۆین ئەو كوڕانەش بانگ بكە با هەموو لەسەر مێزەكەمان كۆببینەوە، كە بینیان زۆرین و هەموو هاتنە لای من، ئاگام لێبوو كوردە مولحیدەكان هەر بە لاچاو تەماشایان دەكردین، لەداخا نانیان بۆ نەدەخورا. ئەوەی بۆی دەگەڕان دەستیان نەكەوت، رووم كردە فریاد: تێبینیت نەبوو؟
فریاد: برا كەلێنت تێدا نەهێشت، ئاگام لە ئەڵمانیەكانیش بوو سەرسام ببوون.
ماكوان: ئەو كابرا ئەڵمانیە داوای لێكردم بچمە لایان دابنیشم، من ئینگلیزم باش نیە فریاد وەرە ئەگەر قسەكرا سیقەم بەو كوردانە نیە قسەكان تایبەتە وەرە وەرگێڕانم بۆ بكە ئەگەر تاقەتت هەیە.
فریاد: لەخزمەتام با نانەكەمان بخۆین دەڕۆین.
ماكوان: سەیدا حوسێن زۆر مەمنونی جەنابتانم عەزێتان زۆركێشا ئەرێ بەڕاست كوا ئیقباڵ؟
حوسێن: لەدەرەوە وەستاوە ڕووی نەبوو بێت دابنیشێت.
ماكوان: خۆم دەچم بۆ لای.
چووم بانگم كردوو هێنامە سەرمێزەكە لە خواردنەكەی خۆشم پێدا، بۆ ئەوەی دڵی نەشكێت لەوە زیاتر.
فریاد: كاكە سور هەندێك جار ئەوەندە ڕەقی پیاو هەر ناوێرێت پرسیاریش بكات، هەندێك جاریش ئەوەندە ڕووخۆش و ئاسانیت مرۆڤ حەزناكات لێت جیا بێتەوە، ئەم كەسایەتیە سەیرە چییە تۆ هەتە كەس ناتوانێت بتخوێنێتەوە.
ماكوان "بە قاقای پیكەنینەوە": زۆر ئاسانە تۆ بۆت جیاناكرێتەوە، لەسەر ئیسلام بەرد لەچاوما هەویرە خوای گەورە لێم قبوڵ بكات. بەدەست خۆم نییە سوپاسی خوا دەكەم كە ئەو هەستەی پێداوم و ناتوانم لەئاستی دینەكەم سازش بكەم، بەڵام لەگەڵ خەڵكی خۆت ئاسایی و سەیدا حوسێن و كاكە سامان هیوایەتم قسەی خۆش و گاڵتە و گەپ و یاری كردنە.
فریاد: شتێكی زۆر سەرنج ڕاكێشم لە تۆدا بەدی كردووە ئەویش ئەوەیە لەوكاتەی كە هیچ هیواو توانا نەماوە دەرگا و پەنجەرەكان داخراون، ئەوەندە دەم بە پێكەنین و ئاسانیت ڕێك ئەڵێی ئاوی ناو سوراحیت چەند بەئاسان دێتە خوار بۆ پەرداخ، ئاوا دەتبینم و ورەی هەمووان بەرز دەكەیتەوە. ئەوكاتەی كە هیچ ڕووینەداوە لە بیریكی قوڵدایت و بەدوای ڕێگا چارەدا دەگەڕێیت، ئەمەت زۆر سەرنجی ڕاكێشاوم ماكوانی برام.

ماکوان: تۆ تاکە هاوڕێمی کە هەستت بەو جۆرە بوارە دەروونیەی من کردووە پێم وایێت ئەوەش پۆزەتیڤە نەك نێگەتیڤ، چونکە مرۆڤ ئاستەمە لەکاتی تەنگانەدا نەڕوخێت منیش ڕووخان ڕووم تێدەکات، بەڵام دەڵێم من خوام هەیە بەرانبەرەکەم هەرگیز لە من بەهێزتر نییە، دڵنیام بۆیە دەرگا و پەنجەرەم لەسەر داخراوە دەزانم لەدەرەوەی دەرگا و پەنجەرەکان طۆفانە، لەبەر ئەوەیە هەرگیز لەخوای گەورە بێ هیوا نابم، دوعایەك فێربووم ئەو دوعایە کە دەیکەم دڵنیام خوای گەورە دەمانپارێزێت.
فریاد: دەی ئێمەش فێرکە، با خوای گەورە بمانپارێزێت.
ماکوان: بەسەرچاو من هەمیشە لە ناڕەحەتیمدا دەڵێم بەرانبەر بە دوژمنەکانم
( وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ) واتا: ئێستا من خۆم و کار و بارەکانم دەدەمە دەست خوا و پشت بە خوا دەبەستم، چونکە بێگومان خوا بینایە بە بەندەکانی.
هەرکات توشی داخستنی دەرگاکان دەبم بەسەرمدا دەڵێم:
(أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ) خوایە پەروەردگارم تۆ پاك و بێگەردو تەنهای ئەوە من لەزاڵمەکانم فریامکەوە.
یان کاتێك ئەمەوێت شتیك باس بکەم و یاخود مێشکم سەرقاڵە بە کێشەکانی ژیانەوە دەڵێم
(وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا) هەر ئەوەندە دەڵێم خوایە زانستم زیاد بکە، زاتی بەرزت خاوەن زانستە سبحان الله مێشکم ساف دەبێت و ئەوەی بمەوێت تێیدا جێگای دەکەمەوە.
فریاد: دەی خوا تۆش لە ئێمە نەستێنێت ماکوانی برام، بڕۆین بۆ لای ئەڵمانیەکان؟
هەڵسایین چووینە لای ئەڵمانیەکان و ٣ کەس دانیشتبوون، ئەوەی کە بانگهێشتی کردین تەوقەم لەگەڵ کرد و ووتم ببورە ئەوکاتە ماندووبووم پێویستم بە پشوو بوو.
ئەوەی کە یەکەم جار هاتە لام هەڵسایەوە خۆی ناساند بە من و فریادی هاوڕێم وتی ناوم مایکڵ-ە، ئەوەش هێنریك و ئاڵبێرت-ن من لەمۆزەخانەی نیشتیمانی بەرلین-م و ئەم هاوڕێیانەم لە زانکۆی هانۆڤەرن. بەئینگلیزی قسەی کرد دەستی ڕاکێشا بۆ وەرگێرە کوردەکە بێتە لامان و هاوکاریمان بکات، منیش وتم پێویست ناکات وەرگێڕم لەگەڵدایە بەڕێز فریادە و ئەویشم ناساند.
مایکڵ بەردەوام بوو لەقسەکانی: خۆشحاڵ بووم بە ووتەکانت بە قوڵی باسەکەت کردەوە زۆر بەتوانا بوویت لە باسەکانت و توانات بەسەریدا شکا و زۆر موسیطر بوویت لەباسەکانت. ئەوەی سەرسامی کردم ئەوە بوو کە لەباسەکانتا هیچ دوو دڵیت پێوە دیار نەبوو ڕاستەوخۆ قسەت دەکرد، ئاگام لە

ڕەفتارو زمانی جەستەت بوو کە زۆر بەئاسانی هەموو پرسیارکەرەکانتان دەخستە ژێر فیکر و بۆچوونی خۆتەوە، ئەمەش خاڵی پۆزەتیڤی تۆ بوو.
ماکوان: سوپاس بۆ هەڵسانگاندنەکەت ئەوە نیشانەی سەلیقە و لێوردبوونەوەی خۆتانە.
هێنریك: بەڕێز ماکوان تۆ دەربارەی ئەوروپا و شەریعەت چی دەڵێیت: ئەگەر بۆتان بکرێت شەریعەتی ئیسلامی بەزۆر دەسەپێنن؟
ماکوان: بەڕێز هیچی خراپت لە شەریعەت دیووە یان هیچی لەبارەوە دەزانیت، وا بە ترسەوە باسی دەکەیت؟
هێنریك: من لەسەرم خوێندۆتەوە یاسای ئیسلامیە و شەریعەتەکەی بەزۆر سەپێنراوە لەزۆر جێگادا، لەوانەیە خەڵکی لە ئەوروپادا دیموکراسی قبوڵ بێت، چۆن دەبێت ئێوەی موسوڵمان شەریعەت لە ئەوروپادا بچەسپێنن؟
ماکوان "بە پێکەنینەوە": ئەی بەڕێز ئاڵبێرت هیچی نییە لەم بارەوە؟
ئاڵبێرت: پرسیاری هاوکارەکەم سەرنج ڕاکێشە، ئەگەر وەڵام بدەیتەوە پێم وابێت شتێکی گرنگە بێت بۆمان.
ماکوان "بە پێکەنینەوە": بۆ هاوڕێتە یان هاوکارتە؟ ئەوەندەی من بزانم لە ئەدەبیاتی ئێوەی ئەورووپیدا کەسێك لەدەزگایەکدا کار بکەن دەڵێن هاوکار، وەکو دەزگاکانی پۆلیس یاخود موخابەرات یان دەزگا ئەمنیەکان بەگشتی، ئەوانەی لە زانکۆکاندا دەرس دەڵێنەوە بە یەکتر ناڵێن هاوکار و ناوی یەکتر دەڵێن، وایە یان من هەڵەم ؟
مایکڵ: پێم وایە وردی لە بیروبۆچوونەکانتدا هاوڕێ وەرگێڕەکەشت زۆر بەباشی بۆت وەردەگێڕێ، هەست دەکەم زۆر دڵسۆزتە و وشەی جوان بەکاردەهێنێت و هەوڵ ئەدات بە باشترین شێوەش تۆ تێبگەیەنێت، من داوات لێدەکەم وەڵامی هاوکارەکانم بدەرەوە بۆ ئەوەی لێڵیەك هەیە لەسەر بیروبۆچوونی ئێمە ڕوون بێتەوە.
ماکوان "بە پێکەنینەوە": سوپاس بۆ سەلیقەکەت بەڕێز مایکڵ، دیارە هاوکاری جەنابیشتن، من بۆیە هاتوومەتە لاتان بۆ ئەوەی قسە و باس بکەین، خۆشحاڵیشم بەناسینتان چونکە من ئازادم لە قسەکردن ئەوەی بمەوێت دەیڵێم و ئەوەشی حەزم نەکرد ئازادم لەقسەکردندا وایە بەڕێزان؟
هەرسێکیان بەیەکەوە بەوپەڕی ئەدەبەوە بەڵێ؛ بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئازادی لە وەڵامەکانت.
ماکوان: وانەزانن پرسیارەکەتانم لەبیرکردووە یان خۆمی لێ ئەدزمەوە، ئەمە ڕای منە و لەسەر بنەمای ئەو شەریعەتە بۆتان باس دەکەم کە ئێوە لێی دەترسن.
شەریعەتی ئیسلام بەزۆر ناسەپێنرێت، ئەوەی بە زۆر بیسەپێنێت مونافیق دروست دەکات. شەریعەتی ئیسلام بەندایەتیە ئەوەی وەریدەگرێت دەبێت زۆر مەمنون بێت، ئێوەی ڕۆژئاوایی زۆرجار شتەکان تێکەڵ دەکەن یان لە چەواشەکاریتانە، یاخود خوێندنەوەتان بۆی لاوازە. دیسان دەیڵیم شەریعەت

بەزۆر ناسەپێت، بەڵکو وەردەگیرێت چونکە نیعمەتە و پێغەمبەر چووە شاری مەدینە سەرەتای هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە چاوەڕوانی ئەوە نەدەکرا کە (محمد) بکرێتە سەرۆکی دەوڵەت، لای هەمووان ئاشکرایە کە (عەبدوڵای کوری سەلول) کاندیدی ئەو دەوڵەتە بوو خاوەن پارەیەکی زۆر بوو بەڵام بێ پرۆژە بوو.

پرسیارەکە ئەوەیە کە چۆن پێغەمبەر ﷺ توانی کاندیدی ئەو دەوڵەتە لە بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان لە دەست کوری سەلول وەربگرێت، بێگومان بە پرۆژە! پرۆژەکان بریتی بوون لە نەهێشتنی جەنگی ناوخۆ.

هەردوو ئیدارەی ( ئەوس و خەزرەج) یەك بگرێتەوە بە موسوڵمان و موشریکەوە پرۆژەکەیان پەسەند کرد، پاشان دابین کردنی ئاو و خزمەت گوزاریەکان بۆ خەڵکی وڵاتەکە ئەم پرۆژەیە ئەوەندەی تر هێز و توانای دایە دەست موسوڵمانان، چونکە بەس دروشم نەبوو بڵێن ئیسلام چارەسەرە، بەڵکو لە مەیدانا ئاوی بۆ دەوڵەتەکەی تەرخان کرد، پرۆژەی ئامادەکردنی بازاڕ و دانانی بازاڕی ئازاد و دەرهێنانی لەدەست مشەخۆر و مۆنۆپۆڵچیەکانی جولەکە، دەتوانین بڵێین بۆرصەی ئیسلامی دامەزارند کە موسوڵمانان خۆیان خاوەنی بازاڕی تایبەت بن ئابوری لەژێر دەستی خۆیان بێت و ژێرخان و سەرخانی وڵات پارێزراو بێت تا سەروەری ئەو گەلە بپارێزن بە موسوڵمان و کافر و موشریك و جولەکە و ئەعرابەوە، کافر و موسوڵمان و موشریك هاونیشتیمانی بوون جزیە لەکەس وەرنەدەگیرا.

پرۆژەیەکی تری زۆر گرنگ چارەسەری کێشەی پەناهاندە بوو لە ناوەو دەرەوەی وڵاتەکە دابوو نەریتی ئینتیما لەسەر بنەمای بیر و باوەڕ و نیشتیمان بۆ گەلەکەی دەستەبەرکرد، پاشان گەورەترین پرۆژەی بریتی بوو لە دامەزاردنی سوپا و نەهێشتنی میلیشیای ئەوس و خەزرەجی و تۆکمەکردنی ڕیزەکان، لە کۆتاییدا هەموو ئەمانەی بە دەستور و یاسا ڕێکخست لە جێگایەکەوە (مزگەوت) کە یاسا سەروەر بوو لەو دەسەڵات و مەملەکەتەدا.

ئەمە مشتێك بوو لە خەروارێکی پرۆژە سەرەتاییەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمە شەریعەتە، شەریعەت بە پرۆژە خەڵك هەڵی دەبژێرێت ناسەپێنرێت.

ئاڵبێرت: قسەکان زۆر جوانن، بەڵام وایە؟

ماکوان "لەناخەوە زۆر توڕەبووم": هەندێك کەس کە قسەی جدیت بۆ کرد، لە بەرژەوەندی خۆی نەبوو ئیتر گومانی دەخاتە سەر.

بۆیە جەنابی ئاڵبێرت نابێت لە دەروونی ڕۆژئاوایی خۆتانەوە تەماشا بکەم، جەنابت دەزانیت کاتێك هیتلەر دروست بوو خۆ پرۆژەکەی بە دیموکراسی بوو بەوپەری ڕێزەوە خەڵکی دەنگی دایە زۆرینەی ئەڵمانیا لەگەڵیدا بوون، ئێستا خەڵکی لەئێوەش دەتوانن داوای بکەن ئەو سیستەمە نازیە هیتلەریە بگەڕێتەوە؟

مایکڵ: بەدڵنیاییەوە نەخێر.

ماکوان: بەڕێز مایکڵ دەمەویت وەڵامەکە لەدەمی بەڕێز ئاڵبێرت وەرگرم.
ئاڵبێرت: نەخێر
ماکوان: کەواتە ئێوە گەلێکی هەڵەن یان درۆزنن، کامیانن؟
هێنریك: باسەکە پەیوەندی چییە بەسەر قۆناغێکی مێژووی دۆیچلاند؟
ماکوان: دەمەوێت ئەوەتان پێ بڵێم مێژووی ئێمەی موسوڵمان شاراوە نیە تا وەکو بە ئەڵبێرت بڵێین جوانە جێگای ڕوا نەبێت، ئەوە دەمەوێت ئەوە بە ئێوە بڵێم  کە مێژووەکانتان پڕیەتی لە هەڵە و چەوت و چیڵی، لەگەڵ ئەوەشدا دڵتان بۆی لێئەدات و هەموو دەیشارنەوە لەناختاندا، چونکە بنەماکەی هەڵەیە و لەسەر بنەمای فیکری چەوت دامەزراوە، تەماشای ئێمەی موسوڵمان بکە لە وڵاتی  ئێوە و ڕۆژئاوادایین ڕۆژ بەڕۆژ مزگەوت و موسوڵمانان لەزیاد بووندان، ئەمە مانای سەر ڕاستی و توانا و جوانی پڕۆژەی ئیسلام دەرناخات؟
مایکڵ: بەشێکی زۆر لەقسەکانت تەواون، بەڵام منیش پێم خۆشە ڕاشکاوانە قسەت لەگەڵ بکەم ئەی ئەوە مانای ئەوە نیە ئازادی و دیموکراسی بەرقەرارە  بۆتان؟
ماکوان: سەرەتا ووتم یان چەواشە دەکەن یاخود تێناگەن ئەمە چی پەیوەندی هەیە بەدیموکراسیەوە؟ من باسی ئازایەتی و جوانی و ڕاستی فیکری ئیسلام دەکەم، باشە ئەگەر بڕیار وایە پیاوەتی لە ئێوەوەیە بۆچی بەئاشکرا ئێوەش لەم زەمینە دیموکراسیەدا بانگەشە بۆ نازیست و فاشیزم و ئەپارتایدی ناکەن؟ ئەی ئەوان مافی ئازادیان نیە لەم دیموکراسیەی ئێوەدا؟
مایکڵ: ئاخر ئەوانە لەڕێگای دیکتاتۆری و خراپەکاریانەوە بەیاسای نێودەوڵەتی یاساغن.
ماکوان: خۆت وەڵام بدەرەوە ئەی ئیسلام بۆ یاساغ نیە؟
مایکڵ: لەبەر ئەوەی خراپ نییە.
ماکوان: کەواتە خۆتان وەڵامتاندایەوە دیموکراسیەکەتان پیاوەتی نیە بۆ ئێمە ئەوە خۆمان باشین، خۆمان بەزۆر بەسەرتاندا سەپاندووە بۆیە ئاوا موحتاجن لەگەڵماندا، ئەگەر تورکەکان نەبوونایە لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە ئێوە لەژیر سفرەوە بوون، دەزانی کێ ئێوەی هەڵساندەوە؟ تورکەکان بوون ڕاستە ئێوەش بەتوانا بوون، بەڵام بە هاوکاری موسوڵمانان بوو لەگەڵتاندا کەستان دەتوانن بڵێن وانیە؟
مایکڵ: ڕاستە، بەڵام با منیش پرسیارێکی تر بکەم.
ماکوان: فەرموو!
مایکڵ: بۆچی لەوڵاتی خۆتان دێن بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوا؟
ماکوان: پێم وابێت وەڵامەکە زۆر ئاسانە کە تۆ لەمنی بکەیت بە پرسیارێك وەڵامەکەت ئەدەمەوە، ئێوە وەکو ئیستعمار بۆ وڵاتانی ئێمەی ئیسلامتان داگیر کرد؟

مایکڵ: بۆ ئەوەی لەجەنگە جیهانیەکاندا سود لەسەروەت و سامانەکانی وڵاتانی کۆلۆنیال ببینین و بەکاری بهێنین بۆ خۆمان.
ماکوان: وەڵامی پرسیارەکەت وەرگرت؟ ئێمەش لەدوای بردنی سەروەت و سامانی وڵاتەکانمان هاتووین بەشی خۆمان لێرە دەخۆین، چی دەڵێیت تۆ کە لەمۆزەخانە کار دەکەیت، هەرچی شوێنەواری دێرینی بابل و ئەکەد و دەستنووسی ئیسلامیە لە بەرلین و فرانکفۆرت و میوشنە، یاخود زۆربەی زۆری شوێنەواری دێرینی ئیسلامیەکان و وڵاتانی جیهانی ئیسلامی لە لەندەنە، بۆ؟
مایکڵ (دەستی کرد بە پێکەنین): من ئیتر پرسیار ناکەم هاوڕێکانم پرسیاریان نیە؟
ئەوانیش وتیان سوپاس بۆ بەڕێز ماکوان کاتمان گرتی.
ماکوان: سوپاس بۆ ئێوە خۆشحاڵ بووم لەگەڵتاندا چونکە هیچ نەبێت خاوەن ئینساف بوون کە وەڵامتان وەرگرت، ئەگەر چی بەدڵیشتان نەبێت بەڵام بێدەنگ بوون. ئەمە نیشانەی وشیاریی و ئاقڵی ئێوە دەردەخات، من سەرسامم بە ئەڵمانیەکان چونکە خاوەنی بیرمەندی گەورەی وەك مارکس و کانت و کافکا و سەدان دانیشمەندی تری وەکو شاتروسن.
مایکڵ: بچین بۆ لای بلیاردەکە پیاسەك بکەین و تەماشایەکی ئەو پێشانگا و گەلەری و وێنانە بکەین بەیەکەوە دوو بەدوو؟
ماکوان: ئەگەر ئاساییە با فریاد بێت، چونکە زۆر کار ئاسانیمان بۆ دەکات.
مایکڵ: ببورە، ئەگەر قبوڵ بکەیت وەرگێڕی خۆمان هەیە با ئەو بێت ئەوەی دەمەوێت پێت بڵێم نهێنیە و ناشمەوێت شاهێد بکەوێتەوە نێوانمانەوە.
ماکوان: ئاساییە بانگی بکە، داوای لێبوردنمان کرد لە فریاد دوو بەدوو ڕۆشتین، چەقەنەیەکی لێدا بۆ مێزێك کوڕێك هات بەدواماندا و لە نێوانی هەردووکمانەوە بەو پەڕی ئەدەبەوە لە دوامانەوە دەڕۆشت وتی ناوم جۆرج-ە و موتەرجمم لەنێوانی هەردووکتاندا.
منیش ویستم موجامەلەی بکەم، کاك جۆرج خۆشحاڵم خەڵکی کوێیت؟
جۆرج: من خەڵکی ئەڵمانیام و ١٣ ساڵە خەریکی زمانی کوردیم و وەرگێڕی دەکەم لەگەڵ سوپاکانی ئەڵمانیا لە هەرێمی کوردستان!
ماکوان: ببورە وامزانی کوردی.
جۆرج: ئاساییە من کوردی دەزانم.
مایکڵ: دەستی کرد بە قسە.
دوای ئەوەی کە بۆم وەرگێردرا داوای لێکردم کە هاوکاری ئەوان بم لە کارو پیشەکانیاندا و بە زانیاری دروست بۆ ڕێکخراوەکەیان.
ماکوان: هەر زانیاری بێت لەبارەی ئاینەوە بۆ من هیچ کێشە نیە لە ئێستاوە ئامادەم، چونکە من بەردەوام قسە و باسەکانم لەسەر فەیسبووك و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانی تر بڵاو دەکەمەوە، ئەگەر ئێوەش ئەو زانیاریانەتان پێویستە

بەخۆشحاڵییەوە، نەك داوام لێبکەن بەڵکو بەئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم.
لەوکاتەدا داوام کرد بڕۆم بۆ توالێت.
چووم بۆ توالێت و هاتمە دەرەوە شێخ برقان لەبەردەمم ئامادە بوو، داوای لێکردم کە هیچ ڕازامەندیەك دەرنەبڕم ئەوانە پیاوی ماسۆنیەتن و بانگێشتت دەکەن بۆ ناو ماسۆنیەت و دەستیان لەگەڵ ماسۆنی دونیادا تیکەڵە.
ماکوان: بەڕاستە؟
شێخ برقان: وریابە ناوی ڕێکخراوەکەشیان زۆر لە بابەتی خزمەت و هاوکارییەوە نزیکە، بەوە بانگێشت دەکەن ئاگاداربە!

## مار خۆشی لە سیر نەدەهات، لە کونەکەیدا دەردەهات

لە تەواو بوونم لە قسەکردنێکی خێرا و کورتدا لە نێوانی من و شێخ برقان گەڕامەوە بۆ لای مایکڵ.
مایکڵ ڕوویکردە جۆرج و وتی پێی بڵێ بەماکوان جاروبار منیش وەکو ئەو بەدەم خۆمەوە قسە دەکەم، ئاساییە!
ماکوان: بەڕێز مایکڵ پێویستە بەدەم خۆمانەوە قسە بکەین، چونکە ئەگەر وانەکەین چۆن خۆمان ئامادەکەین بۆ قسەکردن، خوای گەورە مێشك و زمان و دڵ و چاو زۆرێکیتر لە هەستە شاراوەکانمان کە خوای گەورە بە نیعمەتی خۆی پێی بەخشیوین پێویستە بەکاری بهێنین، ئەگەر وانەکەین هەست دەکەم سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار نین.
مایکڵ: زۆر ڕاستە!

ماکوان: نەخێر جەنابی مایکڵ تۆ نابێت بڵێی وایە، چونکە تۆ خوا ناپەرستیت، حەزیشم بە موجامەلە نییە لەکاتی قسە کردندا.
مایکڵ: بە سارسامییەوە، نا- وانیە منیش پڕوام بە خوا هەیە.
ماکوان: خودا پێناسەیەکی لاستیکیە هەموو کەس دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی ڕایبکێشێت، دەبێت بپرسم تۆ پڕوات بە چی جۆرە خوایەك هەیە؟
مایکڵ: ئەو خوایەی کە ئەم بوونەی دروست کردوە، مەگەر تۆش پڕوات وانیە؟
من پڕوام وایە ئەوە ٥٠٪ پرسیارەکەمت وەڵام دایەوە، نیوەکەی تری وەڵامەکەیت هەڵپەساردووە. کام خوا با زیاتر بۆت ڕوون بکەمەوە، خوای سێگانەیی واتا خوا و عیسا و ڕۆحی پاك یان خوای دیکارت، کانت، بودا یان خوای یەهودای جولەکە؟
مایکڵ: ڕاستیت دەوێت زۆر بیرم لە خواکان نەکردۆتەوە، بەس پڕوام بە خوایەك هەیە کە هەست بە بوونی دەکەم و بەرجستەیە لەم بوونەدا لەڕێگای دروستکراوەکانیەوە.
ماکوان: باشە ئەمە قسەی ئەنطۆنیو فلو-ە لە ساڵی ٢٠٠٤ لە مولحیدیەوە گەڕایەوە بۆ باوەڕ ئەو قسەیەی کرد، ئەمە بیروباوەڕێکی زۆر کاڵە. دەمەوێت ئەوە تێبگەیت، تۆ ئەو خوایەی کە دەیناسی هیچ پەیوەندیتان هەیە بەیەکەوە؟
مایکڵ: نا- هیچ پەیوەندیەکمان نیە، پێم وانیە پەیوەندیم بۆ دروست بکرێت لەگەڵیدا.
ماکوان: تۆ جەنابی مایکڵ زۆرجار شەیتان بە خوا دەزانن، نازانم هۆکار چییە؟ حەز دەکەم واقعی بم، زۆرێك لە ئێوە بەین و دۆستایەتی و خزمەیاتی و زۆرجاریش بەندایەتی بۆ دەکەن، من هەڵەم یان ڕاستم؟ تکایە ئەم پرسیارەی من جدیە گاڵتە ئامێز نیە.
مایکڵ: بەجدی وەریدەگرم بەدڵنیاییەوە وایە، لای ئێمە فەلسەفەیەك هەیە دەڵێت باشە و پیاوەتی بکە لەگەڵ شەیتان تا لەشەڕی دوور بیت.
ماکوان: پێت وایە ئەوە فەلسەفە بێت، یان قسیەکی زۆر زۆر چەواشەکاری بێت بۆ شاردنەوەی حەق؟ شەیتان کوا لەگەڵ ئێمەی مرۆڤ نێوانی باشە، تا پیاوەتی و نەجابەت بزانێت و تۆش باشەی لەگەڵ بکەیت.
مایکڵ: زۆر باشە ئەم باسە قسەی نێوانی من و تۆ نییە و باسێکی لاوەکییە، ئەوەی ئەمەوێت بە تۆ بڵێم ئەوەیە تا هاوکاریمان بکەیت لە ڕووەکانی زانیاری و ووردەکاریەکانی ململانێی ناو ئیسلامیەکان و پاشان ڕێکخراوێکمان هەیە بەناوی ڕێکخراوی ئاراستەی چاو.
ماکوان: بەڕێز من تەمەنم ٤١ ساڵە بونیادی کەسایەتی خۆمم کردووە بە دەربەدەری، هیچ کات هەوڵم نەداوە بەسەر پشتی کەسدا سەربکەوم وە ناشمەوێت خەڵکێك بەناوی ڕێکخراو و بەناوی پارە و بەناوی جوانیەکانی ژیان جاسوسیم پێبکات، واش بزانێت خۆی زۆر زیرەکە و منیش گەمژەیەکم لەو

گۆرە، جا من ئەگەر کاری ڕێکخراوەیی بکەم لەگەڵ نیشتیمان و خەڵکی وڵاتی خۆمدا دەیکەم، پێویستم نیە و کاتم بۆ دانەناوە و بیریشم لێ نەکردۆتەوە. پێش ئەوەی تۆ بیر لەوە بکەیتەوە کە من کاری جاسوسی بکەم ساڵەکانی ١٩٩٢-١٩٩٣ ئەو کارانەم کردووە بۆ وڵاتەکەی خۆم و تەجوروبەیەکم لێوەرگرتوە، بەتەمای منیش مەبە، باشە؟
ئاگام لێی بوو دەم و چاوی دا بەیەکدا...
مایکڵ: باشە حەزمان کرد خزمەت بکەیت لەگەڵماندا ئەزمونێکی باشت وەردەگرت و ژیانیشت لەوانەیە خۆشتر بوایە.
ماکوان: سوپاس بۆ خوا ژیانم زۆر خۆشە و بەدوای خۆشی ژیانیشەوە نیم، بەڵکو بەدوای ناسینی حەقم و ڕووم لە پەروەردگاری خۆمە. ئەمەوێت لایەنی خوا بم کاتێکی خۆشمان بردە سەر دەستم برد تەوقەم لەگەڵ کرد و ماڵئاوایم لەهەموویان کرد.
لەگەڵ هاوڕێکانم هاتینە دەرەوە چوین بۆ دۆنەرەکەی حوسێن و لە لای دۆنەرەکەی حوسێن ماڵئاوایم کرد لە هاوڕێکانم و دەبوو کاتژمێر ٤ بەیانی بگەمە کیڵ و هەر لەوێوە ژوورم لە ناو کەشتیەکەدا بەکرێ گرت و ووردە ووردە کەوتەمە ڕێ بەرەو کیڵ و لەوێشەوە بەرەو وڵاتی نەرویج. لەڕێگادا نەمدەوێرا بەنزین تێبکەم دەترسام سورکێوێك یان ویرسانێك سەرکەوێت لەگەڵمدا تووش ببمەوە، ئۆتۆمبێلەکەشم بەتەواوەتی لاوازببوو لە بەنزین هەر دەبوو لابدەم.
ناچار لامدا لە بەنزینخانەیەك و ئۆتۆمبێلەکەم پڕکرد، پاشان قاوەیەکم خوارد لەگەڵ هەندێك خواردنی تردا و هاتم پارەکەی بدەم.
یەکێك بە کوردی: پارەکەتم هەموی داوە!
منیش ئاوڕمداوە بزانم کێیە، تەماشام کرد کەسێکە لە هاوڕێ کۆنەکانی خۆم بەناوی سەیوان، بەڵام زۆر خۆشم نەدەویست دەمزانی لە ئەڵمانیا دەژی و لە پاڵتۆك یەکتریمان دۆزیبووەوە، دەشم زانی دڵ ئاوێنەی دڵە و ئەویش زۆر خۆشی لە من نەدەهات هەمیشە تانەو تەشەرمان لەیەك ئەدا بە هۆکاری ئەوەی لە ڕووی بیرو باوەڕەوە نەدەگونجاین.
چووم سوپاسی بکەم پێی بڵێم کاکە خۆ لە کانی وەتمان لامنەداوە پێویست ناکات تۆ پارەی بەنزین بدەیت. خواردنەکە بەهەرحاڵ، بەڵام بەنزین بۆ؟
هەر کە وام پێووت ئەویش بەتانەوە: کابرای خاوەن بەنزینخانە بەتەنها پارەی قاوە خواردنەکەت وەرناگرێت دەبێت هەمووی بدەم، دیاربوو ئەویش پێوە ببوو. منیش چوومە لای لەسەر کورسیەك بەیەکەوە دانیشتین پرسیم بۆ کوێ دەچیت؟
سەیوان: دەڕۆم بۆ نۆرمبێرگ بۆ ماڵی براکەم.
کەوای وت زۆر خۆشحاڵ بووم و وتم سوپاس بۆ خوا جنۆکە نیە، بەڵام ئەوەندە قسەی ڕەق بوو خێرا تورەی کردم، زۆر دانم بەخۆمدا گرت تەنها وەڵامم داوە.

سەیوان: مامە چاك ناوبانگت دەرکردووە لەم فەیسبووك و پاڵتۆکەوە چاك ناسراویت، هەموو کەس دەتناسێت چیت دەوێت ئیتر؟
ماکوان: بەخوا برا پێم وانیە ناو و ناوبانگ ئەوەندە شتێکی باش و چاك بێت، بەڵام من خۆم خۆمم دروست کردووە. بۆ زانیاریت ناوبانگ دەرکردنیش باجی خۆی هەیە، پارەی بەنزینەکەی دابوو نەمدەویست زۆر قسەی ڕەق بکەم و خاتریم گرت حەقی بەنزین و قاوەکە.
سەیوان: کاکە دەرکەوتن و ناوبانگ دەرکردنت بەئاسان دەست کەوتووە، ئەوەی بۆ تۆ هەڵکەوت بۆ کەس هەڵنەکەوتووە.
ماکوان: سەیرە هەرچی دەمەوێت دان بەخۆمدا بگرم، بڵێم چی قسەیەکی ئەکادیمیت بۆ دەکەم، بەڵکو لێم تێبگەیت سەیوان گیان.
ئەویش ئەوەیە ئەم دوو دەستەواژەیە ملی زۆر کەسی شکاندووە و زۆریشی بەرز کردۆتەوە. هەر کەس ناوبانگ دەردەکات مەرج نیە بەدەستی خۆی بوویێت، بەڵام هەیە پلانی بۆ دادەڕێژێت و خۆی کەسێکی قیادیە تابتوانێت ناو ناوبانگ دەربکات.
لە هەردوو حاڵەتەکەدا مرۆڤەکە گرنگە کە ناوبانگ دەردەکات، دیسان لێرەوە دێینەوە سەر ئەوەی بڵێین: ئایا ناوبانگەکەی باشە یان خراپە؟ بۆ نموونە ناوبانگی ئەبو جەهل، فیرعەون، ئەبولەهەب، جەنگیز خان، ڕیچارد، هیتلەر، مۆسلۆنی، ستالین تا دەگاتە موعەمەر قەزافی و بەشار ئەسەد...هتد. لەم ناوانە زۆرن کە لە ئاسمانی بودەڵی و گەندەڵی و خوێن ڕێژیدا دەدرەوشێنەوە.
پێچەوانەکەشی خەڵکی باش و ناودار هەندێکیان خوای گەورە پلەو پایەی بەرزدەکاتەوە واتا مەبەستم بەوەیە کە بە هەواڵ یان بە وەحی دەگاتە لامان وەك پێغەمبەران- سەلامی خوایان لێبێت- و هاوەڵانیان و پیاوچاکان بە گشتی، هەندێکی تر بە ڕێگای ئەوانەوە ناوبانگ دەردەکەن شوێن پێی ئەوان هەڵدەگرنەوە.
پاشان دەشێت هەندێك بە ئازایەتی و جوامێری و چاونەترسی ناوبانگ بۆ خۆی بپچڕێت، هەندێکی دیکە بە زیرەکی و لێهاتووی و حیکمەتی. هەندێکی تر لە توانای ئیدارەو کاری سیاسی توانای ئەوەی هەیە کە کاریگەری لەسەر خەڵکی دابنێ، ئەشێت زۆر ڕێگای تریش هەبێت من ئاماژەم پێنەدا بێت.
هەندێك جار خەڵکی گەمژە سیاسیەکان یان دەوڵەمەندەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان گەورەی دەکەن و کارەکانیانی پێ ئەنجام ئەدەن، چونکە دروستکراون زوو لەسەر شانۆکە نامێنن و لە ناودەچن یاخود ون دەبن، بە پێچەوانەوەش کەسی خاوەن کەسایەتی بەهێزو قیادی ئەم وتەیە لەگەڵیدا ناڕوات بە پارسەنگی خۆی دەتوانێت ئیحتیوای هەموو لاکان بکات.
پەیامی من بۆ تۆ کاکە سەیوان ئەوەیە، ئەگەر ئەو کەسە خۆی قابیلی ئەو ناوبانگە نەبێت بە دڵنیاییەوە پێی ناگات، وەك هەندێك نموونە:

شێخ محمودی حەفید:
ئەوەندەی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود هەوڵی داوە بۆ گەڕانەوەی خیلافەتی عوسمانی هیچ کەسێکی کورد ئەوەندە هەوڵی نەبووە دژی ئیتحادیەکان بوو، مەبەستم (ئیتحادی تورەقیە)، ئەوەندە دژایەتی کردن، تاکو- نەفیان کرد بۆ موسڵ. لەشاری موسڵ ئیتحادیەکان، بۆ برایەکی شێخ مەحمود بەناوی شێخ ئەحمەد تۆمەتێك دروست دەکەن، کە گوایە پەلاماری ئافرەتی داوە و لە ناو شاری موسڵدا. باوکی واتا شێخ سەعید شێخ ئەحمەد دەکوژن کە ئەو ڕوداووە هەمووی درۆ و دەلەسەی کەمالیستیە تورەقیەکان بووە، کاتێك شێخ محمود دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوك لەبن دەستی ئیتحادییەکان ڕزگاری دەبێت و ئەو کارەساتە هاتووە بەسەر خانەوادەکەیاندا بنەماڵەی تاڵەبانیەکان  بە تەکیە و شێخ و ماڵەکانیانەوە لە پشتی شێخ مەحمود دەوەستن و هاوکاری دەبن و ڕەمزێتی خۆشەویستی و شۆڕشگێری بۆ شێخ محمود لێرەوە دروست دەبێت، ئینجا دەگەڕێتەوە شاری سلێمانی و پێشوازی مەلیکی لێدەکەن. هیچ کەس لە بنەماڵەی تاڵیبانیەکان نەیانوت ئێمە شێخ محمودمان پێگەیاندووە و دروستمان کردووە، چونکە خۆی توانا و هێزی کەسایەتی خۆی بوو.

مەلا مستەفای بارزانیت بۆ باس دەکەم.
کاتێك باسی مەلا مستەفای بارزانی دەکەین چۆن ناو و ناوبانگی لەسەر ئاستی  کوردستانی گەورە دیارە و بوونی هەیە، خۆ ئەم پیاوە لە هیچ جێگایەکەوە دیار نەبوو، تەنها برا گەورەکەی و مامەی نەبێت کە دووکەسی سۆفی و خاوەن تەریقەتی نەقشبەندی بوون لە تەکیەی بارزان و  بە درێژایی مێژووی ئەو بنەماڵەیە خەڵکێکی سۆفی و لەسەر تەریقەتی قادری بوون سەرەتا، دوای گەڕانەوەی مەولانا خالید نەقشبەندی ئەوانیش تەریقەتی نەقشی وەردەگرن و لەسەردەمی ئینگلیز شێخ عەبدولسەلامی بارزانی داوای ئیدارەی سەربەخۆ دەکات بۆ ناوچەی بارزان، مەلیکی  ئەو دەمەی عێراق هەموو مافێکی پێدەبەخشێت بۆ ناوچەی بارزان، ئیتر بارزانی لێرەوە ناو و ناوبانگ پەیدا دەکات، ڕازیی نیە بە ئیمارەتی بارزان، بەڵکو بیرکردنەوە و ڕوشدی لەوان بەهێزترە داوای کوردستان دەکات دەست بە خەبات دەکات بۆ ئەو ئامانجە، دێتە سلێمانی و لە ژێر ئاڵاکەی شێخ مەحمودی حەفیدا جەنگاوە، دوای ئەوەیش کە کۆماری مهاباد دادەمەزرێت خۆشی دەگەیەنێتە بن ڕکێفی قازی، ئیتر ڕەمزێتی مەلا مستەفا خۆی دروستی کردووە نەك شێخ محمود و قازی محمد، بەڵکو هەوڵە نەتەوەییەکەی وای لێکردووە ببێتە مەلا مستەفای بارزان.

مەسعود بارزانی:

ڕەمزێتیەکەی لە باوکییەوە بۆ ماوەتەوە، بەڵام خۆشی قابیلەیەتی هەبووە. ئەم جۆرەیان لە ناوناوبانگ پەیدا کردن زۆر گرنگ نیە، چونکە پشتاو پشت بۆی دەمێنێتەوە خۆی کاریگەری نەبووە لە دروستکردنی، بەڵام گرنگی لەوەدایە کە کەسەکە ئەو ڕەمزێتە لە ناو نەبات و زیاتر پەرەی پێ بدات، جا مەسعود بارزانی لەم جۆرەی تریانە خۆی خاوەنی ڕەمزەکە نەبووە لە باوکیەوە بۆی ماوەتەوە، بەڵام خۆشی بەتوانا بووە توانیویەتی بیپارێزێت. بەهەرحاڵ من ناوم ناوە لەو دوو جۆرە کە خۆیان دروست دەکەن ئەوانەم ناوناوە بە کوڕی دایکیان واتا خۆیان خۆیان دروستکردووە نەك دەستی کەسی تری تێدا بێت، وەك باوك یان بنەماڵە، لەوانەی تریش هەیە کوڕی باوکێتی ئەم ناوەش بۆ ئەوەم داناوە کە لەبنەماڵە یاخود لە باوکییەوە ناو و ناوبانگی بۆ دروست دەبێت.

جەلال تاڵەبانی:

لەسەرەتای دروستبوونی شۆڕشی کوردی کە ئەوکاتە لە قاهیرە قوتابی یاسا دەبێت، دەتوانێت وەك ڕەوەندی کوردی لەگەڵ هەندێك لە هاوکارەکانی وەك محمد شەیدا و کۆمەڵێکی دیکە لە کوردان لەوێ دەکەونە چالاکی و تاڵەبانی ئیسپاتی تواناى خۆی دەکات، پاشان هەر لە منداڵیەوە دروستکەری یەکێتی قوتابیان دەبێت کە بارزانیش سەرۆکی ئەو حیزبەیە هیچ ئاراستەیەك ناداتە تاڵەبانی، بەڵکو هەڵکەوتەی خۆی و تواناى خۆیەتی، تا دەگاتە پلەی مەکتەبی سیاسی و لە هەمانکاتدا ڕەخنەی هەیە لە ئادایی کاری بارزانی و دەتوانێت زۆرینەی قیاداتی شۆڕشی کوردی لە خۆی کۆبکاتەوە و مەلا مستەفا بەتەنها بهێڵێتەوە پیاوانێکی وەك د.خالد، ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر دەبابەو .. هتد، لەگەڵی بکەونە کار کردن و ئەو کاتە پێیان دەوترا باڵی مەکتەبی سیاسی و لەناو خەڵکیدا بە جەلالی ناسراو بوون، دواتریش دامەزرێنەری یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە.

باسی ناوبانگی نەوشیروان موستەفا:

کەسێکی دوورە پەرێز لە ڕووداوەکان بە ڕووکەش، لەهەمانکاتدا بوونی وجودی ژێر بە ژێری لە بینا کردن و ئاراستەی شۆڕشی کوردی، لەسەردەمی جەلالیەکانەوە خاوەنی گۆڤاری ڕزگاری بووە لە سلێمانی کە زمانحاڵی جەلالیەکان بووە، پاشان هەمیشە توانیویەتی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت و لە هیچ کەس لە سیاسیەکانی کورد نەچووە و جیاواز بووە، کاتێکیش کراوە بە سکرتێری کۆمەڵە ڕازی نەبووە بە ناوەکەی لە کۆمەڵەی لینین-ی و مارکس-یەوە کردیە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، ئەزموونی لە سیاسەت و کاری ستراتیژی و مێژوودا هێزی زۆری داوەتە کەسایەتیەکەی و تا لە کۆتایدا توانی ئەویش دامەزرێنەری گەورەترین بزوتنەوە بێت لە دوای یەکێتی و پارتی بەتەنها.

محمدی حاجی محمود:
کەسێکی ئازاو بە ئەزمون لە ژیاندا  توانای ڕاگرتنی پارسەنگی خۆی و نەیارەکانی و  بە ئازایەتی و دەست و مەچەك و شۆڕشگێڕی، پاشان دڵسۆز بۆ  نیشتیمان و خەڵکەکەی رەمزێتی دروست کردووە و حەزی بە ئازاردانی کەس نەبووە، مەگەر ئازاریان دابێت. توانیویەتی ببێتە کەسایەتیەکی عێڕاقی و پاشان تاڕادەیەکیش جیهانی لە دێیەکی بچوکەوە کە گوڵەخانەیە کاریگەری خۆی لەسەر ڕووداوەکان تەنانەت حیزبەکان و دەوڵەتە زلهێزەکانیشی داناوە، بێ ئەوەی هیچ کەس بەشدار بووبێت لە پێگەیاندنی خۆی توانای پێگەیاندنی  خۆی هەبووە.

سەدان سەرکردەی تری شۆڕشگێڕی عەلمانی هەیە کە من باسم نەکردون وەك  ئۆچ ئالان،  قاسملۆ، شەرەفکەندی، شێخ عیزەدین، عەبدول حەکیم دەروێش.. هتد. ئەوانەی تەنها نموونەی بەرچاون کە هێناومەتەوە.
ئەم قسانەی هیچی بەدڵ نەبوو، چونکە خۆشی لە هیچیان نەدەهات.

ئیسلامیەکان..
لەناو ئیسلامیەکاندا سەرکردەی زیرەك و خاوەن هەڵوێست و ئازاو جوامێری تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام بە هۆکاری  دووبەرەکی و شەڕە پاڵنانی حیزبایەتی و پۆست و مەقام نەیانتوانیووە ڕەمزیەت بۆ خۆیان دروست بکەن، هەڵبەت لەچاو عەلمانیەکاندا باس دەکەم  دەنا نموونەی باشیان هەیە، هەندێك لە ئیسلامیەکان:

شێخ عوسمان عەبدول عەزیز:
پیاوێکی دیندار و سەرکردەیەکی ئیمانی و ڕۆحی و پاك،  دوور لە هەموو حەزو ئارەزوویەکی دونیایی، بەڵام  دەوروبەرەکەی بە گوێرەی پێویست نەبوون لەگەڵیدا و نەیانتوانی بیکەنە ڕەمزی کوردایەتی و ئیسلامەتیش کە دەکرا وەك مەلا مستەفای بارزان هەنگاو بنێت، ئەم پیاوە ڕێزێکی زۆری هەبوو لەناوەوە و دەرەوەی ولاتدا، ئەمیش بەهۆکاری توانای براو خانەوادەکەی پێگەیشت، بەڵام  ڕەمزێتەکە لەمەوە سەرچاوەی گرتبوو. خەڵکی زیاتر مامۆستا مەلا عوسمانی دەناسی و ڕوو دەکرایە ئەم پیاوە نورانیە بە ویقارە.

شێخ عەلی عەبدول عزیز و شێخ سدیق و کورانی ئەو بنەماڵەیە:
مامۆستا مەلا عەلی خۆی پیاوێکی ئازاو چاونەترس و جوامێر بوو، بەڵام ڕەمزێتەکەی هەر لە جەنابی شێخ عوسمان عەبدولعەزیزەوە بۆیان ماوەتەوە ئینجا ناو و ناوبانگی بنەماڵەکەی پێناسراو کورانی ئەو بنەماڵەیەش هەموو ئازاو چاونەترس بوون لە هەمووکاتێکدا لە پێشی پێشەوە بوون کە دۆست و دوژمنیان ئەو شاهیدیەی بۆ داون، بەڵام وەك لە باسی مەسعود بارزانیدا ووتم ئەمانە هەموو کوڕی باوکیانن و خۆیان کاریگەریەکی ئەوتۆیان نەبووە لە دروستکردنی ڕەمزێت لە بنەماڵەکەیانەوە بۆیان ماوەتەوە.

مامۆستا ئەحمەد کاکە محمود:
لەناوچەی هەورامان ئازایەتی و خواناسی و پاشان نوسەرێکی بەتوانا لەناو مەلاکانی کوردستاندا توانیویەتی زۆرترین بەرهەمی نوسین خزمەت بە گەلەکەی بکات ئەمیش توانیویەتی خۆی ڕەمزێت بۆ خۆی دروست بکات، پیاوێکی ماندوو و ئازا بووە. هەرگیز سڵی نەبووە لە دوژمنانی ئیسلام و بە درێژایی تەمەنی دژایەتی بەعسی ئەفلەقی کردووە.

شێخ محمد بەرزنجی:
ئازایەتی خۆیی و زیرەکیەکەی لە مەزهەبی ئیمامی شافعی و حەقبێژی توانیویەتی ڕەمزێتی بۆ دروست بکات و بیکاتە خاوەنی بیرو مەنهەج، دامەزرێنەری ڕابیتەی چەکداری بووە لە شاخ و مەلا هاوڕێکانی هاوشانی خۆی بوون وەك مامۆستا سدیق سەرگەتی، مامۆستا شێخ لەتیف پێنجوێنی و زۆرێکی دیکە لە پیاو چاکان کە هاوشانی ئەم پیاوە بەڕێزانە بوون خۆیان توانیوویانە ببنە قیادی لە زەمینەکەدا.

زۆرێکی دیکە لەو مەلا و شێخە بەڕێزانە کە دامەزرێنەری ڕابوونەکە بوون، ئەمانە نموونەی بەرچاو بوون. ئێستا دێمە سەر داینەمۆی ڕابوونی ئیسلامی ئەوانەی خۆیان- خۆیان دروست کردوە:
مامۆستا سەڵاحەدین بەهائەدین و کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی:
مامۆستا سەڵاحەدین پیاوێکی بێدەنگ و ئارام چالاك لە کاری تەنزیم و ئیداری و مونەزیرێکی ئیخوان لەناو گەلی کورد لەهاوشانی ئەم پیاوە. مامۆستا هادی عەلی و کۆمەڵێکی دیکە لە هاوڕێیانیان لە شاری هەولێر و سلێمانی. نموونەی مامۆستا حەسەن پێنجوێنی و سەید ئەحمەد و مامۆستا محێدین گەڵاڵی، بورهان ئەمین و زۆری دیکە کە خۆیان- خۆیانیان دروست کردووە.

مامۆستا کرێکار:

یەکێك لە پیاوە ئازاکان و بیرمەندیی و زیرەکی و ڕەوان بێژی توانیوویەتی ڕەمزێتی بۆ دروست بکات، سەرکردەیەکی فیکریە و دەتوانێت تەنزیر بکات، ئاگاداری وردی ڕووداوەکانی جیهانە، بەڵام تا ئێستا نەیتوانیووە خاوەنی ڕێکخستنێکی بەهێز بێت، بەخت یاوەری نەبووە لە جێگایەکدا بمێنێتەوە، زیاتر دەربەدەری و زیندان جێگای بووە. بە چەبوکی و توانای خۆی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کەهەیەتی و خاوەنی جەماوەری تایبەتە، بە جورئەت بووە لە هەڵوێستیدا. ئەمانە وای کردووە کە کرێکار ببێتە ڕەمزێکی سەربەخۆ.
مامۆستا عەلی باپیر:
پیاوێکی حەقبێژە سڵی نەکردۆتەوە لە وتەی حەقی خۆی ئازا بووە، نوسەرێکی باشی ئیسلامیی بووە هەمیشە لەشاخدا لەگەڵ هاوڕێکانی ماوەتەوە، لەمنداڵیەوە لە ناو ڕابوونی ئیسلامیدایە هەوڵی داوە لە ڕابوونەکەدا وجودی هەبێت، لە دوای ئەوەی کە سەرکردایەتی بزوتنەوە بووە خۆی توانیویەتی حیزبێك بۆ خۆی جیابکاتەوە و ببێتە ئەمیری، هیچ کەس کاریگەری نەبووە لە پێگەیاندنی، توانیویەتی بگاتە ئەو ئاستەی کە هەیە. ئێستا یەکێکە لە ڕەمزەکانی ئیسلامی لە کوردستان باشوور.

زۆرێکی تر لەو بەڕێزانەی کە ئێستا وجودیان هەیە لە ناو گۆڕەپانەکەدا ئەمانەش نمونەی بەرچاو بوون لە داینەمۆکانی ڕابوون، نموونەی تر زۆرە وەك دوکتۆر بازیانی، کاك دڵشاد گەرمیانی، کاك ئارام قادر، کاك دارا، مامۆستا حەسەن شەمێرانی، کاك کامیل محمود، دوکتۆر موسەنا و مامۆستا عەبدولەتیف...هتد.

پەیامی من ئەوەیە مادام ئەمانە لە ناو ئەو زەمینەیەدا توانیویانە خۆیان دروست بکەن بە دڵنیاییەوە هەزارانی تر دەتوانێت و دەشێت وەك ئەمان بن و یاخود بەهێزتریش بن، کەواتە گۆڕانکاری بەردەوامە چۆن زەمەن و شوێن لە بەرژەوەندی ئەو سەرکردانە دروست بووە، بەهەمان شێوە بۆ خەڵکی تریش دەڕەخسێت.
وام لێکرد کە ئیتر قسە نەکات، خوا حافیزمان کرد لە یەك و پێش من ڕۆشت و سوپاسی خوام کرد بەوە ڕزگارم بوو لەدەستی، کە چوومە ناو ئۆتۆمبێلەکەم شێخ برقان لەپێشەوە و حەزقیل و سەسیل لەدواوە دانیشتبوون!

## چوونەوە بۆ نەرویج و چالاکیەکانی ڕێگا

لەدوای بێزارکردنی سەیوان بۆ ئەوەی ئیتر ڕزگارم بێت بەدەستیەوە ئەوەندە بۆم درێژ کردەوە تا جارێکی تر فێری تانە و تەشەر نەبێت، لەهەمان کاتیشدا ویستم ئەوەی پێبڵێم کە ناوبانگ دەرکردن تواناو هێزی مرۆڤەکە خۆیەتی، لەدوای گەڕانەوەم بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکەم سێ کەس دانیشتبوون، منیش زۆر خۆشحاڵیم دەربڕی و کردم بە گاڵتەو گەپ کوا پارەکانتان بۆ کوێ دەچن؟
شێخ برقان: بڕیارمان داوە لەگەڵتا بین و هاوڕێیەتیت بکەین تا ناو کەشتیەکە و لەوێوە ئەگەر کات و دەرفەت هەبوو لەگەڵتا دەبین تا دەگەیتەوە نەرویج.
ماکوان : خۆشحاڵم، حەزە گیان چۆنی و کاکە سەسیلی برام چۆنی باشی دەنگوباستان، بیرم دەکردن.
سەسیل : نەمدەوێرا بێم وام دەزانی هەر تورەی لێم.
ماکوان : وەڵا تورە نیم لەو ڕۆژەوەی کە ئەو سینەمایەت دروست کردبوو بۆ ئەو جەماعەتە، خوا خێرت بنوسێ حوسێنیش لارو خوار بوو ڕاست بوویەوە، جا بۆ زانیاریت زۆر خۆشەویستی لەلام.
حەزقیل: ئەو سیمینارەت زۆر سەرکەتوو بوو شتی جوانتان تێدا باس کرد.
ماکوان: هەر تۆ بەدڵت بوویێت حەزە گیان واتا سەرکەتوو بووین، بەڵام شێخ برقان باسی ماسۆنیەتی کرد لەوێ بەڕاست ئەوە چی بوو؟

شێخ برقان : ئەو ڕێکخراوی ئاراستەی چاوە سەر بە ماسۆنیەکانە، وتم با ئاگادارت بکەمەوە نەوەك بەناوی ترەوە بتخەنە ناوییەوە، دوایی لەسەرت دەکەوێت، ماسۆنیەت هەر چەندە ئێستا ئەو توانا و هێزەی نەماوە گروپی تر خەریکی جێگا گرتنەوەیەتی لە جیهاندا، بەڵام هەر بێ سومعەیە لەناو موسوڵماناندا ئەگەر بێهێزیش بێت.
ماکوان: چۆن ماسۆنیەت توانای نەماوە، ئەی خۆ دەڵێن هەموو جیهان دەبات بەڕێوە جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم هەر ئەوە بووە، دروستکردنی ئەمریکا و ئیسرائیل و جیهانگیری و هەرچی ڕووبدات دەڵێن ماسۆنییە، ئیترچۆن زۆر هێز و توانایان نەماوە؟

شێخ برقان: زۆرێك لە خەڵکی لەخۆیانەوە قسەدەکەن، یەکجار بەو شێوەیەش نییە. هەندێك لە قسەکان ڕاستە، جولەکە دەستی تێیدا بووە، بەڵام یەکجار بەم شێوەیە نیە کە ئەو خەڵکە بیری لێدەکاتەوە و قسەی بۆ دادەتاشن.
ماکوان: وەڵلا شێخی برام ئەمە یەکەم جارە خەڵك ببینم ئەوەندە بە هێمنیەوە باسی بکات و لەهەمان کاتیشدا تۆ خۆت ئاگادارت کردمەوە لەوەی کە بانگهێشت نەکرێمە ناوی.
شێخ برقان: ڕاستە، بەدڵنیاییەوە نامەوێت بچیتە ناویان، ئێستا لە هەوڵی خراپەکاریدان دەنا یەکەم جار کە دروست بوون، کاری زۆر باشەیان کردوو زۆر خزمەتیان بە خەڵکی ئەوروپا کرد.
ماکوان: خزمەتی چی؟ ئەی ئەمانە وا باس ناکەن کە دەیانەوێت جیهان تێکبدەن و گوایە ئەخلاق نەهێڵن و هەموو جیهان خۆیان حوکمی بکەن، گوایە شەیتانیش ئاراستەیان دەکات، چەندەها کەس لە ناویاندا بووە، دوای ئەوەی کە هاتوونەتە دەرەوە کوشتویانن، وەکو (مایکڵ جاکسن) و کچی (چالرز شازادە دینا)و لە ماوەی ڕابردوودا کوڕێکی تری گۆرانی بێژی ئەمریکی کە قسەی پێگووتن بە ناوی (توپاك) کوشتیان؟
شێخ برقان: بەشێکی قسەکانت ڕاستە، بەشێکیش وانیە.
ماکوان: چۆن وانیە شێخی برام؟ ئەی ناڵێن ئەمانە جەنگاوەرەکانی مەعبەدن یان لەسەردەمی فیرعەونەوە دروست بوون، هەرەمەکانی میسر گوایە ئەمان دروستیان کردووە، هەر گۆرانی بێژێك و ئەستێرەیەکی سینەمای هالیود لەگەڵیاندا نەبێت دەیکوژن و باس لە سەرکردە جیهانیەکان دەکرێت لەگەڵیاندابوونە، نموونەی جۆرج واشنتن و جێفرس، ئەوەشی لەگەڵیاندا نەبووبێت وەکو جۆرج کەندی کوشتوویانە. زۆرێکی تر لە سەرکردە و قیاداتی موسوڵمان و عەرەبیان لەگەڵ بووە.

شێخ برقان: ئەگەر وازم لێبێنیت و پەلەم لێنەکەیت بۆت ڕوون دەکەمەوە، ماسۆنیەت بەشی زۆرە وە زیان و مێژووی نادیارە، هەڵەبەت بۆ من نا، لای

من هەمووی ڕوونە شاراوەی تێدا نیە، بەڵام لای زۆربەی خەڵکی ئەوانەی باس دەکرێت زۆر فووی تێکراوە وەکو میزەڵدانڕ هیچ ڕاست نیە.
ڕاستیەکەی ئەمەیە:
لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بزووتنەوەیەکی ئابووری گەورە لە کاری بیناسازی لە ئەوروپادا دەستی پێکرد، ئەو کەسانەی کە کاری هونەری و تەلارسازی و بینا سازیان دەکرد بەزمانی ئینگلیزی، پێی دەوترا (مەیسنس) واتا دەست ڕەنگینەکانی تەلارسازی، زۆر پەرش و بڵاوبوون لەناو ئەوروپای ئێستادا بەتایبەتی لە سەدەکانی ١٤ و ١٥ ی زاینیدا تەلاری زۆر جوان و کڵێسای زۆر بەرز و هونەری لە ئەوروپادا دورست کرا، هەرچی پارە و سەروەت و سامانی خەڵکی بوو بەکار دەهاتەوە لە ڕێگای دەرەبەگ و قەشە و پیاوانی ئاینی بۆ تەلارسازی و بەتایبەت کڵێسای زۆر گەورە دروست کرا، ئەم وەستایانەی کە کاریان دەکرد پارەیان لەگەڵ کارەکەیاندا وەردەگرت و زۆر دەوڵەمەند ببوون، لەبەر ئەوەی پێشتر هەموو خاوەن پیشەکان بە گۆڕینەوەی کەرەستە کاریان پێدەکرا وەکو دارتاش و ئاسنگەر و خاوەن پیشەکانی تر، لە جیاتی کارکردنیان خواردن و جلو بەرگ و زەویان دەدرایە، هەریەك لەوانەش لە دێهات و شار و شارۆچکەکانی خۆیاندا بوون، دەستی کار و هێزی کار لەو سەردەمەدا زۆر پێویست بوو بۆ شارە گەورەکان بەتایبەت بۆ قەشە و پاپا و بەگزادە و سیستەمە پاشاییەکەی ئەو سەردەمە.
ئەمە بووە هۆکاری ئەوەی کە ئەو کەسانەی دەستی دروستکردنی تەلار و باڵەخانە گەورەکانیان هەیە لە ناوچەکاندا کۆدەبوونەوە هەریەکە بە ستافی خۆیان، خێمە یاخود کۆمەڵە شوێنێکی نیشتەجێیان دروست دەکرد و تا جێگاکانیان بزانرێت و ئیشیان وەردەگرت، ئەو جێگایە ناونرا بە (لۆج) دوایی عەرەب ناوی دەنێت بە مەحفەلی ماسۆنیەکان.
ماکوان: واتا ماسۆنیەت بەناوی ماسۆن نەهاتووە؟ کە گوایە بە واتای زایۆنی، یاخود سەهیۆن دێت.
شێخ برقان: نەخێر؛ ئەمە هەمووی قسەی ناو خەڵکیە و داتاشینی ئەوانە لە وشەی (مەیسنس)وە هاتووە واتا دەست ڕەنگین و تەلارساز و بەنناکان، جا هەریەك لە ستافی بەنناکان کە لەو جێگەدا یاخود لەو یەکەی نیشتەجێیانەدا کۆببوونەوە، هەریەکە ڕەمزێکی خۆی هەبوو یەکێك بۆ نموونە کونەپەپووی کردبووە لۆگۆی خۆی، یەکێکی تر تراز، ئەوی تر شاوڵ، یەکێکی تر ڕاستەو پرگاڵ، کەسێکی تر هەرەمەکان ...هتد، ئەمانە بەردەوام بوون لە کارکردن تا ئەوکاتەی دیسانەوە جەنگی ناوخۆ و میرات بەشکردنی کڵێسا و دەستە و گروپەکان وایان کرد، کە هەلی کار کردن کەم بوویەوە، ئەو لۆجانە بوونە جێگای کۆبوونەوەی بەنناکان و خەڵکەکان کە کرێکاڕ و نەداربوون، خەڵکێکی نوخبەی سیاسیان تێدا دروست بوو، بۆ ئەوەی دەوڵەتی نەتەوەیی دروست بکەن واتا بانگەشەی سیستەمی کۆماری بکەن لە دژی دەسەڵاتی کڵێسا و

بەگزادەکان بوەستنەوە، هەر ئەوانیش هۆکار بوون بۆ شۆڕشی فەڕەنسا کە لەناو خەڵکیدا بەناوبانگە و خەڵکێکی تر پێی دەڵێت سەردەمی ڕێنسانس.
ماکوان: چۆن ئەو لۆجانەی باسی دەکەیت خێرا گۆڕان بۆ کاری سیاسی و بزوتنەوەیەکی گۆڕانکاری؟
شێخ برقان: خێرا نەبوو بە قۆناغ و گۆڕانکاری زەمەنەکە بوو، سەرەتا ئەو جێگایە بووە قوتابخانە بۆ خوێندنی وانەی بیناسازی و لێکۆڵینەوە لە ئەندازیاری و کاری بەنایی، ئینجا لە دوای ئەوە ئاوا وورده وورده گۆڕا بۆ بنەما سیاسیەکان بە هۆکاری کەم بوونەوەی هەلی کار و زۆر بوونی خەڵکی لەو یەکانە و بە دڵنیایشەوە ئەو کاتە یەهودیەکان زۆریان دەست ڕەنگین و پارەدار بوون، ئەوان ویستیان لەدەسەڵاتی کڵێسا و کارە قێزەوەنەکانی پاشا و بەگزادەکان ڕزگاریان ببێت و سیستەمی کۆماری لەناو خەڵکیدا بڵاو بکەنەوە و شۆڕشی نەتەوەیی دروست بکەن.
ماکوان: واتا ئەم مێژووەی تۆ باسی دەکەیت هیچ کەس لە مرۆڤەکان نەیانزانیووە؟
شێخ برقان: بەڵێ زۆرێك لە مرۆڤە مێژوونوسەکان باسیان کردووە، بەڵام خەڵکی کەمتر مێژووە ڕاستیەکەیان زانیووە، ئەوەی زیاتر گەورەکردن و لێکۆڵینەوەی خورافیان بۆ داڕشتوون.
ماکوان: ئەی ئەم نهێنی و شاردنەوەی ئەو زانیارییانە چییە لە بارەی ماسۆنیەکانەوە؟
شێخ برقان: نهێنیەکە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، وەکو نهێنی پیشەکە فێری هەموو کەس نەدەکرا، واتا نهێنی پیشەی بەنناییەکە دەپارێزرا و ئەم یەکە نیشتەجێیانە هەموو کەسێکیان فێر نەدەکرد، چونکە ئەو سەردەمە زانکۆ و قوتابخانە و پەیمانگا نەبووە بۆ فێربوونی ئەو پیشەیە، یان حیرفەیی بووە، یاخود لەکەس و کارەکەیانەوە بۆیان ماوەتەوە، کاری زۆر نهێنیان دەکرد لەگەڵ یەکدا وەك خاوەن پیشەکان و بۆ ئەوەی کڕیارەکانیان لێیان تێنەگەن و وەستایەتی و بەنایەتی خۆیانیان دەپاڕاست.
پاشان لەناو ئەم بەنایانەدا، ڕەوشت و دەست پاکی و کۆمەڵێك سوێند خواردنی تایبەت هەبوو تایبەت بەخۆیان، کە ئەم دەستور و پرۆتۆکۆلانە لە ساڵی ١٣٧٠ی زاینی سەرچاوەی گرتووە.
ماکوان: کەواتە ئەوانەی کە باس دەکرێت گوایە لە زەمەن و سەردەمێکی زۆر کۆنەوە سەرچاوەی گرتووە، هیچی ڕاست نییە؟
شێخ برقان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە هیچی ڕاست نییە.
ماکوان: ئەی لەکەیدا بەهێزبوون کاریگەری و کاریان چۆن فراوان بووە؟
شێخ برقان: کاریان لەدوای شۆڕشی فەڕەنساوە بەرفراوان بوو، تا سەردەمەکانی ئیستعماری و لەدوای ئەوەی کە کارەکانیان سەرکەوت، ئینجا هەمان بیروباوەڕیان بەربڵاوکرد بۆ ناو جیهانی ئیسلامی بەناوی ئەوەی کە چاکسازی دەکەن و ئەوانەی کاری گەندەڵی و خراپەکاری بڵاو دەکەنەوە

لابرێن و خەڵکی دەست پاك و خاوەن ئەزموون بخرێتە جێگاکانیان، سەرەتای قسە و باسەکانیان باش بوو، بەڵام لەدوایدا چۆن ڕیفۆرم کرا کە بەدەستی ماسۆنیەتی جیهانی بوو لەڕێگای مارتن لۆسەرەوە، بە هەمان شێوە ویستیان ڕیفۆرم لە جیهانی ئیسلامیدا بکەن، بەم شێوەیەی کە لە ئەوروپادا کرا، چەندین کاریان ئەنجامدا، بەڵام بۆیان نەکرا و هەرجارە بەناوێکەوە دەهاتنە ناوەوە جارێك لە ڕێگای پیاو چاکانەوە، جاڕێکی تر لەڕێگای ئیستعماری داگیرکارییەوە، جارێکی تر بەناوی ئاینەوە، تا کۆتا جاریان لە ڕێگای دروستکردنی سەرکردەی خۆیان، بەڵام نەیانتوانی ئەوەی خۆیان ئەیانەوێت بیکەن و بگەن بە ئەنجام، بەڵکو ووردە ووردە جێگایان چۆڵ کرد بۆ سیاسیەکانی تر کە کاری دیکەی تێدا بکەن بەناوی سەرمایەداری و دروستکردنی کۆمپانیای زەبەلاح. تا ئەم دواییانە کە بانگەشەی ئەوە کرا گوایە رۆژهەڵاتێکی ناڤینی نوێ دروست دەکەن، بەهاری عەرەبی و زۆرێك لە سەرکردەکانیان هێنایە خوارەوە ئاژاوە و پشێویان خستە ناو کۆمەڵانی خەڵکی ئەو ناوچەیە.

ماکوان: کەواتە هەر خراپەکارن و هەر ئاژاوە دەنێنەوە.

شێخ برقان: بەدڵنیاییەوە خراپن کەس باسی باشەیانی نەکردووە، بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەوێت و دژی بیرو بۆچوونی موسوڵمانانن و تەنانەت خودی ئاینی ئیسلامیشن.

ماکوان: ئەی فەرمووت ئێستا لاواز بوون، واتا چۆن لاواز بوون؟

شێخ برقان: بەڵێ؛ لەم سەردەمەدا ئەو توانا و هێز و دەسەڵاتەیان نەماوە، بەڵکو ئێستا ڕێکخراوەکانی سەر بە ماسۆنیەت زیاتر کار لەسەر گۆرانی بێژ و دەوڵەمەندەکان و ئەستێرە سینەماییەکانی هۆلیوٚد و جیهان دەکات، دەیەوێت لە هەر جێگایەکدا کەسێك ناوناوبانگ دەربکات، نفوزی هەبێت ئەوان دەچن دەیلکێنن بەخۆیانەوە جا بە ئاشکرا بێت یاخود نهێنی بۆ ئەوەی بتوانن سەر لە نوێ پێگە و خەڵکی تر بۆ خۆیان ڕابکێشن و ڕێکخستنیان بە هێز بکەنەوە لە جیهاندا.

ماکوان: لە ڕێگەی تەنها ئەو خەڵکانەوە دەچنە ناو خەڵکی، واتا سەرکردەکانیان بەلاوە گرنگ نییە؟

شێخ برقان: بەڵێ؛ ئەوانیشیان بۆ گرنگە کەسێکی وەکو دۆناڵد ترامپ لەگەڵ خۆیاندایە، زۆرێکی تر لە ساحیرو جادوبازەکان، یاخود زۆرێکی تر لە بەرنامە گرنگەکانی تەلەفزیۆنی و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان...هتد، ئەوان سەرپەرشتی دەکەن.

ماکوان: ساحیرەکانش لەگەڵ ئەواندان؟

شێخ برقان: بەڵێ؛ بەدڵنیاییەوە، لەم کاتەدا خۆت باش دەزانی شەیتان دەپەرستن و ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ خەڵکی ئێمەی جنۆکەی بێدین دا دەکەن و بە ئاشکرا چوونەتە ناو لاشەیان و پەرستاگای شەیتان هەیە لە ئەمریکا، میسر، ئەوروپا و لەزۆرێك لە جێگاکانی تر جیهاندا. زۆرێك لە

سیاسی و لە خەڵکە بەناوبانگەکانی جیهان جنۆکە کافرەکان چوونەتە لاشەیان و لەناو لاشەیاندا بەتەواوەتی قۆرخ کراون ئەوەی ئەوان بیانەوێت پێیان دەکەن، سیحری ڕەش و کاری قێزەون و بەدڕەوشتی هەر لەوێوە سەرچاوە دەگرێت و هەرچی کەناڵە سێکسیەکانی جیهانە ئەوان سەرپەرشتی دەکەن.
ماکوان: سیحری ڕەش و سپی چیە شێخ برقان سیحر هەر سیحر نیە؟ ئیتر ڕەش و سپیەکەی لەچیدایە؟
شێخ برقان: ڕاستە، سپی و ڕەش ئێمەی جنۆکە و ئێوەی مرۆڤ ناومان لێناوە، دەنا سیحر هەر سیحرە.
ماکوان: جا ماسۆنیەت کاری چییە بەم سیحرانە؟
شێخ برقان: ئەگەر ڕاستیت دەوێت، زۆرترین ساحیرە خراپەکان لەم سەردەمەدا لە ناو ئەواندا کار دەکەن، بە کۆمەڵ بەناوی ڕێکخراوەکان کە یارمەتی هەژاران ئەدەن لەڕێگای خواردن و جلو بەرگیانەوە کافریان دەکەن سیحر و جنۆکە دەخەنە لاشەی ئەو خەڵکە هەژار و بێ دەرەتانەوە.
ماکوان: کەواتە هەر جەنگەکەیە، نێوان موسوڵمانان و خاچ دروشمەکانە؟
شێخ برقان: کوا ئێستا خۆشیان پڕوایان بە خاچ و مەسیحیەت نەماوە، باشترە بڵێیت شەڕی بێدین و موسوڵمانانە.
ماکوان: زۆر ڕاستە؛ بەڵام تەماشای لۆگۆکانیشیان بکە زیاتر پەیوەستە بە بیناو دروستکردنی بیناوە.
شێخ برقان: ئاخر زیاتر لەبەر ئەوەی سەرەتا کارەکەیان ئەوە بوو کە باسمان کرد، بەڵام دوایی خەڵکی تر هاتنە ناویانەوە لە پیشەوەرەکانی تر، وەکو - دکتۆر و خەڵکی سیاسی و خەڵکی دەوڵەمەند و دارتاش و ئاسنگەر و لە هەموو چین و توێژەکان، وەکو سەندیکایەکی لێهات. لە ئەوروپا هەموو لۆجەکان بوون بەیەك و ئەوکات حوکومەتەکانیش وەکو ڕێکخراوێك مامەڵەی لەگەڵ دەکردنەوە.
ماکوان: ئەو سیحری ڕەش و کاری چوونە ناو لاشەی ئەو خەڵکانەی ڕۆژئاوا چۆن چارەسەر دەکرێت؟
شێخ برقان: ئەوان ناتوانن ڕزگاریان ببێت لە دەست ئەو شەیتانانە، تاکە ڕزگار بوونێکیان موسوڵمان بوونیانە، خۆشت دەزانی وایان لێدەکەن کە ڕقێکی زۆریان لە ئیسلام و موسوڵمانان ببێتەوە، چونکە شەڕی گەورەی ئەوان لەگەڵ خوای پەروەردگارمانە، دەیانەوێت ئەوەی خواپەرستە واز لە خواپەرستیەکەیان بهێنن و بڕۆن، ئیتر لە ڕێگای ئەوانەوە خۆیان و شەیتانەکان حوکومی سەر زەوی بکەن کە کردووشیانە.
ماکوان: پێم وابێت هەر ئەمانیش بوو خیلافەتی ئیسلامیان ڕووخاند لە تورکیا و سوڵطان عەبدول حەمیدیان هێنایە خوارەوە لە دەسەڵاتەکەی، ئەو لۆج و دەسەڵاتی ماسۆنیەکان بوو کە کردی لە تورکیادا لە ڕێگای شەبتای زائیفی

یاخود صەباطای تەزفی کەمال ئەتاتورك، کە خۆیان ناونابوو یەهودی دەونمە، واتا یەهودە هەڵگەڕاوەکان؟
شێخ برقان: بەدڵنیاییەوە ڕاستە، ئەوان هۆکاری سەرەکی بوون.
سەسیل: سەباتی زائیفی کێیە ماکوان؟
ماکوان: پێم وایێت تۆ دەیانناسی سەسیلی برام، بەڵام ئەوەندەی من شارەزایم لێی هەیێت، لە خیلافەتی ئیسلامیدا لە تورکیای ئێستادا لەساڵی ١٦٠٣زایینی کەسێکی جولەکە بەناوی (سەبەتای زائیفی) دەرکەوت کەتەمەنی ٢٢ ساڵ بوو بانگەشەی ئەوەی کرد لە پایتەختی موسوڵمانان لە ئەستەنبوڵ (ئەستانە) کە گوایە عیسای کوری مەریمە! خەڵکی دەبێت گوێی بۆ بگرن، ئەو دەمە حکومەتی عوسمانی ئازادی پێبەخشی بەو هۆکارەی کە لە سەر بیروباوەڕی خۆی دەدوێت، لەسەر بیروباوەڕی خۆشی ئازادە. لەدواییدا ئەم کەسە زۆربەی جێگاکان گەڕاو سەفەری کرد بۆ ئەورپا و پاشان وڵاتانی موسوڵمان وەك فەڵەستین، عێراق و تونس...هتد، خۆی کردە پاشا و بانگەشی پاشابوونی دەکرد.
حەزقیل: خەڵکی کوێ بوو؟
ماکوان: لە بنەڕەتدا لە یەهودیە ڕاکردووەکانی ئیسپانیا بوو، هیچ وڵاتێکی رۆژئاوای نەیگرتنە خۆیان، کە چی لە وڵاتی موسوڵماناندا خۆی بە پاشا ناساند و ناوی خەلیفەی لابردوو ناوی خۆی خستە جێگای ئەوان داوای دروستکردنی دەوڵەتی یەهودی دەکرد لە ناو خاکی موسوڵماناندا، تا خەلیفەی موسوڵمانان لە رێگای سەدری ئەعزەم و چەند زانایەکی بەناوبانگ و شێخ ولئیسلام (یەحیا ئەفەندی موقری زادە )و زانای بەناوبانگی ئەوسەردەمە (محمد ئەفەندی وانلی)، لە ڕێگای دکتۆر (موستەفا حەیاتی) تەرجومە دەکراوە بۆ توركی و لە زمانی ئیسپانییەوە. تا قسە و باسی لێ دەر بهێنن و بزانن داوای چی دەکات لە کۆتایدا هیچی پێنەما خۆی بە ئاشکرا ووتی موسوڵمان دەبم، بەڵام درۆی کرد. خۆی ناونا محمد داواشی کرد کە ڕێگای لێنەگرن پرواٹ بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ ئیسلام، بەڵام بەدرۆوە بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام، کاری سەرەکی کۆکردنەوەی یەهودیەکان بوو دژی موسوڵمانان.
حەزقیل: داوای چی دەکرد؟
ماکوان: لە بانگەشەیەکیدا لە خاکی فەڵەستین ئەم باسەی کردووە کە هەموو جیهانی دابەشکرد بەسەر ٣٨ جێگادا بۆ هەر جێگایەك پاشایەکی دانا و خۆشی کرد بە پاشای بەسەر هەموویانەوە.
لەدوایدا کە گەڕایەوە بۆ ئەستەنبوڵ لەوێ هانی خەڵکی دا کە خۆپیشاندان بکەن و دەوڵەتی عوسمانی بکەن بە چەند بەشێکەوە، ئەم کارە چەند جار دووبارە بوویەوە، بەڵام بە هۆکاری ئەوەی کە هیچ کاریگەری لەسەر موسوڵمانان دروست نەکرد زۆر گرنگی پێنەدرا، بەڵام پاشان لە لایەن ڕیفۆرمخوازەکانی ئەوروپاوە یارمەتیان دەدرا و خەڵکییان پێ چەواشە کرد،

بۆیە ناچار دەوڵەتی عوسمانی هەموو ئەو کەسانەی گرت و بەسەرۆکەکەیانەوە کە (سەبەتای زائیفی) بوو، لەدوای لێکۆڵینەوە بڕیاری لە سێدارەدانیان دەرچوو لەلایەن دەوڵەتی موسوڵمانانەوە بە هۆکاری خیانەتی گەورە دژ بە دەوڵەتی ئیسلامی، پاشان لەو کاتەی کە بڕیارەکە جێبەجێ دەکرا (سەبەتای زائیفی) خۆی و هاوڕێکان بڕیاریان دا ببنە موسوڵمان و ئیسلام بوونی خۆیان لە سەر پەتی سێدارە بە کۆمەڵ ڕاگەیاند، لەو کاتەدا قاضی موسوڵمانان بریارەکەی بۆ گۆڕین هەموویان ئازاد کران، ئەوە مەنهەجی دینی ئیسلامە کە بەو شێوە ڕەفتار لەگەڵ خەڵکی مونافیقیش دەکات، مادام بە ئاشکرا موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند ئیتر گوێ بە باکگراوندی نادرێت کەچی بووە، پاشان ئەم کۆمەڵە خەڵکە لە مێژوودا بە(یەهودی دەونەمە) ناسراون واتا ئەو یەهودیانەی کە لە ئاینی جولەکە هەڵگەرانەوە، ئەمانە بەردەوام لە ناو خەلافەتی ئیسلامیدا خەریکی پلان و دروست کردنی رێکخراو مەحفەلی جولەکە بوون کە لەداهاتوودا بە مەحفەلی سەهیۆنی ناسراون بە دەیان پیاوی عەلمانی وەك جودەت نامیق و مستەفا کەمال ئەتاتورك، حیکمەت بابان، عەبدوڕەحمان بەدرخان، عەبدوللە جودەت، حسێن جاهید، سەرپەرشتیاری گشتی ئەمانە کەسێکی ماسۆنی بوو بە ناوی(داود کوهین) کە توانیان دەست بەسەر مەجلیسی مەبعوثان بگرن. زۆرێکی تر لەو ناوانە کە لەبیرما نەماون بۆ باسکردنیان، ئەم عەلمانیانە کە دروست بوون ویستیان ریفۆرم بکەن تەنانەت زۆرێك لە مزگەوتەکانی ئەستەنبوڵیان کردە قاوەخانە و جێگای سەربازی و تەنانەت هەندێکیان کرانە تەویلەی وڵاغ، بەڵام ئەوەی کە ئەم شاڵاوە ڕیفۆرمەی جولەکەیە سەهیۆنی ماسۆنیەتی ڕاگرت (کۆمەڵەی یەکگرتووی موحەمەدی) بوو کە دوای ناسرا بە حیزبێکی ئیسلامی بەناوی (حیزبی برایانی موحەمەدی) بە سەرکردایەتی (حافظ درویش وحدتی) بوو کە زمانحاڵی ئەو حیزبە رۆژنامەیەك بوو بەناوی (بورکان) لە دوای ململانێیەکی زۆر هەموو ئەم سەرکردانە دەخرانە زیندان یاخود شۆڕشەکانیان کپ دەکرایەوە، ئیتیحادیەکانی تورانی بە تەواوەتی دەسەڵاتیان پەیدا کرد، چونکە بانگەشەی عیلمانیەتیان دەکرد بە دەیان کەڵەپیاوی وەك شێخ سەعیدی حەفید و کوڕە بەڕێزەکەی کە باوکی شێخ مەحمود بوو لە شاری موسڵ تیرۆر دەکران بەدەستی ئیتیحادیەکان.

شێخ برقان: ڕاستە، ئەوە کەشتیەکەیە بچۆرە ناوەوە، داوای پاسپۆرت دەکەن لە ناوەوە یەکتر دەبینینەوە.

## گفتوگۆ و دەستپێکی شەڕی جنۆکەکان

چوومە ناو کەشتیەکە و ئۆتۆمبێلەکەم لەناویدا پارك کرد، وردە وردە چوومە سەرەوە بۆ پرسگەی کەشتیەکە تاوەکو کلیکی ژوورەکەم وەرگرم و لەوێدا لە سەرەدا وەستابووم کوڕێکی لەتەمەنی خۆمدا لەگەڵ دوو ئافرەتدا لەدوامەوە بوون کە چەند کەسێکی بیانی لە نێوانماندا بوون، بەڵام بۆم دەرکەوت کە ئەوان بە کوردی قسەیان دەکرد، لەکاتی قسەکردنیاندا بە کوردی بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت ئۆتۆماتیکی ئاوڕمدایەوە. بۆ ئەوەی بزانم کێن بەکوردی قسە دەکەن، کە تەماشام کردن بە چەند چرکەیەك ئەوانیش یەکسەر منیان بینی وتیان ئەوە کوردە هێواش قسە بکە.
کلیلی ژوورەکەم وەرگرت و چوومە ژوورەکەم، تا قەیرێك وەستام بۆ ئەوەی شێخ برقان و کاکە سەسیل و حەزە گیان پەیدا ببنەوە، لە ڕووشم نەدەهات خۆم بگۆڕم، لە دڵی خۆمدا ووتم: نەوەك لەپڕدا بێن، نیو کاتژمێر چاوەڕێم کردن دیار نەبوون، ناچار دوشم گرت و هاتمە دەرەوە دەستم کرد بە نوێژ، نوێژی مەغریب و عیشام تێدا قەسرو جەمع کرد، دوای ئەوە بیرم لێکردوە بڕۆمە ناو بازاڕ و ڕێستورانتەکەی.
چوومە ڕێستورانتەکە نانم خوارد و بەناو بازاڕەکەیدا دەگەڕام هەندێك منداڵ یارییان دەکرد تەماشای منداڵەکانم دەکرد بیری منداڵەکانی خۆمم دەکرد ئانا و لین، بیرم لەوە کردەوە بچم سەرو دیاری جوانیان بۆ بکڕم، لەناو بازاڕی کەشتیەکەدا بە دوای یاری منداڵانە دەگەڕام و ئەو کوڕەی لەگەڵ دوو ئافرەتەکە بوو هات بۆلام، وتی کاك ماکوان چۆنی؟
ماکوان: سوپاس گیان ڕووە و من هات دەستم برد تەوقەی لەگەڵ بکەم لە دەستیدا عەلاگەیەکی پڕبوو دایە دەستەکەی تری شوشە کێشای بەیەکدا دیاربوو مەی و خواردنەوەی کڕیبوو، پرسیم: جەنابتان کێ بوون؟
- من ناوم ئومێدە خەڵکی سلێمانیم لە فەیسبوك موتابعی جەنابتم و زۆر گوێ بۆ لایقەکانت دەگرم.
ماکوان بە پێکەنینەوە: بە شەرابەوە بەدیارمەوە دادەنیشیت یاخود ڤۆدگا؟
ئومێد: ئەوە بۆ خۆم نیە، من ئەو جۆرە مەشروبانە ناخۆمەوە ئەوپەڕی بیرەیەك یان دووان بخۆمەوە، بۆ باوکمم کڕیووە، ئەو داوای لێکردووم.
ماکوان: باشە بەرێز گیان فەرموو پشووی خۆت وەرگرە، منیش خەریکی تەماشای ئەم یارییانەم بزانم دوو یاری جوان هەڵنابژێرم بۆ منداڵەکانم.
ئومێد: زۆر باشە خوا منداڵەکانت لێنەستێنێت، بەڵام ئەگەر پێت خۆش بوو حەزدەکەم داوەتت بکەم بەیەکەوە قاوە بخۆین خۆشحاڵ دەبم؟
ماکوان: سوپاس بەخۆشحاڵیەوە، بەڵام من بۆ قاوە خواردن قوبوڵی دەکەم، تۆش لە قاوە زیاتر لەگەڵمدا نەخۆیتەوە، واتا مەبەستمە دانانیشم لەگەڵ کەسێك مەی بخواتەوە خۆت دەزانی لای من ئەوە دروست نیە، لەوانەیە بمناسیت و بزانیت باکگراوندی فیکری و دینداری من چیە.
ئومێد: بەڵێ، بەڵی کاك ماکوان گیان بەدڵنیاییەوە چۆن شتی وا دەکەم لەبەر ڕێزی تۆ هەر ناخۆمەوە.

ماکوان: فەرموو، ئاوا نزیکەی نیو کاتژمێری تر لە قاوەخانەی ڕێستۆرانتەکە دەبم ئەگەر پێش من چووی کورسیەك بگرە.
ماڵئاواییمان کرد منیش تۆزێك لە نیو کاتژمێرم پێچوو، ئەو کەرەستانەی کە کڕیبووم بردمەوە بۆ ژوورەکەم دامنا و هاتمەوە بۆ ئەو پەیمان و ژوانەی کە لەگەڵ ئومێد بەستبوومان، چووم بۆ قاوەخانەکە لەوێ نەمدی، لەدڵی خۆمدا ووتم سوپاس بۆ خودا، دەچمەوە ڕێك دەخەوم تا بەیانی. پشتم هەڵکرد بگەڕێمەوە ئومێد هات بەرەو ڕووم.
ئومێد: لەوێدا دانیشتووین تۆ منت نەدیوە، کەچووم دانیشتم دوو ئافرەتەکەی لەگەڵدا بوون، بەڵام زۆر گۆڕابوون.
ماکوان: ئەم دوو خوشکە بەڕێزە کێن؟
ئومێد: یەکێکیان خێزانمە و ئەوی دیکەش خوشکی خێزانمە.
هەردوو ئافرەتەکە دەستیان هێنا بۆ لای من بۆ تەوقە، منیش دەستم برد بۆ سەرسنگم: خۆشحاڵم بە ناسینتان و ببورن دەست نوێژم هەیە و دونیاش ساردە، با دەست نوێژەکەم بمێنێت، ئەگەر لێم ناستێنن مەمنونتان دەبم، ئینجا کردمە موجامەلە و پرسیم ئەم دوو خوشکە نەبوون لەکاتی وەرگرتنی کلیل لە پرسگەکە لەگەڵتا بوون؟
ئومێد: بەڵی خۆیانن.
ماکوان: ئەی چۆن ئاوا جوان بوون خێرە، شتی سیحری لێیە لە ناو ئەم کەشتیەدا؟
ئافرەتەکان دەستیان کرد بە پێکەنین وتیان نەوەڵڵا میکیاج و مەیکاپمان کردووە، مایکەپەکانمان خراپ ببوو.
ماکوان: ئەگەر بپرسم مەیکەپ چییە خۆ گاڵتەم پێناکەن، ئەو مەیکاپە پیاویش دەتوانێت بیکات وەکو ئێوە ئاوا بگۆڕێت و قۆز بێت، من هەر بۆ خۆشی قسەکەم کرد وا خۆم نیشاندا کە نازانم مەیکاپ چییە، ویستم شەرحی کەن بۆم بکرێنەوە بۆ قسە کردن و ڕۆشنبیریان بزانم؟
ئافرەتەکان: دەستیان کرد بە قسەکردن بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی وردم بۆ بکەن لەسەر مەیکاپ، منیش ووتم وابێت، پێش شیکاری مەیکاپ دەبێت بزانم کێن و ناوتان چییە و چیتان خوێندووە پێشکەشی دەکەن بەکێش، هەموو دەستمان کردە پێکەنین.
سارا: من سارام هاوژینی ئومێدم و ئەمیش تارای خوشکمە.
ماکوان: خۆشحاڵم بەناسینی ئەم دوو خاتونە بەڕێزە، سارا و تارا.
سارا: دەستی کرد بە ڕوونکردنەوەی مەیکاپ، ویستی درێژەی بداتێ.
ماکوان: ئەی بۆ ناڵێت سوراو سپیاومان کردووە، من لادێیم دەبێت ئاوا تێم بگەیەنیت.
تارا: بەڵێ وایە بەس ئێستا ناوی مەیکاپە.
ماکوان: واتا لەگەڵ پۆست مۆدێرنا ئەمیش گۆڕاوە، ناوکەی پەرەپێدراوە وانیە تارا؟

تارا بەپێکەنینەوە: بەڵێ وایە.
ماکوان: کێشەکە لەوەدایە کە هەموو شتێك لە گۆڕانکاریدایە، بەڵام بەداخەوە مرۆڤەکان نەیێت لە چەقبەستوویی خۆیان دەرناچن.
ئومێد: کاك ماکوان من زۆر گوێ بۆ قسە و باسەکانت رادەگرم وە زۆر سەرنج ڕاکێشە، هەمیشە قسە و باسەکانت نوێگەری تێدایە.
ماکوان: من زۆر خۆشحاڵم، بەڵام دەزانی کاکە ئومێد تا ئێستاش واهەستم کردووە کە تەنها موسوڵمان گوێ بۆ من دەگرێت، یان ئەوانەی کە نەیاری منن گوێ دەگرن ئەویش بۆ ڕەدانەوەی من.
ئومێد: نا وانیە، بڕوا بکە جاری وا هەیە لە ماڵی ئێمەدا باوکم و دایکم بەدیارتەوە دادەنیشن.
ماکوان: بەدیاریشمەوە دەخواتەوە باوکی بەڕێزتان؟
ئومێد بە پێکەنینەوە: نامەوێت درۆ بکەم، بەڵێ هەر وایە، کە تۆ دێیت زۆری خۆشی دەویت بەدایکم دەڵێت ئەوە هات گوندەکە هات.
ماکوان: بۆ پێم دەڵێت گوندە؟
ئومێد: خۆشم جارێك لێم پرسی، دەڵێت کە دێت وەکو گوندە وایە کەس ناتوانێت رووبەڕوی ببێتەوە.
ماکوان: ئێ ئێ مەبەستی ئەو خراپ نیە دیارە، خۆی گوندە واتا بەکەسێکی شەلاتی و چەقۆ وەشێن مانا دەکرێت، دەزانی؟
ئومێد: نا کاك ماکوان تۆ خۆشەویستی ڕێزت هەیە لای ئێمە.
سارا: بەڕاستی من کە گوێت لێدەگرم دەترسم، هەست دەکەم ئێستا دێتە دەرەوە بۆمان، خوێنەرێکی زۆر سەرسەختی تۆم.
ماکوان: تۆش گوێم بۆ دەگری سەرسەختیشی ئەمە بۆ من جێگای خۆشحاڵییە.
سارا: ئەی چۆن، من هەموو مەملەکەتی عیشق ومەملەکەتی شەیتانی یەك و دووم خوێندۆتەوە ویستم بپرسم کەی بەشی سێیەم دەنوسیت.
ماکوان: بەشی سێیەم سێ ساڵ لەدوای دەرچوونی بەشی دووەم دەنوسم، ئەی ڕات چی بوو دەربارەی ئەو کتێبانە؟
سارا: زۆر خۆش بوو، زۆر شت فێربووم.
ماکوان بە پێکەنینەوە: وەکو مەیکاپ فێربوویت؟
تارا: منیش سەرەتا زۆر ترسام لە مەملەکەتی شەیتان، بەڵام کە تەواوم کرد زۆر ئازابووم ئێستا لە هیچ ناترسم.
ماکوان: بەخوا من هەڵەیەکی زۆر گەورەم کرد ئەو کتێبەم نوسی، چۆن وام لێکردوویت کە لەهیچ نەترسی، ئەی لە خودا ناترسی؟
تارا: چۆن لە خوا ناترسم بەخوا نوێژیش دەکەم، بەس جاروبار لێدەچمەوە دەنا زۆر بڕوام بە خودا و پێغەمبەر هەیە، بەس توخوا پێم بڵێ کاك ماکوان حەزقیل هەر لەگەڵتا ماوە؟

ماکوان: لەم دەوروبەرەن هاکا پەیدابوون، هەر وام وت قیژاندی، ئەو خەڵکە تەماشایان دەکردین. ئێ خۆ تۆ ووتت ئازا بووم ئاوا ئازابوویت؟ هەموو دامانەوە قاقای پێکەنین، دوای ئەوەی بۆیان باسکردم ئەو شەوە هەر خەوی لێنەکەوتبوو لەناو کەشتیەکەدا .

ئومێد: من پڕوام بە ئیسلام هەیە، بەس هەندێك گومانم هەیە هاوکاریم بکەیت زۆر مەمنون دەبم.

ماکوان: بە دڵنیاییەوە ئەگەر بتوانم لەخزمەتم.

ئومێد: من دەرچووی زانستە سیاسیەکانم لە سوید، سەرەتا پڕوام بە خودا نەبوو، کە گوێم بۆتۆ گرت تا ڕادەیەك پڕوام وایە کە وجوودی خوا زۆر بەهێزترە تا نەبوونی، بەڵام دەمەوێت ئەوە بزانم ئیسلام چۆن رەفتار دەکات لەگەڵ خەڵکی بێدیندا، بەڵام شتی واقیعیم دەوێت قسەم ناوێت، ئەوە داعشە و قاعیدەیە، پاشان لەبەرچاو ئەو هەموو هێزە ئیسلامیانەی تر کە دەیبینین.

ماکوان: تۆ حەزدەکەیت باسی خەڵك بکەین یان باسی ئیسلام کامیان؟

ئومێد: هەردووکیان، خەڵك و ئیسلام هەردووکیان پەیوەستن بەیەکەوە، وانیە؟

ماکوان: وایە ڕاستە، هەردووکمان قاوەمان لەبەردەمدایە کوپەکانیشمان لەیەك دەچن، هیچ جیاوازیەکیان نیە، قاوەکەشمان لەیەك جێگاوە تێکراوە و وەکو یەکە وایە؟

ئومێد: وایە، بەڵام پەیوەندی چییە بە باسەکەمانەوە؟

ماکوان : پەیوەندی زۆرە، تەماشای دەستی من بکە چۆن دەیخۆمەوە و کوێیم گرتوە بەدەستی ڕاست دەیخۆمەوە وایە؟

ئومێد: وایە.

ماکوان: تۆش بەدەستی چەپ دەیخۆیتەوە نیوەی کوپەکەت گرتووە و لەگەڵیشیدا شیرت تێکەڵ کردووە. کەواتە هەر هەمان کوپ و هەمان قاوەیە لای من و تۆی مرۆڤ بەجۆرێکی تر خۆی نمایش دەکات، ئیسلامیش هەر وایە هەریەك ئیسلامە، بەڵام هەریەکە و بەدەستی خۆی دەیجوڵێنێت دەبێت بپرسین کاممان بەڕاستی بەکارمانهێناوە؟

ئومێد: ئاخر لەکۆتا جاردا خۆ هەر قاوەکە دەخۆینەوە.

ماکوان: کەس نەیوتووە مەیخۆرەوە، بەڵام تامەکان جیاوازە لە منەوە بۆ تۆ، ئەگەر هەریەکەمان دەرخواردی خەڵکی تری بدەین بەتامی قاوەی ماکوان و ئومێد دەناسرێت وایە؟

ئومێد :وایە!

ماکوان: کەواتە دەبێت لەسەرچاوەکەی ئیسلامەوە قسە بکەین، بزانین چۆن پێغەمبەری خوا  ڕەفتاری کردووە وایە؟

ئومێد: وایە، بەڵام کاك ماکوان چۆن ئیسلام بەسەر خەڵکی کوردستاندا دەسەپێنی، کە موسوڵمان، عەلمانی، مەسیحی، کاکەیی، یەزیدی، زەردەشتی، شیوعی دنیایەك حیزب...هتد تێدایە، ئایا جزیەمان لێوەردەگریت؟ یان ئیسلام بەکەڵکی سەردەمی خۆی دێت، بەسەرچووە ئیسلامەکەت بەکەڵکی ئێستا نایەت.

ئەتوانیت وەڵام بدەیتەوە بەڵام وەڵامی لۆژیکیم دەوێت.

ماکوان: سەردەمی پێغەمبەر  بۆ هەمووکاتەکان گونجاوە و پرۆژەیە و موعجیزەیە ئەوەت بۆ باس دەکەم باشە؟

ئومێد: زۆر باشە.

ماکوان: سەردەمی ئێستا و ژیانی موسوڵمانان و بەتایبەتیش کوردستان لەسەردەمی سەرەتای دوو ساڵی مەدینە دەچێت، کە پێغەمبەر  چووە ناو دەسەڵاتەوە، دەسەڵاتەکەی دیاری کراوبوو، چونکە تەنها خۆی نەبوو لەو مەملەکەت و وڵاتەدا، بەڵکو چەند کۆمەڵ و گروپێکی تێدا بوو، هەموو وەك یەك تەماشا دەکران و لەسەر بنەمای هاونیشتیمانی بوون مامەڵەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، دەستور نوسرایەوە.

بەم پێیە سیستەمی ئیسلامی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ نوسینەوەی دەستور و کۆکردنەوەی هەموو حیزب و لایەنەکان لە ژێر چەتری هاوڵاتی بووندا نەك ئیسلامدا، چونکە ئیسلام تەنها بۆ موسوڵمانانە، هەروەك پێغەمبەری خوا  کردی ئەم گروپانەی لە ژێر چەتری هاوڵاتی بوونی مەدینە کۆکردەوە. هەموو سیرەکان واتا ژیانامەی پێغەمبەر  ئەو دەستورەی تێدایە وەك سەرچاوە ئاماژەی پێدەکەم، دەرفەتم کەمە ناتوانم ناوی هەموو سیرەکانت بۆ بڵێم.

ئومێد: ئاساییە، قسەکانت جێگای باوەڕن دەزانم لە خۆتەوە قسە ناکەیت

ماکوان: زۆر سوپاس بۆ ئەو متمانیە جێگای خۆشحاڵیمە کەلەلای خەڵکی دروستم کردووە، بابچینەوە سەرباسەکەمان.

هاوڵاتیەکانی شاری مەدینە بریتی بوون لە:

یەکەم: موسوڵمانانی کۆچکردوو واتا لە مەککەوە بۆ مەدیینە (موهاجیرەکان).

دووەم: موسوڵمانانی پشتیوان لە دوو هۆزی شاری مەدینە، ئەوس و خەزرەج (ئەنصارەکان).

سێیەم: هاوبەشدانەرەکانی مەدینە (موشریکەکان) لە ئەوس و خەزرەج.

چوارەم: جولەکەکانی شاری مەدینە لە هۆزەکانی ( قینوقاع، نەزیر، قوریزە).

پێنجەم: عەرەبە بێباوەڕەکانی چواردەوری مەدینە(ئەعرابەکان).

ئەگەر تەماشای ئەم گروپ و هۆزانە بکەیت وەك ئایدۆلۆژیا و بیروباوەڕی جیاواز ئیسلام هات دانی بە بوونی هەموویاندانا و وەك هاوڵاتی مامەڵەی لەگەڵدا کردن ئەگەر چی موسوڵمانیش نەبوون.

کەواتە بەم پێوەری ئاماژەم پێکرد لە دەستوری شاری مەدینە، لەم سەردەمەدا سیستەمی ئیسلامی دەبێت دان بنێت بە هەموو حیزبە

عەلمانیەکان و بە دەسەڵات و کیانیان، تەنانەت بێباوەڕەکانیش، چونکە ئیسلام لە ڕووی فیکریەوە کێشەی و دوژمانیەتی نیە لەگەڵیاندا، بەڵکو بانگەوازی خۆی دەکات، ئەوەی وەریگرت سەربەستە پێچەوانەکەشی هەر ئازادە، چونکە دین بەزۆر بەسەر کەسی دیکەدا نادرێت.

ئومێد: ئەی خۆ جولەکەکان و موشریکەکان، دەربەدەر و بەزۆر موسوڵمان کران؟

ماکوان: جولەکە لەسەر بیروباوەڕی هەرگیز لە ئیسلامدا وە دەرنەنراوە نە لە مێژووی ئیسلامی نە لە مێژووی نەیارەکانی ئیسلامیش ناتوانن ئەم قسەیە بکەن، بەڵکو لەسەر خیانەت و موئامەرە و لەناوبردنی موسوڵمانان جەنگیان لەگەڵداکراوە لە مێژووشدا دیارە.

موشریکەکانیش لە دوای جەنگی بەدر خۆیان مونافیقیان هەڵبژارد و بە مونافیقی ماونەتەوە، تەنانەت خوای گەورە لە قورئاندا مافی هەمویانی دەستنیشان کردوە، زاناو ئەحبارەکانیشیان بەڕێزەوە هەر بەزانا و ئەحبار ناوبراوە لە قورئاندا، لە ئیسلامدا کوفر کردنیش لەلایەن ئەو کۆمەڵانەوە ڕێگە پێدراو بوو مافی خۆیان بووە کوفر بکەن لە چوارچێوەی ئاینەکەی خۆیاندا، واتا نەك فیکریان ئازاد بووە، بەڵکو کوفر کردنیش ئازاد بووە بۆ نموونە ئەوان پێیان وابووە عوزێر کوڕی خوایە و ئیسلام ڕاست نییە، پاشان محمدیان بە پێغەمبەر نەزانیووە، لەگەڵ زۆری تر لە نەیاریان بۆ ئیسلام کەچی ئیسلام ڕێگەی تەواوەتی داوە و هیچ کێشەیەکی نەبووە لە سەر بیروباوەڕیان.

کەواتە بەم پاوپێوەندە عەلمانی و بێباوەڕ لەم سەردەمە لە دەستوری ئیسلامیدا لەسەر بنەمای هاوڵاتی بوون مامەڵەیان لەگەڵدەکرێت، ئازادە لە چوارچێوەی فیکری خۆیدا چی باس دەکات و دەیڵێت، ئیسلام ڕێگر نایێت لە تەرحی بەرانبەر لە فیکری نەیارانی، بەڵام سوکایەتی و خیانەت جێگای قبوڵ نییە.

هەموو ئەم پێشەکیەم بۆ ئەوە بوو کە بزانیت ئیسلام بەسەر خەڵکیدا لەسەرەتاوە پیادە ناکرێت ئیسلام دینێکی پلەبەندییە، بەڵام بەنسبەت سنورەکانیەوە وەك مەی و لەشفرۆشی و کاری خراپەکاری کە سیمای ئیسلام ناشرین بکات، بە دڵنیاییەوە ئیسلام ڕێگری لێدەکات و خەڵکی ئازاد نیە لەو بوارانەدا بەتایبەتیش لە شوێنە گشتیەکاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام ناچێتە ناو ژیانی خەڵکیەوە لەماڵ و ژیانی تایبەتی خۆیدا و جاسوسی و چاودێری ناخاتە سەر هیچ کەس لە ماڵی خۆیدا. بۆ ئەوەی زیاتر تێبگەیت، تۆ و باوکت ئازادن لە ماڵی خۆتان لە هەرێمی کوردستان بخۆنەوە و کەسیش بۆی نیە چاودێرپتان بکات، بەڵام ئیسلام ریگا نادات بچیت بۆ  ئەزمەڕ و لە بەرچاوی خەڵکیدا بخۆیتەوە شوشە و مەزەکەتان لەسەر جادەکە بێت و منداڵی خەڵك چاوتان لێبکات.

ڕوونە؟

ئومێد:ڕوونە.

ماڵئاوایم لێکردن و بۆ خۆشی ووتم: دەڕۆم حەزقیل و سەسیل بانگم دەکەن دەچم بۆ لای ئەوان، لە ڕاستیشدا ئەوانم نەدیبوو، هەڵسام ماندوو بووم پڕۆمە بۆ ژورەکەم. لە کۆریدۆری ژوورەکاندا من دەبوو دوو قاتی تر سەربکەوم و دەڕۆشتم بەرەو ژووری خۆم لە دوورەوە پەروانە دەرکەوت، هەر زیرەم کرد بە مۆرەوە هات بەرو ڕووم، لەملاولاشمەوە حەزقیل و سەسیل پەیدابوون، سەسیل وتی رێگام بدە بچمە ناو لاشەت، با ئەو نەیەتە ناوی.
ماکوان: چی بکەم، بۆ ئەوەی بچیتە لاشەم؟
چونکە ئەوەندە ئازارم چەشتبوو بەدەستی پەروانە، ناچار دەمویست بڵێم خێراکە وەرە.
سەسیل: هەرئەوەندە ڕێگام بدە و دەمت بکەرەوە، لەم قسانەدا بوو بەحەزقیلی وت نەهێڵی بێتە نزیکی ماکوان ئازاری دەدات.
حەزقیل و سەسیل وەکو گێژەلوکەیان لێهات، لەبەرچاوم شتێکی قورس خۆی کرد بە ژووردا چووە ناو لاشەم، وەکو ئەوەی ٢٥ بۆ ٣٠ کیلۆ بەکۆڵ هەڵگرم، حەزقیلیش چاوم لێی بوو هەردوو قۆڵمی بەرز کردبووە بەبێ ئەوەی خۆم توانام هەبێت بەسەریدا، هەستم دەکرد قۆڵەکانم ڕەق بوون وەکو ئاسنی لێهاتووە. پەروانەش هەرچی نزیك دەبووەوە لە من حەزقیل پێیدا دەکێشا و دەکەوت، لە پڕ لوراندی هەروەکو گورگ و ویرسان لەپڕ دەرکەوت، ووتم بەزاتی خوا فەوتاین هەر ئەو دەرکەوت شێخ برقانیش لە تەنیشتمەوە وەستا بوو سێ ئەوەندەی جاران دەبوو، هەموو سەیری یەکتریان دەکرد منیش سەیری ئەوانم دەکرد، لەژیانمدا ئاوا نەترسا بووم.

## ئاوی قورئان و ئاگری جنۆکە و ڕێکخراوی ئافرەتان

لە ژیانمدا دیمەن و ڕووداوی وام بە فیلمی هالیودیش نەدیبوو، شەڕ لە نێوان حەزقیل و ئەو کچەی کە کاتی خۆی خۆشم دەویست و ئێستاش وەکو سەگ تەماشای دەکەم دەستی پێکرد، سەسیل لە لاشەمدایە و هەست بە قورسایی ناو لاشەم دەکەم، شێخ برقان لە تەنیشتمەوە

وەستاوە، هەموو مۆرە دەکەن زوو زوو وەکو سەگی دڕ پەروانە هێرش دەهێنێت بۆ لای من، کاکە حەزەی برام لولی دەکا و دەیگەڕێنێتەوە دواوە، منیش حەپەساوم!

پەروانە زوو زوو هاوار دەکات دەڵێت: قوبەیس، قوبەیس.

منیش بەش بەحاڵی خۆم حەزم بەشەڕەکەیە، ویستم شەقێك بوەشێنم، بۆکسێك یان کەلەیەك داخی دڵی خۆم بەو کچە پڕێژم، ویستم پڕۆم ڕووە و ئەو، زانیم وەزعەکەمان موسەیطرە.

شێخ برقان: هاواری کرد لە شوێنی خۆت نەجوڵێت، ئازارت ئەدات.

هەرواى وت و لە منیان سرەواند هاوارم کرد، ئاگام لێیبوو دەنگم دەرنەدەهات، بەڵام چ ئازارێکم پێگەیشت، باش بوو تەحمەمولی ئازارەکەم کردوو لە جێگای خۆمدا چەقی بووم، شێخ برقانم بینی بووبوو بە ٢٠ تا ٣٠ شێخ برقان لە بەرچاومدا دەسوڕانەوە، سەقف و دەرگا و فەرش و هەرچی ناو کەشتیەکە بوو شێخ برقان بوو، ویرسانیش وەکو ئەژدیها دەهات و دەچوو زیاد لە ٢٠ باڵی هەبوو ٨ بۆ ١٠ سەری وەکو یەکی پێوە بوو ملەکانی درێژ دەبوون وەکو دارێك چۆن ڕەشەبا لێی ئەدات، ئەو دەهات و دەچوو شێخ برقان پێیدا دەکێشا، ئەویش دەیکێشا بە شێخ برقان دا، ئاگام لە هەردووکیان بوو دەیانکێشا بەیەکدا، بەڵام وەکو لە سینەمایەکدا دانیشتبێتم و تەماشای فیلمێکی ترسناك بکەم پێکانم و هەموو قاچم قورس بووبوون، خۆمم بۆ هەڵنەدەگیرا وەکو ئەوەی ٦٠ کیلۆ بەشانمەوە بێت وابوو، ئیتر لەوەدا بووم توانای وەستانم نەمێنێت.

خەریك بوو دەکەوتم وە زۆر حەزم بە شەڕەکە بوو، بەڵام لە توانای منیشدا نەبوو، ئارەزووم بوو شەقێك یان کەلەیەك بدەم لەو پەروانە هیچ و پوچە، هیچ توانام نەما لەوکاتەدا کەسێك چپاندی بەگوێمدا و ووتی: خۆ تۆ خواناسی ئەی بۆ قۆرئان ناخوێنیت، ئەی ئیسلامەتی و دینداری بۆچی باشە؟ بۆ ئەو هەموو شتەت لە بیرکردووە؟

سبحان اللە، لەوکاتەدا وامزانی یەکەم جارە ئیسلامم پێدەگات کە ئەوەم پێڕاگەیەنرا، بەدەنگ سێ جار هاوارم کرد استغفراللە، شایەتومانێکم هێنایەوە و ئایەتەلکورسیم خوێند و دەستم کرد بەخوێندنی سورەتی واقیعە، هەستم بەسوك بوونی لاشەی خۆم دەکرد، وورده وورده پەروانە دوور دەکەوتەوە، تا تەواوم کرد، دەستم کرد بەخوێندنی سەرەتای سورەتی بەقەرە، تا ئایەتی ٣٥م لەبەر بوو، ئەویشم تەواو کرد، پاشان هەرچی سورەتەکانی باسی قیامەت بوو خوێندم.

ئاگام لێبوو سەرەکانی ویرسان نەمان و باڵەکانی دەپووکانەوە، پاشان هەردووکیان وەکو گسکی کارەبا هەڵیان بلوشێت وجودیان نەما. عارەقێکی زۆرم کردبوو هەموو گیانم ئاو بوو هەستم بەسوك بوونی لاشەم کرد، کەس لەدەورم نەما وەکو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت، بەڵام ئازارێکی زۆر بەسەرما دەهات و دەچوو وەکو هەورە بروسکە.

هەر چۆن بوو خۆم گەیاندەوە ژوورەکەم دەست نوێژم گرت و ئینجا لەرز دایگرتم، ئەوەندەم سەرما بوو تەنانەت پێڵاوەکانیشم بۆ دانەکەنرا. هەرچی لێبوو دام بەخۆمدا، هەموو گیانم لەسەرماندا دەلەرزی تا وام لێهات وتم تەلەفۆن دەکەم بۆ فریاگوزاری کەشتیەکە، کەمێك چاوەڕوان بووم حاڵم خراپتر دەبوو، ناچار زانیم ڕەوشەکەم بەرەو خراپی دەڕوات هەڵسام بڕۆم بۆ پرسگە، حەزقیل پەیدابوو وتی بڕۆ جێگای خۆت.
چوومەوە جێگای خۆم.
حەزقیل: بۆنی ئەم دەرمانە بکە و با سەسیل دەرچێت لەلاشەت لەرزەکەشت نامێنێت، لە شوشەیەکی کرستاڵیدا بوو ئەوەندەی دوو پەنجە دەبوو، کە سەری شوشەکەی هەڵپچڕی و بەرزی کردەوە دوکەڵێکی سەوز و بۆنیکی زۆر خۆشی هەبوو چووە ناو لوتم زۆر فێنکی دایەوە بە گیانم ووردە ووردە لەرزەکەم نەما و حەزقیل پاڵێکی پێوەنام کەوتمە سەر جێگای خەوەکەم و هەڵسامەوە تەماشام کرد سەسیل و شێخ برقان لەبەردەممدا بوون.
ماکوان: ئەو چی بوو فیلمە بەسەرمان هات.
شێخ برقان: خوا پاداشتت بداتەوە، ئەو قورئان خوێندنەت زۆر باش و کاریگەربوو، هەموومانت رزگار کرد.
ماکوان: ئاگاو لە حەزەی برام بوو، لە جاکیشان، ئارنۆڵد، ڕامبۆ و شتی وا دەچوو، بۆکسی دەهاوێشت بەدڵی من بوو، بەس تێمگەیەنن بۆ ئەم دەتوانی دەستم بەو پەروانەیە بگات؟
سەسیل: ماکوان ئەوە عیفریتی کافرە زۆر بەهێزە، توانای خەیاڵییە، وزەیەکی هەیە هەرچی بوێت هەپرون هەپرونی دەکات، تەنها ئێمەی عیفریت دەرقەتیان دێین، بەڵام هێزی ئایەتەکانی قورئان زۆر گاریگەر بوو هەمووومانی ترساند، ئێمە گەردن کەچوو لاواز بووین لەتاو ئەو هێزە کە ديندار و خواناسین، داخۆ ئەوان چۆن بوویێتن حاڵیان.
ماکوان: گوێم لێبوو هەر باسی قوبەیسی دەکرد ئەم قوبەیسە کێیە، ئەوەش جنۆکەیە؟
شێخ برقان: نا ئەوە هێزی جنەکەیانە لەناو ئەو ڕێکخراوە کە ڕێکخراوێکی ئافرەتانە.
ماکوان: ڕێکخراوی ئافرەتانی چی؟
حەزقیل: ڕێکخراوێکی ئافرەتانی پڕ لە جن و ساحیر و بێدینن.
ماکوان: ئەمە چیە بیکەن لەڕای خوا هەر ئەمەمان مابوو.
شێخ برقان: پێش ئەوەی باسی قوبەیسیەکانت بۆ بکەم حاڵت چۆنە باش بوویت؟
ماکوان: خوا شاهیدە عەیبم نییە، حەزە گیان ئەوە چی بوو پارسیتۆڵی ئێوەیە؟
حەزقیل: ئەوە دەرمانی ئێمەیە.

ماکوان: ئا بمدەرێ با لام بێت، بیدە بەمن.
حەزقیل: ها بۆ تۆ.
شێخ برقان: ئەوە بەس بۆ دوو رۆژ بەکاردێت دوای ئەوە نامێنێت.
ماکوان: وتم خوایە بۆ حەزەی برام ئەوەندە دەست و دڵی باش بووە.
شێخ برقان بەپێکەنینەوە: حەزەی برات نەدڵی هەیە و نە ئەو دەستە باشە.
ماکوان: ئەو قوبیسیە چییە، شێخ برقان تێمبگەیەنە؟
شێخ برقان: ئەم بزوتنەوەیە سەر بە ئافرەتێکن ناوی "مونیرە قوبەیسیە" و خەڵکی سوریایە و لە ساڵی ١٩٣٣ لە دایك بووە تا ئێستا لە ژیاندایە لە یەکێك لە گەڕەکە کۆنەکانی دیمەشق ژیان بەسەر دەبات، پێشتر دەرچووی کۆلێژی زانستیە لە دیمەشق، پاشان چۆتە کۆلێژی شەریعە هەر لە دیمەشق لە ڕێگای پیاوێکی کوردەوە بە ناوی ئەحمەد کوفتارۆ کە ماوەیەکی زۆر موفتی سوریا بووە لەسەردەمی حافز ئەسەدا چۆتە ناو تەریقەتی نەقشبەندی.
ئافرەتێکە کار بۆ شەیتان دەکات، ئەگەر بیرت بێت کاتی خۆی سەسیل و شێخ شاهین هاتن بۆ لات داوای چیان کرد، ئەو تێوەگلاوە لەو کارە و ئەوەی بچێتە بزوتنەوەی ئەو، بە ئاو سیحراوی و خوانەناسی دەکات.
ماکوان: خۆ ئەحمەد کوفتارۆ زانایەکی گەورەیە و نەقشبەندیەکانیش دیندارو خواناسن.
شێخ برقان: ڕاستە، بەڵام ئەم ئافرەتە تێوەگلاوە بەناوی کەرامات و سیحر و جادووەوە لەگەڵ شەیتانەکاندا دەستی تیکەڵ کردووە، جا مونیرە قوبەیسی لای ئەو ئافرەتانەی کە دەچنە ناو ئەم بزوتنەوەیە زۆر بە پیرۆز ڕایدەگرن و قاچ و دەستی ماچ دەکەن، زۆر بە پیرۆزی تەماشای دەکەن لای موریدەکانی هەموو قسەیەکی پیرۆزە و بیروباوەڕیان وایە کە قسەی مونیرە لە باوك و مێرد گرنگ ترەو دەبێت گوێی بۆ بگرێت.
ماکوان: ئەی ئەمانە موسوڵمانن وەکو خۆمان؟
شێخ برقان: ئەمانە بەندایەتی و عیبادەتیان جیاوازە لە موسوڵمانان بە گشتی.
ماکوان: بەڕاستە؟
شێخ برقان: بەڵێ؛ نوێژی ئاگریان هەیە لە کاتی عادەی ئافرەتاندا یان هەر کاتێك بێت نوێژ دەکەن ڕووەو ئەم ئافرەتە بە بۆچوونی خۆیان پیرۆزی لە خوا وەردەگرن و کاری زۆر پۆخەڵواتیان هەیە.
ئەم رێکخستنە نهێنیە لە وڵاتانی سوریا، لوبنان، ئەردەن، کوێت، عێراق، سعودیە و تورکیا زۆر بەربڵاوە، بەڵام زۆر بەنهێنی کار دەکەن و تەنها بۆ ئافرەتانە هیچ کەس لە پیاوان وەرناگرن مەگەر کەسێك بێت وەك شێخ یان وەك بیرمەند لەگەڵیدا کار بکەن.
ماکوان: ئەی ئەدەبیاتیان چییە و سلوکیان چۆنە؟

شێخ برقان: جلوبەرگیان کورتە و وەك پاڵتۆیەك وایە، زۆربەی کات پەڕۆیەك یان دەستەسڕێك دەبەستن بە سەریانەوە.
شووکردن لەلایان شتێکی خراپە و ئەگەر شووشیان کرد دەبێت بیکەن بە کەسێك کە شێخەکەیان بۆی هەڵدەبژێرێت.
زۆربەی ئەو ئافرەتانەی کە وەردەگیرێن دەبێت لە ئافرەتانی دەوڵەمەند و خاوەنی ژیریەکی زۆر بن، ئەم بزوتنەوەیە زۆر نهێنیە و دەبێت ئەو کەسەی دێتە ناو ئەم بزوتنەوەیە لە ڕووی ئەمنیەوە زۆر وریا بێت.
پاشان هیچ گرنگیەك نادەن بە زانستی شەرعی و تەنها زیاتر گرنگی ئەدەن بە فیکر و فەلسەفە و تەریقەتی نەقشبەندی.
هەموو پەیوەندیەکانیان دەبێت لە ڕێگای ڕێکخستنەکانیانەوە بێت، هیچ پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی دانەمەزرێنن مەگەر لە ڕێگای رێکخستنەکانیانەوە نەبێت.
دکتۆری تایبەتیان هەیە.
شێخە تایبەتەکەیان بە خاتوون یان ئانیسە بانگ دەکەن و هەموو فەرمانێکیان بۆ لای ئانیسەکەیانە و تەنانەت دەبێت هەموو فەرمانێك لەو وەربگیرێت.
هەر ئافرەتێك دەچێتە ناو ئەم بزوتنەوەیە دەبێت نامەیەك بنوسێت لە نامەکەدا دان بنێت بە هەموو ئەو تاوانانەی کە کردوویەتی، وەك کورسی بابەوەی نصرانیەکان وایە.
ئەو ئافرەتانەی کە کۆدەکرێنەوە لە شانەیەکی رێکخستندا دەبێت هەموو تەمەنیان وەك یەك بێت، لە هەر وڵاتێکدا بەناوێکەوە کار دەکەن.
هەوڵی زۆریان بۆ دروستکردنی ڕێکخراوی ژنانەیە و ئافرەتانە هەیە و بەناوی ئازادی و مافی ئافرەتەوە خۆیان ڕێکدەخەنەوە ناوی ڕێکخراوە سەرەکیەکەیان زۆرە لە وڵاتاندا.
یەکەم قۆناغی تەمەنیان کە وەردەگیرێن لەم ڕێکخراوەدا پێی دەوترێت (نودار) بۆ ئافرەتی تەمەن ١٤ ساڵ بۆ ١٨ ساڵ بۆ گەورەتر لەمانە ناویان ناوە (البشایر) لە تەمەنی ١٨ ساڵیەوە دەست پێدەکات بۆ ٢٤ ساڵ، پاشان قۆناغی سێیەم دێتە پێشەوە کە ناویان ناوە بە (البیادر) ئەمانە لە ٢٤ ساڵیەوە دەست پێدەکات ئیتر بۆ سەرەوەی تەمەنەکان، بۆ ئەوەیش جیا کراونەتەوە کە بتوانن کاریگەرییان لەسەر دروست بکەن.
ماکوان: ناوی رێکخراوەکانیان دەزانیت شێخ؟
شێخ برقان: ناوی ڕێکخراوەکانیان ئەوەندەی من بزانم و ئاگاداربم زۆرن، بۆ نموونە لە وڵاتی سوریا ڕێکخراوەکەیان ناوی...
-ڕێکخراوی قوبەیسیاتە: لە سوریان چەند پەیمانگا و کتێبخانەیەکییان بۆ دروست کردووە لەوانە بەناوی پەیمانگای" نەعیم" یاخود نوسینگەی "سەلام" زۆری تر.
لە لوبنان دامەزرێنەری یەکەمی ئەمیرە جوبریلە

-ئەمیرە جوبریل وازی لێهنا بۆ ئافرەتێکی دیکە کە جێگری خۆی بوو بە ناوی "سحر حەلەبی" لە لوبنان ڕێکخراوەکەیان ناونراوە بە (سەحریات) ئەمانە زۆر دەمارگیرن.
لە ئەردەن ناسراون بە "طەبعیات" بەناوی شێخە ئانیسەکەیانەوە "فادیە الطباعیە"
لە کوێت: بەناوی ڕێکخراوای" بیادر السلام "
لەوڵاتانی تری جیهاندا بە ناوێکی دیکەوە کار دەکەن.
ماکوان: نەمردین ئەمەشمان زانی، دەست خۆش یاشێخ.
حەزقیل: زۆر دەمێکەیە دەمەوێت لێت بپرسم فیکری ئیسلامی چییە، لە شێخ برقانم پرسی جەنابیان فەرموویان لە ماکوان بپرسە شارەزاترە.
ماکوان: حەزە گیان من لەخزمەتی تۆدام، جەنابی شێخ برقان مامۆستا و برا گەورەی هەمووانە، با جنۆکەش بێت لای من مامۆستایە و بەڕاستی شێخمە.
شێخ برقان: بارك الله فیكم؛ ڕاستیت دەوێت دەزانم لە بواری شەرعی زۆر شارەزانیت، بەڵام لە فیکردا دان بە کەس دانەنێم، دان بەتۆ دادەنێم شێخ ماکوان.
حەزقیل: دە تۆزێکمان بۆ باسکە و موجامەلەمان مەکە.
ماکوان: هزر و دید و تێڕوانینە لای من لە ئاین و گەردوون و ژیان و مرۆڤ و دەسەڵات، لە ئەنجامی بیرکردنەوە لەو چەمکانەوە دێت کە نوێگەریەکی وەك داهێنان پێیبەخشێت، بیر یاخود هزر لە زمانی کوردیدا لەئەنجامی هزر کردن و بیرکردنەوەوە سەرچاوەی گرتووە. لە زمانی عەرەبیشدا بە هەمان شێوەیە لە تەفکیرەوە هاتووە، چونکە ئەنجامی ئەقڵە- -ئەقڵ ئاراستەی دەکات، بەڵام لەسەر بونیادی شتێك کە بوونی هەیە، نەك بێ بوون بێت. ئەگەر لێکۆڵینەوەت لەسەر شتێکی بێ بوون کرد، یاخود داهێنانت تێدا کرد ئەمە دەچێتە خانەی فەلسەفە نەك فیکر، چونکە زۆر کەس لەناو ئیسلامیەکان ئەم دووانە تێکەڵ دەکەن.
حەزقیل: ئەگەر بڵێن پێناسەت بۆ فیکری ئیسلامی چییە کاریگەریەکانی چین لەسەرت؟
ماکوان: لەڕاستیدا ئەمەیان من ناتوانم پێناسەی بکەم، لەبەر ئەوەی ئیسلام بۆ خۆی ئاینێکی زۆر گەورەیە، دەبێت بگەڕێینەوە خزمەتی زانایانی ئەم ئاینە ئەوان پێناسەی بکەن، بەڵام دەتوانم بە گشتی لەفیکر قسە بکەم، چونکە زادەی بیری مرۆڤە کە هاتە ناو چوارچێوەیەکەوە ئەوا من خاوەنی نیم، بەڵکو خاوەنی خۆی هەیە.
- ئیمامی غەزالی ئەو پیاوە عەزیمەیە کە تەنهایە لەو بوارەدا لە نێوانی ئەقڵ و نەقڵ و دڵ و ڕۆح و جەستە پارسەنگی دادەنێت هزر دەکاتە کاڵاو دەیکات بە باڵای هەموویدا، دەڵێت: "ئەگەر دەق تینوێتی شکێنی ڕۆحە و دڵە، بەڵام

هزر تێرکەری ئەقڵە. دوو مەعریفەیە سەرچاوەکەی دڵە ئەو مەعریفە دەست دەخات کە دەبێتە حەتمیەت لە هزردا.
- ئیمامی جوینی مامۆسای غەزالی دەفەرموێت: "هزر بریتیە لە دیدی مرۆڤ، ئەم هزرە وادەکات مرۆڤ دەگەیەنێتە دیدێکی باڵا، ئەویش لەسەر دوو بنەما دادەمەزرێت، دیدی چاك ئەوپەڕی باڵا و دیدی فاسد ئەوپەری باڵا".
پێناسەی تری زۆرە بەڵام ئەو دووانەم هەڵبژارد کە باسی بکەم بۆت حەزە گیان .
بۆ پرگەی دووەمی پرسیارەکەت، ئیسلام بۆ خۆی کاریگەری هەیە لەسەر من نەك فیکرەکەی وەك عەرزم کردی فیکر دەرئەنجامی بیری مرۆڤە، ئاینی ئیسلام بۆ خۆی وەحیە لە چوارچێوەی ئەو وەحیەوە مرۆڤ بیرو هزرڤانی تێدا بەکاردێنێت بە مەرجی ئەوەی کە بەیەکدا نەکێشێت لەگەڵ دەقە کۆنکرێتیە قورئانیەکاندا.
حەزقیل: فیکری ئیسلامی بۆ خۆی چییە؟
ماکوان: تێڕوانینی مرۆڤی موسوڵمانە و داڕشتنەوەی گوتاری ئیسلامیە و بەرهەمی تێگەیشتنی تاکی موسوڵمانە لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵگەدا، وەك فیکری سیاسی و گوتاری فەلسەفی و ڕەوشتی سیاسی و دیدو تێڕوانین لەم بوونە و ژیان و دەسەڵات و مرۆڤە، لەسەر چەمکەکانی ئەدوێین. واتا بە بۆچوونی من، بۆچوونی ئیسلامی ئەو بەرهەمەیە کە مرۆڤ دەستەبەری دەکات و بەکاری دێنێتەوە بۆ خزمەتی دین و کۆمەڵگەکەی کە دوو ئامانجی پێ بپێکێت.
یەکەم: ناسینی خوا و قیامەت.
دووەم: دابینکردنی پرۆژە بۆ خزمەتی کۆمەڵگە.
حەزقیل: جیاوازی نێوان جیهانبینی و فیکر چییە؟
ماکوان: جیهان بینی بۆ خۆی بەرهەمی فیکرە، بەڵام تێڕوانینی کەسێکە کە قاڵ بۆتەوە لە بیرو هزری خۆیدا بۆ ژیان و دەسەڵات و گەردوون. شیکاری بە فیکری دەکات بۆ چەمکەکانی ژیان یان جوانتر بڵێم ئایدۆلۆژیای لەسەر دادەمەزرێت، بەمەش دەوترێت جیهان بینی.
حەزقیل: ئەی فیکری فەلسەفی چییە؟
ماکوان: هەتیو پرسیار زۆر دەکەیت، خەریکە کوێر دەبم بۆ خەو بەیانی دەبێ ٨ کاتژمێر ئۆتۆمبێل لێخورم، کاتژمێر ١٢ی شەوە خەوم دێت، حەزە ئێستا کاتی ئەوە نییە من باسی شەرحی فکری فەلسەفیت بۆ بکەم، بیخە بەیانی لە ناو ئۆتۆمبێلەکە لەخزمەتم.
حەزقیل: بەخوا بێچاو و ڕوویت، ئاوا بە ئاسانی دەرمان دەکەیت.
ماکوان: ئەری شێخ برقان ناحەقمە؟
سەسیل"بەڕابواردنەوە": دە تۆزیك قسەبکە بۆمان تۆ کە خەوت بێت قسەت زۆر خۆشە ماکوان.

ماکوان: تۆ قسە مەکە سەسیلە سیلاوی من پرسیارم لە سێخ برقان کردووە.
شێخ برقان: بخەوە بەیانی قسە دەکەینەوە لە ڕێگا و کەمینێك لە ڕێگاکەتدا هەیە، دەبێت زۆر وریا بیت. بەیانی باسی دەکەین. یا الله السلام علیکم شەو و شەوگارت شاد.
ماکوان: وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته.

## سیفاتی ڕەحمان، ئەنفال و کوردایەتی

شەو ئەوەندە ماندوو بووم نەمزانی میوانەکانم ڕۆیشتن یان نا من خەوم لێکەوت، هەستم کرد ئەو خەوە خۆشەشم لەو دەرمانەوە سەرچاوەی گرتبوو کە حەزقیل دای پێم، بەدەنگی ئاگادارکردنەوەی کەشتیەکە خەبەرم بوویەوە، ووتی پاش کەمێکی تر کەشتیەکە لەنگەر دەگرێ و ئەوانەی ئۆتۆمبێلیان هەیە هەموو لە ناو ئۆتۆمبێلەکاندا ئامادەبن بۆ دەرچوون، منیش بەپەلە هەڵسام و فریای نان خواردن نەکەوتم لە کەشتیەکەوە بەرەو مالمۆ کەوتمە ڕێ.

لەدەرچوونم کاکە حەزە و سەسیلم لە ئاوێنەکەی دواوە بینی دانیشتوون، هەر ئەوەندە ووتم ئەی کوا جەنابی شێخ ؟ تەماشام کرد لە تەنیشتمەوەیە.

ماکوان: یاخوا بەخێربێن، خوای پەروەردگار چ نیعمەتێکی داوە بە من ئەم هەموو جنۆکە لێم کۆبوونەتەوە.

حەزقیل: ماڵت ئاوابێت، ئەم شەو نەتهێشت کەس بخەوێت ئەوە چی بوو هەموو بەدیارتەوە دانیشتبووین، ئەو مرخە مرخەت لەچی بوو؟

ماکوان"بە پێکەنینەوە": ئێ ماندووبووم دەنا من بێدەنگم وەکو کاتم وام.

شێخ برقان: ماکوان، داوات لێدەکەم زۆر جار گوێم لێتە کە دەپاڕێیتەوە بە ناوی الله داوا لە خوای پەروەردگار مەکە.

ماکوان: ئەی بەچی داواکەم یاشێخ؟

شێخ بەرقان: بەسیفاتەکانی تری.

ماکوان: تێناگەم مەبەستەکەت ڕوون نیە.

شێخ برقان: هەرگیز بە ناوی الله داوا لە خوای پەروەردگار مەکەن. تۆ بڵێ بۆ؟

ماکوان: بۆ؟

شێخ برقان: لەبەر ئەوەی، ئەگەر خوای گەورە بەناوی خۆی ئەم گەردوونەی ببردایە بەڕێوە وەك عەرەب دەڵێت: "يدير الكون" ئەوا هەموو ئەم کەونە بەشی چەند خولەکێکی ئێمەی نەدەکرد، هەموو ئەم سیستەمە تێکدەچوو خوای گەورە گەردوونی بۆ کەس ڕانەدەگرت و تێکوپێکی ئەدا بەسەریەکدا، چونکە ئەوەندە خراپەکار و بێ فەرمانی (الله) دەکرێت.

ئەوەی کە جێگای خۆشحاڵیە، خوای بەرزو پیرۆز بە ( الله) وەك ناوی بەرزی مامەڵە لەگەڵ ئەم گەردوون و جنۆکە و مرۆڤە ناکات، بەڵکو بە یەك سیفاتی بەرزی دەیبات بەڕێوە ئەویش سیفاتی (الرحمن)ە.

ئەوەی کە گرنگە مرۆڤی موسوڵمان و جنۆکەی دیندار تێبگات ئەوەی کە هەمیشە ناوی (الله) بە بەرز ڕابگرێت، دەبێت هەوڵ و خەبات و کۆششی بۆ ئەو کارە بێت پەروەردگار دەفەرموێت: (كلمه الله هى العليا)، چونکە لە بنەڕەتدا ئەمە بەندایەتییە.

ماکوان: جوانە، بەس زیاتر ڕوونی بکەرەوە با فیکرەکە بزانم چییە؟

شێخ برقان: زۆر بەسادەیی بۆ ئەوەی تیبگەیت، سیفاتی پیرۆزی (الرحمن) زۆر گرنگە موسوڵمان بەوە داوا بکات لە خوای گەورە، خوای گەورە بۆی

دیاری كردووە كە بە سیفاتی ڕەحمان داوای لێبكرێت، یاخود بە ناوی (الله) دەفەرموێت لە قورئاندا..
(قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ).

لە قورئاندا هەمیشە كە ناوی( الله) بە سیفاتی ڕەحمان هاتبێت رەحیمش بە دوایدا هاتووە.

وەك هەموو (بسم الله الرحمن الرحیم) یاخود لە زۆربەی زۆری ئایەتەكاندا كە رەحمان هاتبێت رەحیم لەگەڵیدا هەبووە، لە سورەتی فاتحەدا خوای گەورە دەفەرموێت: (الرحمن الرحیم) لە سەرەتای سورەتی فصلەت دا دەفەرموێت:

( تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). لە كۆتایی سورەتی حەشردا خوای گەورە دەفەرموێت: (هو الله الذي لا إله إلا هو عالم الغيب والشهادة هو الرحمن الرحيم). كەواتە ئەمە گرنگی خۆی هەیە بەو شێوە خوای گەورە بە بەزەیی خۆی ئەم گەردوونە دەبات بەڕێوە و لەسەر عەرشی خۆی كە ئەم بوونە دەبات بەڕێوە خۆی ئیدارەی دەكات، جگە لە خوای پەروەردگار كەسی تر نیە لەم بوونەدا وەك خۆی دەفەرموێت: (الرحمن على العرش استوى) بەم شێوەیە خوای گەورە لە قورئاندا بۆی وێنا كردوین.

ماكوان: ئەی كە ڕەحمان سیفاتی خوای گەورەیە بۆ ئازاری كافران و سەرپێچی كاران ئەدات خوای پەروەردگار، خوای گەورە بەبەزەییە بۆ موسوڵمانان، لە هەمان كاتدا بە بەزەیشە بۆ بێباوەڕان و سەرپێچی كاران.

شێخ برقان: كافران پڕوایان بە وشەی رەحمان نیە، بۆیە خوای گەورە بەزەییەكەیان لێوەردەگرێتەوە ئەوان بە چاوی ڕقەوە تەماشای خوای گەورە دەكەن و پڕوایان بەبەزەیی پەروەردگار نیە.

كێشەی كافرەكانیش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا  لە ناوی (الله)دا نەبوو ئەوان پڕوایان بە خوا هەبوو دەیانزانی خوای گەورە دروستكاری ئەم گەردونەیە و ئەم بوونە بەڕێوەدەبات خوای گەورە دەفەرموێت: (ولئن سألتهم من خلق السماوات والأرض ليقولن الله)، بەڵكو لەسەر سیفاتی الرحمن كێشەیان بوو.

خوای گەورە خۆی بۆمان باس دەكات لە سورەتی فرقان دا دەفەرموێت: وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ قَالُوا وَمَا الرَّحْمَنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ﴿٦٠﴾

ئەگەر (بە خوانەناسان) بوترێت سوژدە و (كڕنوش) ببەن بۆ خوای میهرەبان و بە بەزەیی، (ئەو نەفامانە، بەسەركەشییەوە) دەڵێن: ڕەحمان كێیە، خوای میهرەبان كامەیە كوا بەزەیی؟ سوژدە بەرین بۆ كەسێك كە فەرمانمان پێ دەدا، تا ببێت زیاتر تەرە دەبن و وێڵ دەبن.

خوای گەورە سورەتێكی بەناوی ڕەحمانەوە ناوە سەروەرمان  ناوی ناوە بە بوكی قورئان. سەرەتاكەی بە سیفاتی بەرزی الرحمن دەست پێدەكات، كۆتاییەكەی باسی ئەو سیفاتە دەكات بە تەنها دەفەرموێت: ئەوە ناوێكی پیرۆزە جەخت لەسەر پیرۆزی رەحمان دەكاتەوە بە كۆ نەیهێناوە، بەڵكو بە تاك

باسی ناوی کردووە زانایان دەفەرموون واتا مەبەست پێی رەحمانە ئایتەکە لە کۆتای سورەتی رەحمان دەفەرموێت: تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾.
واتا: موبارەك و بەرزو بەڕێزە ناوی پەروەردگاری تۆ، (ئەی ئیماندار) چونکە ئەو زاتێکە خاوەنی بەرزی و بڵندی و ڕێزی بێ سنوورە.
کەواتە سیفاتی ڕەحمان بەزەیی خوای گەورەیە و ڕشتنی نیعمەتەکانیەتی بەسەر مرۆڤایەتی و تایبەت تریش بەسەر موسوڵمانان بۆیە خوای گەورە لەسورەتی رەحمان تەنها باسی نیعمەتەکانی خۆیمان بۆ دەکات پاشان چەند جار دەفەرموێت و چەند بارەی دەکاتەوە بۆمان : فَبِأَيِّ آلاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾
جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزادو پەری بە کام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بروا ناکەن، کامی پەسەند ناکەن.
تەنها لە ناو قورئان و ئاینی ئیسلامیشە خوای گەورە سیفاتی رەحمانی بەکارهێناوە لەهیچ کام لە ئاینەکانی تردا وشەی ڕەحمان نەهاتووە.
ماکوان: سوێند بەخوا ڕاست دەکەیت ئیتر بەسیفاتی ڕەحمان بانگی دەکەم
شێخ برقان: ئێمە دەڕۆین، ئۆتۆمبێلێك شوێنت کەتووە، بزانە چی دەوێت؟
کە تەماشای دواوەم کرد، بینیم لەدوامەوە ئۆتۆمبێلێکی ڤاڵڤۆ فولم بۆ لێئەدات، منیش هێواشم کردوە هاتە تەنیشتمەوە ئومێد و سارا و تارا بوون، وامزانی یارمەتیان پێویستە. شوێنیان کەوتم چووینە جێگایەك وەستاین و دابەزیم ئومێدیش دابەزی.
ئومێد: برا ماڵی ئێمە لە شارێکە لەم نزیکانە هەموو چارەکە سەعاتێکمان ماوە بگەینە ماڵەوە، ماڵمان لەم شارەیە لە سەر ڕێگاکەماندایە، پێمان خۆشە میوانداریت بکەین و لەگەڵ دایکم و باوکم قسەم کردووە وتیان: با نیوەڕۆ داوەت بێت و بیهێننەوە بۆ ئێرە و دوای نانخواردن پڕوات.
ماکوان: زۆرم برسی بوو، بەڵام تۆزێك خۆم باداو وتم بەخوا ئیشم هەیە و دەبێت بڕۆم و چاوەڕێمن و هەندێك لەم قسانە پێشم خۆش بوو. قبوڵم کرد بەڵام خێرا پڕۆ من هێواش لێخوڕم خەوم دێت لەناو ئۆتۆمبێل و ڕێگای دوور بەتایبەت.
چووینە ماڵی ئەوان لەشاری لوندی لەسەر و مالمۆ وەیە لە وڵاتی سوید، بەخێرهاتنێکی گەرمیان لێ کردم، باوکی پیاوێکی مەعقول و سەرسپی هاتە دەرەوە.
ئومێد: ئەوە باوکمە و ناوی بورهانە
دایکیشی بەدوایدا هات چۆنی و چاکیم لەگەڵ ئەویش کرد و خۆی ناساند، ناوی توبا خان بوو.
دانیشتین و کاتژمێر ١١:٣٠ نیوەڕۆ بوو. دەنگی کاك بورهانم لا نامۆ نەبوو، ئاشنابوو بە گوێم.
ماکوان: کاك بورهان ئەم دەنگەی جەنابت نامۆ نیە، پێشتر بەیەکەوە قسەمان کردووە؟

بورهان: بەڵێ کاك ماکوان، من هەمیشە لە ژووری ئۆپۆزسیۆن بووم لای ئارام ئەحمەد.
ماکوان: خۆ هەموو کورد لە ئەوروپا دەچوونە پاڵتۆك ئەوە دەزانم، بەڵام من و جەنابت قسەمان کردووە بەیەکەوە؟
بورهان: بەڵێ شەوێکیان کۆڕێکت هەبوو لە ژووری کاك دەرون کورد و نەتەوەی، من و هاوڕێکانمان بەشداریمان کرد ئەو شەوە منت شۆرد.
توباخان "بە پێکەنینەوە": دەستت خۆش بێت کاکە ماکوان گیان ئەو شەوەش هەر پشتگیری تۆم دەکرد.
ماکوان: جا شەڕمان کردووە منیش هاتومەتە ماڵەکەتەوە و نانی ماڵەکەت دەخۆم، ناکرێت عەفومان بکەیت بەو سەر و ڕیشە سپییەی خۆت کاك بورهان بمانبەخشیت، خۆت دەزانی لەپاڵتۆك خەڵکەکان یەکتر نابینن هەموو دیاردەی دەنگە، جا ئەگەر قسەیەکی بەرزو نزمم کردووە لە قصورمان عەفو بە.
بورهان: کاکە گیان ئەوە دەڵێ چی، بەخوا بەقەدەر ئومێد خۆشەویستیت هەیە لام ڕاستە نوێژ ناکەم، بەڵام پڕوام بەقسەی کەس نیە تۆ نەبێت.
ماکوان: ماڵت ئاوابێت، ئەی دەکرێت بپرسم پرسیارەکەی بەڕێزت چی بوو، وا تێك گیراین؟
بورهان: ڕاستیت دەوێت وەڵامت دامەوە، خەتای من بوو حەزم کرد هەر قسەی خۆم سەرکەوێت، لێم پرسیت بۆ ئەوەندە خزمەتی ئیسلام دەکەیت بۆ ئەوەندە خزمەت بە کورد و کوردستان ناکەن، تۆش وەڵامت دامەوە زۆر خۆش بوو وەڵامەکەت ووتت: خۆ بە ئینگلیزی قسە ناکەم، ئەی ئەم کۆڕ و سیمینارانە و نوسینە بەکوردیە مانای ئەوە نیە خزمەت بێت بە کورد؟
ماکوان:بیرم کەوتەوە، ئەشزانم ناوت چی بوو ناوت شەبابە شێت بوو، وایە؟
بورهان: وەڵاهی ڕاست دەکەیت، وتیشت ناوەکەت پڕ بەپێستی خۆتە ئەوە تووڕەی کردم، ناوی شەبابە شێتی سلێمانیم لە خۆم نابوو، خۆ دەیناسی؟
ماکوان"بە پێکەنینەوە": ئەی چۆن نایناسم خۆشەویستم بوو، بۆ زانیاریت کە زۆر ڕەق تر دانەبەزیم لەسەرت، لەبەرخاتری ناوەکەت بوو.
لەبەر خاتری شەباب بوو، خۆی لە ڕاستیدا من کێشەم لەگەڵ ئێوە و ئیسلامیەکان هەبوو، هەندێك لەو برا ئیسلامیانە دەیانوو ماکوان هەمیشە باسی کوردایەتی دەکات، ئێوەش پێچەوانە بوون دەتانوت بۆ باسی کوردایەتی ناکەیت.
بورهان: وابوو ڕاستە، هەر ئەو شەوە ئەو پرسیارەیان لێ کردیت.
ماکوان: وەڵامەکەت بیرماوە چیم وت بەوان؟
بورهان: لەبیرمە بەس زۆر جوان وەڵامت دانەوە، لەو شەوەوە منیش فێری کوردایەتی بووم، نەمدەزانی ئەوە واتای کوردایەتیە.
ئومێد: کاك ماکوان وەڵامەکە چی بوو، منیش حەزدەکەم بزانم.

ماکوان: لەوێ لەخۆشەویستیم بۆ ئەوگەنجە موسوڵمانانە عەرزم کردن برایانی خۆم کە کەسێك باسی کوردایەتی کرد و نیشتیمان و خەڵکەکەی خۆشویست مانای وانیە لە ئیسلامدا شتی وانیە و کارێکی خراپی کردووە، پاشان ئەگەر ڕێزو حورمەت لە هێزە نیشتیمانیەکانی وڵاتی خۆی بگرێت کوفر نیە، چونکە هاوکار و هاوخەباتی تۆیە لە خەباتی ڕزگاری خوازی گەلی تۆدا کە بەشێکی زۆری موسوڵمانە، پێغەمبەری خوا  دەفەرمویێت: {من أخذ من الآرض شيئا بغير حقه خسف به يوم القيامه الى سبع أرضين} رواه البخاری.
واتا: هەرکەس خاکی کەسێك داگیر بکات و زەوتی بکات و مافی بخوات خوای گەورە دەیکات بەناخی حەوت چینی زەویدا لە رۆژی قیامەتدا.
پاشان دەفرمویێت: {ألعن الله من غير منار الآرض} رواه مسلم.
واتا: لەعنەت لەوکەسەی کە خاکی خەڵکی داگیر دەکات.
مەبەستی پێغەمبەری ئازیز  کە هیچ کەس بۆی نییە خاکی کەسێکی تر داگیر بکات چۆن ئەگەر مافمان داگیر بکرێت موسوڵمان خەبات ناکات لە پێناو خاکو خۆڵی وڵاتەکەی خۆیدا کەواتە ئێمە بە ئەرکی سەر شانی خۆمانی دەزانین و هەراجی پێوەناکەین و کوردایەتی بە سەر کەسدا نافرۆشینەوە، چونکە ئەو کەسانەی کە زۆر باس لە بیری نەتەوەیی دەکات دیارە ئەو جاش بووە دەیەوێت بەو قسە زلانە داپۆشن کە سەدان نموونەی لەو جۆرە لە بەردەست دایە.
ئەگەر کەسێك بەرگری لە خاکی خۆی کرد مانای وانیە ڕقی لە خەڵکانی ترە، ئەگەر کەسێك وتی من ناسیۆنالیزم، مانای وانیە ئیتر ئەوە پراو پری وشەکە بەکاری بێنێت، ڕاستە ئەم وشەیە لە دنیادا بە جنێو بە کاردێت، بەڵام لەناو کوردا بەو شێوە لۆژیکە نییە. کورد تینووی نیشتیمان و ئاڵا و سەروەری خۆیەتی بە مانایەکی جوان دایانتاشیووە، پاشان بۆ زانیاری هەموو لایەك کوردایەتی ئایدۆلۆژیەت نیە، تا تەنها کۆمەڵێك خەڵك خاوەنی بێت، کافر، موسوڵمان، عەلمانی، کۆمەنیست، مەسیحی و یەزیدی خاوەنی کوردستانن، هیچ کەس لەم چین و توێژانە بە تەنها خاوەنی ئەو نیشتیمانە نین دەبێت مافیان دیاری بکرێت.
کەواتە ئازیزانی من سۆزی کورادیەتی واتایی بریتییە لە.
- سۆزی نەتەوایەتی: خۆشەویستی بۆ نیشتمان خاکو خۆڵەکەی و کێشەکەی لە ڕووی سیاسی و ئابوریەوە.
- هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی کوردستان و پشتگیری مافی ڕەوای گەلەکەمان.
- بەرز کردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری خەڵکەکەی لە هەموو بوارەکاندا.
- بەکارهێنانی بیرێك (هەرکۆمەڵە بە دیدو بۆچونی خۆی) بۆ پشتگیری لە مافی نەتەوایەتی.
- پاراستنی ژینگەی کوردستان لە هەموو ڕووەکانەوە.
- پاراستنی مۆراڵی ڕەسەنی کوردەواری (ئاداب، ڕەوشت، ئاکار)

برای موسوڵمان چاکە و باشە لەگەڵ هەموو کەسێك دەكات، داوای خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەیەتی  چجای لەگەڵ خەڵکی وڵاتی خۆتدا ئەمە پوختەی کۆڕ و قسەکانم بوو.
بورهان: ڕاستەکەی وابوو، ئەوکات قسەکانت ئەوەندە جوان بوو خەریك بوو ئێمە دڵمان ئەتەقی، کەسمان نەبوو وەکو تۆ قسە بکات، ئیتر بەخیل بووین.
ماکوان: جا بەس نییە ڕاستگۆیت و دان بەڕاستیدا دەنێیت كاك بورهان گیان.
ئومێد: توخوا یەك پرسیار؟
ماکوان: فەرمووو!
ئومێد: ئیسلام بۆ ئەنفالمان دەکات؟
ماکوان: کێ ئەنفالتان دەکات؟ تۆ بۆ خۆت دەزانی ئەنفال هەر واتای چییە؟ خەریك بوو توڕە بم، بەس لەماڵەکەیاندا بووم.
ئومێد: ئەی ئەوەنیە ١٨٢ هەزار ئەنفال کورد ئەنفال کران.
ماکوان: لەبەر حورمەتی باوکت و ماڵەکەتان نەبووایە، وەڵامێکی زۆر ڕەقم ئەدایتەوە. جوان گوێ بگرە ئەنفالی ئیسلام و سەدام لەیەك جیابکەرەوە.
ئەنفال لە دیدی ئیسلام دەستکەوتە، دەستکەوتیش لە ئیسلامدا زەمکراوە واتا خراپە شتیکی زۆر باش نییە، سەرکەوتن لە ئیسلامدا جێگای شانازیە.
واتا لە پێناسەی ئەنفال یاسایەکی جەنگە لە ئیسلام بۆ ئەو کەرەستەو شتومەکانەیە کە لەدوای سوپای دۆڕاو جێدەمێنێت، من پێم وایێت هیچ پەیوەندی بە ئەسیرو گیراوەکانی جەنگەوە نییە، بۆیە خوای گەورە کە باسی ئەنفال دەکات هیچ کەس بۆی نیە قسەی تێدا بکات جگە لە خواو پێغەمبەرەکەی  واتا مرۆڤ هیچ ناتوانێت لەو یاسایەدا بە ئارەزووی خۆی داڕێژەری بێت، هیچ تێگەیشتی؟
ئومێد: نەخێر
ماکوان: پێتەوە دیارە دەموچاوت دیارەو هاوار دەکات دەڵێت هیچ تێنەگیشتم، تایبەتمەندی ئەنفال وەك وشە زارەوەیەکی ئیسلامیە وەك بەکار هێنان یاسایەکی ئیسلامیە، ئەمە تایبەتمەندیەکەیەتی کە بۆ حاڵەتی جەنگ بەکار دێت، بەڵام پێویستە ڕەوشی جەنگەکە وەك موسوڵمانان بن لە بەدردا، ئینجا ئەو یاسایە دەتوانرێت بەسەر واقیعێکی تردا بسەپێنرێت.
ئەنفالی سەدام بۆ ناشرین کردنی ئیسلامە، ئەو حیزب و دەسەڵاتیکی عەلمانی بوو بۆ ئەوە کە ئازاری ڕۆحی موسوڵمانان بدات بەگشتی بە شیعە و سونەوە ناوی موشەکی دەنا عەباس و حوسێن وە کوردی پێ جینۆساید دەکرد بەناوی ئەنفال، بەڵام نەخۆشخانەی بەناوی سەدام و شتە باشەکانی وەك ئامێری خزمەتگوزاری بەناوی شارستانیەتی سۆمەری و بابلی ناو دەنا وەك قیسارە و عشتار..هتد.
ئەنفال لە ئیسلامدا کە ڕوویدا ئەو کۆمەڵە ڕەش و ڕووتە بوون کە لە وڵاتی خۆیان لە مەککە دەرکرابوون ماڵ و سەروەت و سامانیان داگیر کرابوو لە زێدو مەڵەبەندی خۆیان ئاوارە کرابوون بۆ ئەوەی بەشێك لە مافەکانیان بگەڕێننەوە

لەگەڵ کافرەکاندا جەنگیان کرد و دەستکەوتیان دەستکەوت، لە کاتێکدا دەستکەوتەکە مەبەست نەبوو سەرکەوتنەکە لای موسوڵمانان جێگای بایەخ بوو کەواتە وەك ئاماژەم پێداوە دەستەکەوتەکە بایەخی نیە لای ئیسلام کە ئەنفالە، تۆ دوو شتت تێکەڵ کردووە یان بە نەزانی یان چەواشەکاری، ئەنفال وەکو یاسا وە لەگەڵ ئەنفالی سەدام.

ئومێد بێدەنگە، لەپڕ پرسیاریکی کرد: ئایا ئاینی ئیسلام دژبوو بەو جینۆسایدەی کە دژی کورد کرا، چۆن؟

ماکوان: بەڵێ؛ بە دڵنیاییەوە چونکە لە یاسای ئیسلامیدا هاتووە ئەو کەسەی پشیلەیەك بە ناحەق دەکوژێت و ئازاری دەدات خوای گەورە دەیخاتە دۆزەخ، کەسێك سەگێك تێر ئاو دەکات دەچێتە بەهەشت، ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە کوشتن و ئاژاوە و میلشیا و شەڕخوازی نەهێڵێت وخەڵکی بکاتە برا ئەمە دروشم نییە، بەڵکو بە درێژایی مێژووی ئیسلام خزمەتی بە خەڵك و مرۆڤایەتی کردووە بە گشتی، تەماشای نەیارانی ئیسلام بکە بۆ نموونە تەتار لەماوەی ٤٠ ڕۆژدا یەك ملیۆن کەسی لە شاری بەغداد کوشت، ئەمەریکا لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ٨٠ ملیۆن هیندە سوری کوشت، لە جەنگی جیهانی یەکەم ٦٣ ملیۆن کەس کوژرا، لە جەنگی جیهانی دووەمدا ٦٠ ملیۆن کەس کوژرا، بەدرێژایی هەموو مێژووی ئیسلام ئەوەندەی کەس نەکوژاوە تا ئەم قسەی لەگەڵ تۆ دەیکەم کە عەلمانیەکان و بێباوەڕان و خاچ پەرستان کردوویانە، مێژوویەکی وای نیە کە ناوی ببرێت بە کوشتار و جینۆساید بە پێوەر لەگەڵ بەرنامەکان و ئایدۆلۆژیاکانی تردا.

ئومێد: ئایا ئەکرێت بڵێین ئەوەی صەدام کردی بەهۆی پاشخانی موسوڵمان بوون و ئاینداری بوونەوە بووە؟

ماکوان: نا وانیە، ئاینداری ئەو لە کوێدایە؟ بەعس موسوڵمان نەبوون، بەڵکو حیزبێکی عەلمانی نەتەوە پەرست بوون لەبەر ئەوەی حیزبی بەعسی عەلمانی حیزبێکی کافری بێباوەڕ بوون.

شەفیق کەمال یەکێکە لە بیرمەندەکانی حیزبی بەعس بزانە چۆن لە شیعرێکدا بیروباوەڕی خۆیان بۆ ئەندامانی بەعسی دەخاتە ڕوو.

دەڵێت: امنت ببعثا ربا لا شريك له، وبعروبة دين لا مثل له

واتا: " ئیمانم هێناوە بە حیزبی بەعس کە جگە لە حیزبی بەعس هیچ خوایەکی تر نییە، بڕوام بەوە هەیە هیچ ئاینێك نییە جگە لە ئاینی عەرەبچێتی هاوشێوەشی نیە".

هیچ کام لە بەعسیەکان بڕوایان بە خوا و بە زیندووبونەوە نییە، هەڵبەت ئەوانەی کە دامەزرێنەر و بیرمەند و کادیری ناوەندی ئەو حیزبە بوون، چونکە لە بەرنامە و پەیڕە و پرۆگرامەکەیاندا وایە و لەسەر ئەوە پەروەردە کراون.

توبا خان: نان ئامادەیە بفەرموون.

# بانگخوزای و ئاراستەی باشە

دەست کرا بە نان خواردن و تارا و سارا هاتن لەگەڵماندا دانیشتن، کچێك لە ژوورێك لە ماڵەکەدا هات و بەخێرهاتنی منی کرد، باوکی وتی ئەمە دیدەی کچمە، منیش وتم خۆشحاڵم.
دیدە: ئەی چاوەڕێی ڕێباز نەکەین؟
توبا: تەلەفۆنێکت بۆ بکردایە، با زوو بهاتایە.
دیدە: بۆم کرد بەڕێگاوەیە.
ماکوان: ئەگەر خەڵك ماوە چاوەڕێ دەکەین.
بورهان: نانەکەت بخۆ و بڵێ بسم الله خۆ هەڵناسین لەبەر خاتری تازە زاوا نان بەجێ بهێڵین.

ماکوان: دیارە دیدە خان نانی بۆ ناخورێت تا دەستگیرانی نەیەت، ئەڵێن خەسویش زاوای لا خۆشەویستە وایە توباخان؟
توبا: بڵێم چی کوڕێکی باشە و خەریکی خوێندنە، بەڵام ئەویش تۆزێك بێدینە، دوعای بۆ بکە بەڵکو چاك بێت.
ماکوان: بسم الله خوا هیدایەتی بدات، کە وتی بێدینە لەدڵی خۆمدا ووتم قابیلی ئەوەی نیە چاوەڕێی بکەین، دەستمکرد بەنان خواردن.
لەکاتی نان خواردندا بووین، تازە زاوا خۆی کرد بە ژووردا، سڵاوی کرد و وەڵامماندایەوە، منیش کە ئەو هات وتم خوا نەیبڕێت بەڕاستی چێشت و نانێکی خۆش بوو، خۆش بەحاڵی ئەو کەسەی دەبێتە زاوات و خۆش بەحاڵی ئومێدی کوڕت و کاك بورهان، ئەم هەموو چێشت و نانە خۆشە دەخۆن بۆیە گوپیان خڕە، هەروەك موجامەلەیەك بۆ توبا خان ئەو قسانەم کرد و دەستخۆشی نانەکەیم کرد.
دانیشتین و خۆم ناساند بەڕێباز، ناوم ماکوان کەریمە.
ڕێباز: خۆشحاڵم منیش ناوم ڕێبازە و دیدە دەستگیرانمە و خەڵکی رانیەم.
ماکوان: بۆچی دەخوێنیت کاك ڕێباز؟
ڕێباز: زانستە مرۆیەکان، بەشی شارستانیەت.
بورهان: دەمەوێت ڕاستیەك بڵێم دیدەی کچم و ئەم کوڕە یەشتا لەیەك مارە نەکراون، ئەتوانیت مارەیان بکەیت لەیەك ؟
ماکوان: ببورە ئەوە ئیشی من نییە، ڕوا ناکەم پێویست بە مارەکردن بکات ئەگەر کاك ڕێباز موسوڵمان نەبێت! هەڵبەت لەسەر قسەی توبا خان وادەڵێم، چونکە نیکاح و مارەکردن بنەمایێکی ئیسلامە، کەسەکە بڕوای بە ئیسلام نەبێت مارەی دانامەزرێت. کە وام ووت دیدە ڕەنگی زەرد بوو، ڕێبازیش پێدەکەنی.
زیاتر باسەکەم ڕوونکردەوە، هەر پیاو و ژنێك بڕوایان بە ئیسلام نەبوو بە تایبەت پیاو ئەوا مارەی نییە، چونکە دەبێتە زینا هەروەکو ئەم ئەوروپیانەی لێدێتەوە.
بورهان: واتا ئەگەر کەسێك موسوڵمان نەبێت ژنی لێ مارە ناکرێت؟
ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە.
ڕێباز : واتا من ئەگەر موسوڵمان نەبم ناتوانم ژن بهێنم؟
ماکوان: ئەتوانی لەگەڵ ژنەکەتدا بژیت، بەڵام بە زینا حیسابە، هاوسەرگیری ئیسلامی و موسوڵمانانە دانامەزرێت.
ئەو ماڵە وەکو خۆی نەما، ڕێباز دیار بوو پێکەنینەکەی بوو بە خەم و خەفەت، دیدە ترسی پێوە دیار بوو، ئومێد بێدەنگە سارا هیچ کۆمێنتی نییە، بورهان و توبا تەماشای یەکتر دەکەن.
بەردەوام وتم بۆ وا دۆش داماون، ئیسلام هەڵبژێرێت و خۆتان لەو کۆت و زنجیرە ڕزگار بکەن، چیتان لە ئیسلام دیووە و چی لێدەزانن وا ڕقتان لێ هەڵگرتووە؟

ڕێباز: من بەدەست خۆم نیە پروام بە ئیسلام نیە.
ماکوان: چەند کتێبت لەسەر خوێندۆتەوە؟
ڕێباز: هەموو قورئانم خوێندۆتەوە.
ماکوان: سورەتی فاتیحە بخوێنە، بزانم دەیزانی؟
ڕێباز: ئاخر بە کوردی خوێندومەتەوە.
ماکوان: ناوی چی بوو تەفسیرەکە؟
ڕێباز: بیرم نەماوە
ماکوان: چەند ساڵ دەبێت؟
ڕێباز: شەوێك لەماڵی هاوڕێیەکم بووم لەوێ بینیم.
ماکوان: ئەو شەوە هەموویت خوێندەوە؟
ڕێباز: چاوم پێداخشاند.
ماکوان: تۆ و ئەمسالی تۆ کاکە ڕێباز باری دەرونیتان لەگەڵ ئیسلام تێکچووە بۆ خۆشت نازانی بۆچی پروات بە ئیسلام نیە، خۆ بەدڵنیاییەوە ڕاست دەکەیت شتێك تا لەسەری نەخوێنیتەوە چۆن پروات بۆ دروست دەبێت.
ڕێباز: بەو شێوەیەش نیە شتی لەسەر دەزانم، ئەوە داعشە ئەوە ئەو حیزبە ئیسلامیانەیە، ئەو یەکێتی و پارتیە.
ماکوان: ئەمانەی باست کرد کامیان باسی ئیسلامی دەکرد؟
ڕێباز: بڵێم چی هەموویان.
ماکوان: وانیە، تۆ شەڕ بەخۆشت و ئیسلامیش دەفرۆشیت و لەباسی خەڵکی ترەوە و لە تەماشای خەڵکی خراپەوە ئیسلام ئەپچڕی لەکاتێکدا ئەوانە هەموو تەمسیلی خۆیان دەکەن نەك ئیسلام، ئیسلام پێکهاتەی قورئان و سوننەتە نەك ماکوان و فلان، بۆ نموونە ئەگەر ماکوان چاکە بکات یاخود خراپە، کێ بەرپرسە؟
ڕێباز: ماکوان.
ماکوان: ئەوانی تریش هەروان، ئەگەر من چاکە بکەم خەڵك باش باسم دەکات ئەگەر خراپەش بکەم خراپ باس دەکرێم، لە ئیسلامدا چی خراپی تێدایە؟
ڕێباز: زۆر شت، مافی ئافرەت و کوشتن و بڕین و ..هتد
ماکوان: ناوی ویڵ دیورانت بیستووە؟
ڕێباز: بەشێك لە کتێبەکەی ئەو دەخوێنین لە زانکۆ.
ماکوان: کەسێکی چۆنە؟
ڕێباز: خاوەن زانیاری و پرۆفیسۆرە، هەمیشە جێگای بایەخی من و خەڵکی و جیهانیشە بەگشتی.
ماکوان: تۆ بە تواناتریت لە لێکۆڵینەوەدا یاخود ویڵ دیورانت؟
ڕێباز: بەدڵنیاییەوە ئەو.
ماکوان: دەزانی سەبارەت بە ئیسلام چی دەڵێت؟
ڕێباز: باسی شارستانیەتی عەرەب و ئیسلامی کردووە.

ماکوان: نا؛ مەبەستم خودی ئاینەکەیە، نەك شارستانیەتەکەی.
ڕێباز: زانیاریم نیە.
ماکوان: چەند خاڵێکی باسکردووە بۆت باس دەکەم لە وتارێکدا لە زانکۆی لەندەن لەسەر ئیسلام پرسیاریان لێکرد و ڕای خۆی دەربڕی لەسەری، لە هەمان کاتدا یاداشت کراوە لە کتێبی دیرۆکی شارستانیەتی گەلان، دەڵێت:
یەکەم: ڕەوشت لە ئیسلامدا خاڵی سورە و بەهیچ شێوەیەك ناشکێت.
دووەم: دین و دنیا وەك تەنی جاڵجالۆکە بە ناو یەکدا چوون یەکیان تەنیووە.
سێیەم: ڕاستی قورئان لەوەدایە کە ئاسمانییە لەسەرو تواناکانی مرۆڤەوەیە، بەڵام بۆ ژیانی مرۆڤ هاتووە.
چوارەم: ئاینی ئیسلام و سیاسەت هەرگیز لەیەك جیانابنەوە.
پێنجەم: قورئان هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی مرۆڤی باس کردووە، چی لەڕووی کۆمەڵگەوە چی لەڕووی تاکە کەسەوە.
شەشەم: ڕاستی قورئان لەوەدایە کە هەرگیز کۆن نابێت، لەدوای ئەو هەموو سەدەیە ئێستاش هەر بە زیندوویەتی ماوەتەوە.
حەوتەم: ئیسلام ئاینێکی زۆر ئاسانە، ڕۆشنە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا گونجاوە (لەگەڵ فیطرەتدایە) هەر لە منداڵیەوە هەست بە شیرینی دەکەیت و خوی پێوە دەگریت.
هەشتەم: ڕێکخستنی کۆمەڵگە و دەوڵەت لەقورئاندا ئاشکرایە.
نۆیەم: وەهم و خورافیات و قسەی پروپوچ لە ئیسلامدا جێگای نابێتەوە.
دەیەم: قورئان هۆکاری یەکخستن و یەکڕیزی موسوڵمانانە.
یانزەیەم: هاندان و ئارەزوومەندی و پاڕاستنی پاکو خاوێنی لە ئیسلامدا باسکراوە کە بنەمای ژیارە.
دوانزەیەم: هیچ توندوتیژیەك و ستەمێك لەم کتێبەدا جێگای نابێتەوە، لەهەمان کاتدا یاساو یاسای جەنگ و یاساکانی صوڵح و ئاشتی زەواج و تەڵاق و دادگەری زۆر بە ئاشکرا باسکراوە، ڕوونە وەك رۆژی پرشنگدار.
سیانزەیەم: ڕەمزی پێشکەوتنی فەرهەنگی و ڕەوشتی کۆمەڵگەیە و پەیرەوکردنیەتی لە ئامۆژگاریەکانی قورئان و ئیسلامە بە گشتی.
کۆتایی قسەکانی وڵ دیورانت گرنگی لەوەدایە بزانین ئەمڕۆ لە زۆربەی زانکۆکان کتێبی ئەم بیرمەند و لێکۆڵەرەوە ئەمریکییە وەکو سەرچاوەی سەرەکی لە پڕۆژەکانی زانستە مرۆییەکان بەکاردەهێنرێت، بە بێ سود وەرگرتن لە کتێبی دیرۆکی شارستانیەتی گەلان پڕۆژەکە نوقصان دەبێت.
تۆی بێدین کە خۆت بەزانستی دەزانی لەهەمانکاتدا فڕت بەسەر ئاینەوە نیە لەبەرانبەر فەیلەسوفێکی ئاوادا چی دەڵێیت؟
کە ئەویش فڕی بەسەر ئیسلامەوە نییە، بەڵام ئەو بە ئینصافەوە قسە دەکات. ناحەقم مەگرە کە دەڵێم بێدینەکان خاوەن دوو سیفاتن درۆزنی و نەخوێندەواری، ئەمە جنێو نیە ئەمە وەسفی ئێوەیە، جا ئەگەر دەمم دەکەنەوە ئەو کات زیاتر خەڵکی بێدین دەناسین و گەلحۆیی و گەمژەیتیان

زیاتر ڕوونتر دەبێتەوە، هیوام وایە مونصیف بیت کاکە ڕێباز، بەخۆتاندا بچیتەوە چاو لە مامۆستاکانت بکەیت.
من نامەوێت ئێستا وەڵام بدەیتەوە، بەڵام خاوەن پڕیارێکی ئازایانە بەو پڕۆ وورد لێکۆڵینەوە بکە لەسەر دینێك، ئەوەی پرۆفیسۆری تۆیە ئاوا قسەی کردووە.
ئومێد: کاك ماکوان چۆن دەتوانم وەکو تۆ قسە بکەم و بانگخوازی بکەم.
ماکوان: قۆریەکەی عەلادین بدۆزەرەوە و دەستی پێدا بهێنە، کە دێوەکە هاتە دەرەوە بڵێ ئەو بانگخوازیەی ماکوانم دەوێت.
ئومێد"بە پێکەنینەوە": رادەبوێرێ کاك ماکوان.
ماکوان: ڕانابوێرم، بەڵام ئەوە پێویستی بە ماندووبوون و هەوڵدانە خوێندنەوەی زۆری دەوێت تا بتوانیت زانیاری بدەیت بەخەڵکی وەکو من، من وەرمگرتووە بۆیە ئەدەمەوە بە خەڵکی.
ئومێد: زۆر سەرسامم بە قسەکانت، وەکو مەلاکان قسە ناکەیت لەگەڵ خەڵکیدا بەنموونە و توانای ئەو قسە دەکەیت
ماکوان: ئەوە پێغەمبەری خوا  فێری کردووین، ئێمەی موسوڵمان کە بانگەواز ئەکەین ( وەحیە)، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە هاتووە، کاتێك کە وەحی هاتووە خوای گەورە ڕێزی لە مرۆڤایەتی گرتووە نامەی ناردۆتە خوارەوە یاخود پەیرەو و پرۆگرامی ناردووە و ئەڵێت ئاوا بەم شێوەیە پڕۆن و ڕێگا ببڕن. واتا ڕێزی لە مرۆڤەکانی گرتووە، ئێمە ئەم ڕێزەی خوای پەروەردگارمان هەڵگرتووە و بە خەڵکی ئەگەیەنین ئەمە پێی ئەوترێت بانگەواز.
بەڵام خوای گەورە کاتێك بانگەوازەکەی داوە بە ئێمە هەر کەسێك بانگەوازی کرد ئەبێت بزانێت ئەگەر بانگەوازەکەی بە ئاسانی بۆ چووە سەر ئەوا ئەو بانگەوازە تەندروست نییە، هیچ کەسێك نییە بتوانێت بڵێت من بانگەواز ئەکەم و ئازار نەچێژێت، دڵی ناڕەحەت نەبێت، زیندان نەچێژێت و ئازار نەخوا لەسەری.
یەکێك لە سیفاتەکانی خوای پەروەدگار داعیە و یەکێکیش لە سیفاتی پێغەمبەری نازدار  داعیە، وە داوا لە ئێمەش کراوە کە هەمومان ببین بە داعی واتا بانگخواز یەك کەس نیە بڵێی مامۆستا فلان کەس یان ماکوان، بەڵکو هەمومان بانگخوازین. سیفاتە ئەبێت تۆش بانگخوازبیت، واتا هەرکەسێك بوو بە بانگخواز بێگومان توشی ئەم حاڵەتانە ئەبێت بە پێچەوانەوە بانگەوازەکەی تەندروست نییە.
ئومێد: بانگخوازی و بانگەواز شێوازی هەیە؟
ماکوان: بەڵێ؛ بە دوو شێوەیە:
خاڵی یەکەم:
هەموو بانگخوازێك دوای خوای موتەعال پێویستی بە ئەبو تالبێك هەیە، جا کافر بێت یان موسوڵمان چونکە تۆ پێویستت بە کەسێکە لە پشتت بوەستێت هەرچەندە ئەم هۆکارە لەدواییدا لەوانەیە نەمێنێت، بەڵام پێویستە هەوڵی بۆ

بدرێت. مادام پێغەمبەری نازدار □ کردوویەتی بۆ ئێمە سوونەتە. پێغەمبەری نازدار □ ئیستفادەی کردۆتەوە لە (قانونی وضعی) واتا لە مامی (ئەبوتالیب) و لەو پیاوە بەڕێزانەی کە بەڕێز بوون لەناو موشریکەکاندا وەکو (مطعم بن جبیر) کە خەڵکی بەڕێز و بە توانا بوون. پێویستە تۆ سەنەدێك پەیدا بکەی یاخود بە پێچەوانەوە، ئەوانەی کە ڕقیان لەخۆت و بانگەوازەکەتە ئەکەونە هەوڵ بۆ ئەوەی ئەو پشت و پەنایەت نەهێڵن، ئەمەش شتێکی سروشتیە. ئەبێت هەوڵ بدەی لە هەر بوارێك کە ئەبێتە پشوو بۆت ئەبێ دروستی بکەی ئینجا (رۆژنامەنوسیە، پەرلەمانتاریە ،مەلایەتیە، بەرپرسیارەتیە) هەرچیەکە، بۆ ئەوەی بتوانی خزمەتی ئیسلامی پێ بکەی ئەوا حاڵەتێکی زۆر ئاساییە.

خاڵی دووەم: ڕاگەیاندن:

ڕاگەیاندنت بۆ بەکارئەهێنن بۆ ئەوەی ئەو بانگەوازە بوەستێنێت ئەویش بە سێ شێوە...

یەك: خۆت ناشرین ئەکەن!

هەر چیەکیان کردووە ناشرینت ئەکەن پێت ئەڵێن (داوێن پیس، دز، ئیرهابی، جاش، خۆفرۆش، نیشتیمان فرۆش) هەموو ئەمانە حاڵەتێکی ئاساییە بە پێغەمبەری خوا □ وتراوە و حەتمەن بەسەر ئێمەشدا دووبارە ئەبێتەوە، ئەبێت چاوەڕێی ئەم تۆمەتانە بیت و نەترسی و بەهێز بیت و خۆڕاگر بی، ئەبێت خۆت داوێن پاك بیت و دزی نەکەی و ئەخلاقت جوان بێت، قسەت بۆ هەڵدەبەستن.

ئەبێت بانگخواز خۆڕاگر بێت، وەکو شاخ بەرامبەر بەو شەپۆلی بێدینیە بوەستێتەوە نابێت هیچ کاریگەری هەبێت لەسەرت. پێغەمبەری نازدار □ هەموو هاوەڵەکانی لەسەر ئەم شێوەیە پەروەردە کردووە بۆ نموونە کاتێك (خەبابی کوری ارب) دێتە خزمەت پێغەمبەر □ و ئەویش بووردەکەی خۆی داخستووە و دانیشتووە لەسەری، پێی ئەڵێ: (الا تدعوا لنا؟) واتا دوعامان بۆ ناکەی؟ هەرچەندە شتەکە زۆر ئاساییە، بەڵام پێغەمبەری خوا □ هەڵئەسێتە سەر پێ و دەم و چاوی سور ئەبێت و تووڕە ئەبێت لەبەر ئەوەی بێ هیوایی ڕووی تێکردن ئەفەرموێت: نابێ بێ هیوابن ڕۆژێك دێت ئەم دینە سەرئەکەوێت سوارێك لە یەمەنەوە تا ئەگاتە مەککە، هەروەها ئەفەرموێ (خەباب) پێشتر گەلانێك هەبوون لە ئێوە بە مشار ئەیانکردن بە دوو لەتەوە، بەڵام ئەوان لە دینەکەیان پاشگەز نەئەبوونەوە. هیچ کەسێك ناتوانێ ڕووبەڕووی ئەم دینە ببێتەوە.

تۆ ئەگەر قسەیەك بەخۆت یان بە کەس و کارەکەت بڵێن خێرا بکشێیتەوە دواوە ئەمە چ دینداریەکە؟ بەلاشتەوە ئاسایی بێت قسە بە خوا و پێغەمبەرەکەت □ بڵێن، واتا نابێت بلەرزیت و بترسیت.

ئەبێت بڵێیت بەڵی بەتەنیا من موسوڵمانم ئەم ئیسلامە لەسەر شانی منە بەتەنیا وەك و (ابوبكر صديق) کە وتی وەڵاهی بە تەنیاش بێت ئەم جیهادە ئەکەم بەرامبەر بە هەڵگەڕاوەکان.
دوو: ناشرین کردنی خودی بانگەوازەکە:
پێت ئەڵێن بانگەوازەکە خورافیاتە و ئەبێت بە گوێرەی حاڵەتەکە مامەڵە بکەین کە گونجاو بێت، پێغەمبەری خوا  لە جێگایەك کە بانگەوازی کردووە نەرم و نیان بووە بەرامبەر بەو کەسەی کە ویستوویەتی لێی وەرگرێت، بەڵام کاتێك کە بەرامبەری وەستاونەتەوە و شتی پیسیان کردووە بە سەریا فەرموویەتی (لقد جئتكم بذبح) واتا هاتووم بۆ ئەوەی بە سەر بڕینتان ببەم، بەڵام کاتێك کەسێك دێت بۆ کوشتنی گرتوویەتی و زەلیلە لەژێردەستی ئەڵێت سومامە بۆ موسوڵمان نابیت؟ ئەویش دەڵێ: موسوڵمان نابم بەستراومەتەوە ئەگەر ئازادم ئەکەی ئازادم بکە ئەگەر ئەمکوژی گەلێك هەیە کە حەقی خۆم بستێنێت واتا هەڕەشەیەکیش ئەکات.
پێغەبەری خوا  رۆژێکی تر ئەیبەستێتەوە بە کۆڵەکەی داری ناو مزگەوتەکەی خۆی، بۆ ئەوەی ڕەوشت و هەڵسوکەوتی هاوەڵان ببینێت و فێربێت، دوای ئەوە (سومامە) ئازاد ئەکا ئەویش ئەڕوات لە بیرێك خۆی ئەشوات و دێتەوە موسوڵمان ئەبێت، پێغەمبەر  لێی ئەپرسێت بۆچی ئەوکات موسوڵمان نەبووی؟ ئەویش ئەڵێت ئەوکات بەسترابوومەوە هەڵسوکەوتی ئێوەم هەموو بینی ئەگەر ئەوکات موسوڵمان بوومایە هەستم بە مونافیقی خۆم ئەکرد بۆیە ئەگەر لە گەردنیشتان بدامایە لە ناخەوە موسوڵمان بووم، بەڵام ئەڕۆم و دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی بە ئازادی خۆم ئینجا ئیسلامەتی خۆم ڕائەگەیەنم. هەندێك کەس هەیە بە ئازایەتی و بە جورئەتی ڕووبەڕووبونەوە موعجیب ئەبێت، هەندێك کەسی تریش هەیە ئوسلوبی خۆی ئارام و هێمنە.
سێ: خودی ئیسلام ناشرین ئەکەن و سەرقاڵت ئەکەن.
قسە لەسەر ئایەتەکان ئەکەن و بە دڵی خۆیان بە زمانە سەقەتەکەیان تەفسیری ئەکەن.
هەروەها سەرقاڵکردنمان لەلایەن مولحیدەکانەوە بە شتی باطل و لهو و تافهـ بۆ نموونە کردنەوەی کەناڵی سێکسی و گۆرانی جۆراوجۆرو سەرقاڵ کردنمان بە سیاسەتێك کە هیچ ئیستفادەیەکی نیە بۆمان.
کاتێك پێغەمبەری خوا  سورەتی النجم-ی خوێندەوە قورەیش ئەوەندە ئایەتەکانیان بەلاوە خۆش بوو لە کۆتایی ئایەتەکەش کە ئەڵی سوجدە ببە، لە جوانی و گەورەیی وشەکانی پێغەمبەری خوا  کە وەحی بوو هەموو کافرەکان سوجدەیان برد لەگەڵ پێغەمبەری خوا  ، بۆیە کۆچی دووەمی حەبەشە هەواڵ وا چووە حەبەشە کە هەموو قورەیش موسوڵمان بوون، چونکە هەموو سوجدەیان برد لەگەڵ پێغەمبەری نازدار ، بەڵام دوایی وتیان تەنها لەبەر جوانی قورئانەکە بووە کە سوجدەیان بردووە.

بۆیە (نضر بن حارث) بەمە تورە بوو ووتی: ئەچم بۆ ئێران لەوێ ئافرەتی سەماکەر و چیرۆکی ئەسفندیار و ڕوستەم ئەهێنم، کە هاتەوە لە نزیك کەعبە داینان ووتی: کەس نەچێت بۆلای محمد من لە محمد زیاتر و شتێکی موهیمترم هێناوە، محمد باسی چیرۆکی موسا و عیسا و کهف ئەکا وەرن بۆلای من چیرۆکی روستم و اسفندیارم پێیە، ئینجا هەستیان کرد چیرۆکەکانی ئەو خۆش نەبوو، چونکە هەمووی چیرۆکی کلاسیکی بوو بەڵام ئەوەی تر وەحی بوو، ئینجا ئافرەتەکانی ئەخستە رەقص و سەما بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك ڕابکێشیت، تا خوای پەروەردگار ئایەتی نارده خوارەوە ئەفەرموێت:

( وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا )

٦سوره لقمان

واتا: هەندێ لە خەڵکی هەن قسەی بێ خێرو بێ مانا دەکڕن (وەك گۆرانیە ناپوختەکان، کتێب و شریتە بێ نرخەکانیان...هتد) تا خۆی و کەسانی تریش لە ڕێبازی خوا وێڵ بکات، بێ ئەوەی هەست بکات بە مەترسی کارەکەی، بێ ئەوەی بزانێ چ کەتنێك دەکات بەخۆی و خەڵکی، وە گاڵتە بە پەیام و ڕێبازی خوا دەکات، ئا ئەوانە سزاو تۆڵەیەکی ڕیسواکەر و ئاپروبەر چاوەڕێیانە.

هەروەها دوای ئەوەش خوای گەورە ئایەتی نارده خوارەوە بۆ پێغەمبەری نازدار کە موزایەدەی حەرەکەتە ئیعلامیەکەی ئەوان بوو ئەویش ئەفەرموێت:

الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴿١﴾

لەسەرەتای سوورەتی (البقرة)دا ڕوونکراوەتەوە، ئەم ئایەتانەی (کە ڕەوانەمان کردووە لەم سورەتەدا) بەشێکە لەو قورئانە ڕوون و ئاشکرایە.

إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾

ئێمە ئەم ئایەتانەمان دابەزاندووە لە شێوەی قورئانێکی پاراودا بە زمانی عەرەبی بەڵکو لێی تێبگەن و ژیریتان بخەنە کار.

نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ ﴿٣﴾

ئێمە چاکترین چیرۆک و بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە (ئەی محمد صلی الله علیە وسلم) لە ڕێگەی (وحی)و نیگامانەوە، لەشێوەی ئەم قورئانەدا، هەرچەندە تۆ پێش ئەم باسە لەم بەسەرهاتە بێ ئاگا بووی.

سەرنجی هەمویان ڕائەکێشێت لەم ئایەتەی سورەتی یوسف کە مەککییە، هەمویان بەلایانەوە سەیر بوو ( الر ) چیە؟ ئەبێت چی بێت؟ سەرنجیانی ڕاکێشا چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەترین ئیعلامی بووە بەڵام بە وەحی ئاراستەکراوە.

خوای موتەعال ئەفەرموێت جوانترین و باشترین چیرۆکت بۆ ئەگێڕمەوە ئەی محمد.

ئێمە ٤ جۆر نوسینمان هەیە کە پێك دێت لە (کورتە چیرۆك، چیرۆك، نۆڤێل، ڕۆمان) لە هەموویان گەورەتر ڕۆمانە.

چیرۆك: نوسراوێکە سەرەتای دیارە و ناوەڕاستی دیارە و کۆتاییەکەشی دیارە.
ڕۆمان: نوسراوێکە ئەبێت هەموو ڕەهەندەکانی ژیان و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی تێدا بێت وەك و (زەواج، خێزان، منداڵ...هتد) کە هیچ کەسێك ناتوانێت ئەمانەی هەموو تیا جێ بکاتەوە چونکە قورسە. بەڵام سەیری سورەتی یوسف بکەن چی لە خۆی گرتووە باسی (باوك، پەروەردەی منداڵ، حاڵەتی کۆمەڵایەتی، خیانەتی برا، خیانەتی ئافرەت، زیندان، دامەزراندنی دەوڵەت، ئابوری دەوڵەت، حەرەکەتی ئۆپۆزسیۆن، حەرەکەتی حکومەتی ئیئتیلافی، ئاوەدان کردنەوە) هەموو لایەنەکانی ژیان تەنها لە سورەتی یوسف هەمووی تیایە، ئەمە موعجیزە نیە؟

خاڵی سێیەم: جەنگی دەروونی بانگخواز.
بۆ نموونە (شکاتی لێ ئەکەن،ئەیترسێنن، لە دەزگا ئاسایشەکانەوە بانگ ئەکرێت، پێی ئەڵێن دارکاریت ئەکەین، هەڕەشەی لێ ئەکەن)، بەڵام نابێت لەمانە بترسێت ئەبێت واقیعی ئەو چوار دەورەی خۆت بخوێنیتەوە بزانی لەکوێ بانگەواز ئەکەی. بۆ نموونە تۆ قسە بۆ کورد ئەکەی قسە بۆ ئومەتێك ناکەی چونکە ئێمە ئەوەندە گەورە نین، وەك و دکتۆر زاکیر نایك کە ئومەتێك گوێی بۆ ئەگرێت، تۆ ئەبێت بزانی لە واقعی خۆتدا ئیش ئەکەی، لە وڵاتێك، گەڕەکێك، مزگەوتێك، ئەبێ بزانی ئەم وڵاتە پێداویستی چییە؟ لەگەڵ یاساکانی دژ نابێت، ڕێزی خەڵك و بۆچونەکانیان ئەگری ڕێز لە کلتورەکانیان ئەگری ئەگەر کلتورەکەشی سەقەت بێت ئەبێت بە شێوەیەك بۆی ڕاست بکەیەوە کە تورەی نەکەی، چونکە پێغەمبەری نازدار  نەیئەویست تورەیان بکا، بەڵام قورەیش کە ئەیانزانی ئەو داوای پرۆژەی (لا اله الا الله) ئەکات کە هەروا پرۆژەیەکی ئاسان نەبوو، چونکە تۆ نابینی لە هیچ شوێنێکدا پێغەمبەری نازدار  قسەی بە بتەکانی ئەوانی وتبێت، چونکە ئەیزانی ئەمە واقیعی وڵاتی ئەوانە، بۆیە ووردە ووردە لە چاکسازیا بوو بە بێدەنگی هەرچەندە ئازاریان ئەدا، تاکو هاتەوە هەموو کلتورەکەی تێکدا بەسەر یەکا و سەرلەنوێ کلتوری جوانی ئیسلامی پێشکەش کردنەوە. ئیسلامیش خۆی وەکو ئاو وایە کە لە دۆلکەیەکەوە ئەیکەیتە ناو پەرداخێك زۆر بە ئاسانی دێتە خوارەوە، بۆیە کە ووردە ووردە خەڵکەکەت تێگەیاند ئەوانیش بە ئاسانی وەری ئەگرن.

خاڵی چوارەم: داوای شتت لێ ئەکەن کە لە توانات دا نییە
ئەم داوایانە لە پێغەبەری نازدار  کراوە بۆ نموونە داوایان ئەکرد لە ئاسمانەوە هەورە تریشقەیان بۆ دابەزێنێت و باخ و باخاتیان بۆ دابەزێنی یان بۆ مەلەئیکەتێك نایەت قسەیان لەگەڵ بکا، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: محمد پێیان بڵێ من تەنها بەشەرێکم وەك و ئێوە هیچ شتێکم لە دەسەڵاتدا

نییە لەناو ئێوە ئەژیم، بۆیە خوای گەورە بەڵگەی عەقڵییان ئەداتێ بۆ ئەوەی تێبگەن، بۆ ئەوەی مامەڵە وەكو بەشەرێك لەگەڵ پێغەمبەرەكەی  بكەن چونكە دەعوەكە ئیصلاحی و چاكەخوازیە كە ئەیەوێ بیكا. ئەم داوایانەت بۆیە لێ ئەكەن ئەیانەوێ بتشكێنن تۆش پێویستت بەوەیە وەڵامیان بدەیتەوە.

خاڵی پێنجەم: گاڵتە پێكردن

گومانی تیا نیە هەر كەسێك بانگەواز بكات گاڵتەی پێ ئەكەن، بەڵام كەسایەتی خۆت ئەو گاڵتە پێكردنە ڕەت ئەكاتەوە. ئیسلام داوات لێ ئەكا كە هەر كاتێك پێویست بوو بە نەرمی قسە بكەی هەر كاتێكیش پێویست بوو بە توندی بۆ نموونە لە (میدراس) كە (فەنحاس) بە (ابوبكر)ی ووت خوایەكەی ئێوە پارەی نییە و فەقیرە (ابوبكر) كێشای بە دەمیا، چونكە وا پێویست ئەكا لەم كاتانەیە بكێشی بە دەمیانا، یان ئیمامی (عومەر) كە بینی موسوڵمانێك لە مزگەوتەكەی پێغەمبەری نازدار  گەردن كەچ و خۆی بچووك كردۆتەوە، كێشای بە پشت ملیا ووتی گەردنت بەرز بكەوە موسوڵمان بە عیززەتە. عەرەب ئەڵێن ( فی كل مقام ، مقال) تۆ كاتێك كە بانگەواز ئەكەی ئەبێت بزانی لە كوێ و كەی قسەی ڕەق یان نەرم ئەكەی، پێویستە واقیعەكە بخوێنیتەوە ئینجا قسە بكەیت و نەهێڵیت زەلیلت بكەن ئەگەر كەسێك زلەیەكی لێدایت زلەكەی لێبدەوە بۆ ئەوەی بزانێت ئازاری ڕوومەت چۆنە بەڵام زلەش لە كەس مەدە دەستدرێژی مەكە سەر كەس بێگومان ئەگەر داوای لێخۆشبونی كرد و تۆش لێی خۆش بووی ئەوە باشتر. تۆ كە موسوڵمانی ئەبێت فەرقت هەبێت  ئیمامی (عمر) ئەفەرموێت: (نحن قوم اعزنا الله با لاسلام)  ئیسلام خاوەنی عیززەتە، عیززەت مانای ئەوە نیە كوشتن و ئیرهاب بێت عیززەت بە زانست و كەسایەتی بە قوەتی خۆتە. ئەبێت ڕاستگۆ بی نابێت كاری نەشیاو و خراپ بكەی تا خەڵك گاڵتەت پێ بكا. ئەبێت نموونە بیت تۆ لە ناو ئەم شانۆیەدا كاراكتەری بەرنامەكەی خۆتی، ئەبێت بە جوانترین شێوە ڕۆڵەكەی خۆت ببینی.

ئومێد: زۆر سەرسام بووم بەو ئوسلوبە، تكایە چۆن بتوانم بخوێنمەوە؟

ماكوان: من دەبێت بڕۆم  كە گەیشتمەوە نەرویج لەوێوە ئاگادارت دەكەمەوە چی بخوێنیتەوە. ماڵئاوایم لێكردن و زۆر مەمنونیم دەربڕی بۆ میوانداریەكەیان و مەبەستیشم بوو خۆم وەكو بانگەوازێك بۆیان ئەو قسانە بكەم، چونكە خەڵكێكی ئەدەبی و ئیعلامی بوون. هەڵسام و كەوتمە ڕێ بەرەو  نەرویج، لەڕێگادا بەتەنها بووم  لەدڵی خۆمدا ووتم ئەم جنۆكانە وەكو جگەرەیان لێهاتوە، لەگەڵ خوێنمدا تێكەڵ بوون خۆزگە پەیدا دەبوونەوە .

ماوەیەكی زۆر ڕۆشتم  گەیشتمە شاری  یۆتۆبۆری  لەوێ جادەم لێ هەڵەبوو بە ئاراستەیەكی هەڵەدا ڕۆشتم شەو داهاتبوو. تا بەناڤییەكە خۆم ڕاست كردەوە پێم چوو ماندویش بوو بووم لە لێخوڕینی زۆری سەیارە، ناچار

ویستم پشویەك بدەم و چوومە جێگایەك كەمێك دانیشتم و ویرسان و پەروانە ڕووە و من هاتن.
لەدڵی خۆمدا ووتم ئەمانەم مەبەست نەبوو حەزقیل و سەسیل و برقان پێداویستی منن.

## چوون بۆ مەملەکەتی جنۆکەکان

لە دوای ئەوەی لە نزیك شاری یۆتۆبۆری ڕێگام لێ هەڵە بوو، تا ڕێگام دۆزیەوە بە ناقیەکم ماوەی نیو کاتژمێرم پێچوو، بەڵام ماندوو بووم لام دا تا پشووێك بدەم. لەکاتی پشوەکەمدا ووتم خۆزگە ئێستا حەزقیل یان سەسیل یان شێخ برقان لەگەڵمدا بوونایە.
لەم قسەنەدا بووم لەگەڵ خۆمدا لە پڕ ویرسان و پەروانە دەرکەوتن، ڕووە و من هاتن. لە ژیانمدا لەکەس نەترساوم و سڵیشم لە هیچ نەکردووە تەنها ملم ناوە، بەڵام ئەوەندە ئازارم چەشت بوو بەدەست پەروانەوە زۆر لە پەروانە دەترسام. هاتن دانیشتن لەلامدا دڵم بەپەلە لێ ئەدات، قسەکەی علی یەمەنیم بیرم کەوتەوە -بەڕەحەمەت بێت- کە ووتی هۆکاری ترسە جن دەتوانێت بێتە لاشەوەتەوە، منیش هەرچۆن بوو ویستم بەسەر خۆمدا زاڵ بم، بەڵام زۆر ڕقم لە پەروانە بوو چونکە زۆر ئازاری دابووم.
ویرسان: ماکوان ئەزانی بۆچی پەروانەم لەگەڵ خۆم هێناوە؟ دەزانم پەروانەت خۆش دەوێت، لێت مارە دەکەمەوە کە لە ژیانتا پێویستت بە هیچ کەسی تر نەبێت، ئەویش تۆی خۆش دەوێت.
قسەکەی تەواو نەکرد هەستم بە توڕەبوونێکی زۆر سەیر کرد لە ناخمدا، ئەوەندەی تر ڕق ئەستورتر بووم، دەستم برد بەپەلە بۆ قورگی پەروانە بۆ

ئەوەی بیخنكێنم، دەستم گیركرد لەقوڕگی، هەستم كرد شتێكم گرتووە بەدەم ئەو ڕقەشمەوە ئایەلكورسی دەخوێنم، ئاگام لێ بوو ویرسان ئەكێشێت بەدەستمدا دەڵێت: خنكا بەدەستتەوە ئەكێشێت بە دەستمدا هاوار دەكات ئازادی بكە، هەست بە ئازار ناكەم كە پێمدا دەكێشیت، بەڵام هەستم بەوە دەكرد هێزێك وەكو تەزووی كارەبا ڕامدەوەشێنێت، بەڵام ئەوەندە بە ڕقەوە دەستم بۆ بردبوو ویرسان هاواری دەكرد بەڕەڵای بكە ئیتر نایەینەوە، بەڵێن بێت نایەینەوە، ئەخنكێت - ئەخنكێت، ماكوان تكایە بەڕەڵای بكە.

لەوكاتەدا شێخ برقان ڕووی كردە ویرسان: پەیمانمان بدەنێ نەیەنەوە بەلای ماكوان دا.

ویرسان: پەیمان بێت نایەینەوە بەلایدا، بەس ئازادی بكات كوشتی! خەریكە دەخنكێت.

شێخ برقان: ماكوان تكات لێدەكەم ئازادی بكە، با لەو فیتنەیە ڕزگارمان بێت.

ماكوان: لەبەر حورمەتی شێخ برقان هێمن بوومەوە، ئازادم كرد و لەبەر دەستمدا نەمان، بەڵام من هەموو گیانم عارەق و ئاوی لێدەچۆڕا، هەستم بە ماندوێتی كرد.

شێخ برقان: بڕۆ ناو ئۆتۆمبێلەكەت، هەڵسە بڕۆ.

ماكوان: باشە بەسەرچاو، هەڵسام قاچەكانم ماندووبوون وەكو وابوو حەماڵیم كردبێت قاچەكانم زەوی نەدەگرت سەرم گێژی دەخوارد، بەپەلە چووم و خۆمگەیاندە ناو ئۆتۆمبێلەكەم و ئەوەندە ماندوو بووم چاوم نابەیەكدا، نازانم بوورامەوە یان خەوم لێكەوت، بەڵام كە چاوم هەڵبڕی شێخ برقان لەلامدابوو.

شێخ برقان: باش بوویت شێرە پیاو؟

ماكوان: زۆر ماندووم، نەچوونەتە ناو لاشەم ئەو سەگانە؟

شێخ برقان: نا- ناتوانن، چونكە پەیمانمان لێوەرگرتوون!

ماكوان: ئەی بۆ وا ماندووم؟ ماندوویەتیم ناحەسێتەوە.

شێخ برقان: زیاد لە ١٣ كاتژمێرە خەوتوویت لێرە، ئەگەر زۆری تر بمێنیتەوە پێدەچێت سكاڵات لەسەر تۆمار بكرێت و پۆلیس بێت، ماوەیەكی زۆرە لەناو ئۆتۆمبێلەكەتدای هەرچیت كردوە شوێنەكەت بگۆڕە، بڕۆ دەم و چاوت بشۆ و جێگای سەیارەكەت بگۆڕە بۆ شوێنێكی دیكە.

ماكوان: ناتوانم چاوم هەڵنایە خەوم دێت.

شێخ برقان: تەحەمولت هەبێت و هەڵسە دەستنوێژ بگرەو نوێژەكانت بكە.

ماكوان: باشە بەسەرچاو، كەوای وت لەترسی خوا كە نوێژەكانم فەوتابوون خێرا گورێكم دایەوە بەرخۆم و چوومە ناو كافتریاكە دەست نوێژم گرت و هاتمە دەرەوە لەبەر سەرمادا نوێژەكانم كرد هەستم كرد لاشەم تۆزێك باشتر بوو، بەڵام زۆر ماندوو بووم ماوەی ٢٠ كیلۆمەتر ئۆتۆمبێلم لێخوڕی بوو هەر زۆر ماندووبووم نەم دەتوانی بەردەوام بم، هەرچۆن بوو خۆم گەیاندە جێگایەكی تر و تا گەیشتمە بەنزینخانەیەك و لەوێدا وەستام، دیسانەوە

نازانم خەو بوو یان بێهۆش بوومەوە، چاوم هەڵبریەوە ئەمجارە شێخ برقان و حەزقیل و سەسیل لەلامدا بوون، حەزە گیان دەرمانەکەی هێنابووەوە، بۆنم کرد و هەڵم مژی هەموو گیانم ئیسراحەتی کرد و چاوەکانم کرانەوە و تەماشای کاتژمێرم کرد ٤ بەیانی بوو، وتم شێخە چەند کاتژمێرە خەوتووم ؟
شێخ برقان: لە دوێنێ نیوەڕۆوە، تەلەفونێك بکە بۆ خێزانت زۆر هەواڵت دەپرسن، دایکیشت تەلەفۆنت زۆر بۆ دەکات وەڵامیان بدەرەوە زۆر لە دڵە ڕاوکێدان.
ماکوان: تەلەفۆنم کرد بۆ دایکم و پاشان بۆ خێزانم، هەواڵم دانی کە زۆر باشم و شەحنم نەمابوو وایەری شەحنەکەشم خراپ بوو، ماوەی دوو ڕۆژە لەسویدم لەگەڵ هەندێك برادەری خۆمدام پاش چەند کاتژمێرێکی دیکە دەگەمەوە ماڵەوە بۆ نەرویج.
شێخ برقان: ئەتوانیت بڕۆیت؟
ماکوان : ئەی بۆ نا، ئەتوانم
شێخ برقان: دابەزە تاقی بکەرەوە ؟
ماکوان: دەرگام کردەوە و دابەزیم تاقی بکەمەوە بزانم دەتوانم بڕۆم قاچم هیچ هێزێکی تێدا نەمابوو، یەکسەر کەوتم بەدەستم و دەرگای ئۆتۆمبێلەکە خۆم گرتەوە، قاچم هیچ توانایەکی نەمابوو دەمزانی قاچم هەیە، بەڵام هیچ هەستێکم نەبوو، زۆر بەزەیم بە خۆمدا دەهاتەوە.
شێخ برقان دەستی کرد بە پێکەنین: پێویستە بڕۆین بۆلای ئێمە!
ماکوان: بۆ کوێ بچین؟
شێخ برقان: بۆ مەملەکەتی جنۆکە و پەریەکان، دەرمانێکمان هەیە بیدەین لەقاچت.
ماکوان: ئەی بۆ نایهێنن بۆ ئێرە؟
سەسیل: نایەت.
حەزقیل: بڕۆ دەچینە لای ئێمە نانێك دەخۆین و دەمێکەیە نانت نەخواردووە ماندوو و لاوازی، وایە؟
ماکوان: وەڵڵا حەزە گیان، خۆم زۆر زەلیل دەبینم قاچەکانم لەدەست داوە.
سەسیل: نا لەدەستت نەداوە، ئەژنۆت بخە سەر زەوی بزانە هێزی تێدایە ئەتوانیت بە ئەژنۆ بڕۆیت؟
ماکوان: جا چۆن بە ئەژنۆ بڕۆم؟
سەسیل: پێڵاوکانت بخە ژێر ئەژنۆ بیخشینە تا دەچینە سەر خۆڵەکە و لەوێوە دەڕۆین.
ماکوان: تێناگەم!
شێخ برقان: بیرتە لە سلێمانی بوویت لای قوتابخانەی کاوە، چۆن بردمانیت بۆ مەملەکەتی خۆمان؟
ماکوان: بەڵێ، بەڵێ بیرم کەتەوە، دەبێت خەتەکە بەدەورمدا بکێشن وایە؟
سەسیل: بەڵێ تەواوە ئەمجارە من دەیکەم، من دەتبەم.

ماکوان: پێڵاوەکانم داکەند و خستمە ژێر ئەژنۆم و ئەژنۆکانم بە هێز بوون، تەنها قاچم و پێکانم توانایان نەمابوو، بەدەم خشاندنەوە ڕۆشتمە سەر خۆڵ و بەدەوری خۆمدا بازنەیەکم کێشا و هێندەی چاو تروسکانێ بەرچاوم ڕەش بوو، هەوایەکی خێرا و سارد لێیدام و چاوم نوقاند و بەرزمکردەوە لە چ جێگایەك بووم!

لەوڵات و مەملەکەتی ئەڤەتار دەچوو ئەوەندە خۆش بوو، ئەو هەموو خەڵکە بەدەورم دا وەستا بوون منیش ئەژنۆکانم لەسەر زەوی بوو. ناچار ماندوو بووم دانیشتم، ئەو هەموو خەڵکە تەماشای دەکردم و بێدەنگ بوون، منیش ناچار هاوارم کرد حەزقیل، سەسیل، شێخ برقان!

لەپڕ پیاوێکی بە شەهامەت و پڕ لە ڕیش و ویقار دەرکەوت ڕووە و من هات پاڵی خستم، بەهێمنی و بەزەردەخەنەوە تاجێکی لەسەردا بوو عەبایەکی ڕەنگ ئاڵتونی بەشانەوە بوو، جلو بەرگی لەشێوەی جلوبەرگی چینییەکان بوو دوو بەش لەبەردا بوو منیش پاڵ کەوتم، ئاوێکی لینجی هێنا لە ئاوی ئالوڤێرا دەچوو دای لە قاچم و ماوەیەك پێوەی مایەوە، هەریەك لەو کۆمەڵەی لە دەور و پشتم بوون دەهاتن و دەستێکیان ئەدا لەقاچم و دەڕۆشتن زیاد لە ٢٠٠ کەس دەبوون، هەمووی بێدەنگ تا دەورم چۆڵ بوو، کەسم بەدەورەوە نەما هەڵسامەوە، قاچم زۆر باش بوو هەر زۆر ئاسایی بووم. لەدوورەوە لە نزیك مێرگ و گوڵزاراوێکدا کۆمەڵێك دانیشتبوون، کەمن هاتم دونیا زستان بوو لەم بەشەی ئەماندا دونیایەکی سەوز و جوانە، پڕە لە جریوەی چۆلەکە و هاژەی ڕووبار و چەم و سرەوی بەیان و کات دیار نیە، خۆر لە ئاسماندا نابینرێت! ئاسمان شین نیە، بەڵکو زەردەی ئێوارەیە زەردەش نیە، ڕەنگەکانی زۆر سەرنج ڕاکێشە، هەرچۆن بوو ویستم بگەمە لای ئەو کۆمەڵەیە، هەر دەڕۆشتم و ئەو کۆمەڵەش دوور دەکەوتنەوە، ماندووبووم لە رۆشتن و کات وەك خۆیەتی، ئەوانیش لە جێگای خۆیان نەجولان، کەچی من هەر بەوان ناگەم، بەڵام کوڵم نەدا هەر ڕۆشتم تا گەیشتمە نزیکیان کۆمەڵێك بوون زیاد لە ١٠ کەس ئاوڕیان دایەوە حەزقیل و شێخ برقان و سەسیل و ڕاقیم بینی و ئەوانی ترم نەناسی.

شێخ برقان: شکور باشی ماکوان گیان؟

ماکوان: سوپاس بۆ خوا زۆر باشم خۆشحاڵم بە بینینتان و بەتایبەت کاکە ڕاقی برام، هەواڵی حەنانەی خوشکم چۆنە؟

ڕاقی: زۆر باشین کاکە ماکوان گیان، ئێمە ئاگامان لە تۆیە سوپاس بۆ هەواڵپرسینەکەت

حەزقیل: برسیتە؟

ماکوان: لەماڵەکەتاندام خەڵکی لەماڵەکەیدا بە خەڵکی تر دەڵێت برسیتە؟

سەسیل"بەپێکەنینەوە": ئێستا ئەوە دەخۆیت لە ژیانتا نەتخواردووە.

ماکوان: ئەم بەڕێزانەمان نەناسی، چی دەخۆین سەسیل؟

سەسیل: خواردنێکە، ناوی (ڤەڤەشینکە) بۆ تۆ زۆر باشە و بۆ تۆ دروست کراوە.
شێخ برقان: جۆرێکە لە ماسی کە بە دارێك برژێنراوە بۆ تۆ، دوکەڵەکەی تامی خۆش دەکات لە جیاتی خوێ و سوێری بە ئاوی سوێری دەریا لەدوای برژاندنی هەڵیی دەژەنین لە ئاوی دەریا و تامی زۆر خۆشە، شەرابی شیر و هەنگوینیش بەسەریدا کراوە!
ماکوان: کوا ڤەڤەشینکە بیهێنن بابیخۆم وا باسی دەکەن خەریکە سوێم دەبێتەوە.
سەسیل: با جارێ ئەمانەت پێ بناسێنم، خیەل و مویال و عەمبورت و هەرسێکیان بران و زۆر تۆیان خۆش دەوێت، شەڕی زۆریان کردووە لەسەرت، بابیال و منۆل ئامۆزان ئەوەش ڤاورن-ە برای عەزیز و گەورەی هەموومانە.
ماکوان: خۆشحاڵم بەس ڤاورن، ئەو کەسە نەبوو کە ئالوڤێراکەی دابوو لەقاچم نازانم دەرمانێکی دا لە قاچم وابوو؟
ڤاورن: بەڵێ من ئەوم، حەکیم باشی ناو ئەم بەڕێزانەم.
ماکوان: بارك الله فیکم خوا جەزات بداتەوە، دەرمانەکەت زۆر کاریگەر بوو.
حەزقیل: دەرمانی شوشەکەش هەر ئەم دروستی دەکات و زۆر شارەزایە لەو دەرمانانەی کە دروست دەکرێت لە گژوگیا.
ماکوان: وەڵڵا ماوەیەکی زۆرە بەدوای شتێکی وا دەگەڕام، گیانم توشی پەڵەیەك بووە چارەسەری چییە ڤاورن؟
ڤاورن: کوا نیشانم  بدە؟
ماکوان: فەرموو بەتایبەت لەدەوری ژێر ڕانەکانیشم هەیە، چەند جار چوومەتە لای دکتۆریش مەرهەمی بۆ نووسیوم هەر لێمداوە و چاك نەبووە.
ڤاورن: دەستی کرد بەناو جانتاکەیدا و شتێکی دەرهێنا لەڕەنگی خوێن دەچوو بەڵام ڕەق بوو پێی دام و وتی ئەوە بخۆ چاك دەبیت، بە پشتیوانی خوا.
ماکوان: لێم وەرگرت و خواردم تامی زۆر خۆش بوو، تامەکەی لە تامی زەنجەفیل دەچوو، بەڵام بە شیرینتر و خۆش مەزەتر.
ماسی هات لەسەر نانەشان دانرابوو زۆر جوان برژابوو، وتم ئەوە ڤەڤەشینکەیە؟
سەسیل"بەپێکەنینەوە": بخۆ بزانە چی تامێك ئەدات؟ هەموو مرۆڤایەتی شتی وای تێدا نیە.
ماکوان: هەتیو زۆر چاوچنۆك دیاری خۆ بەشی تۆ ناخۆم سیلاوی، بەڵام ڕاست دەکەی خۆش دیارە، بسم الله-م کرد و ئەوانیش بسم الله-یان کرد، دەستمان کرد بە خواردن، تامێکی خۆش و نایابی هەبوو، دەستم کرد بە گیرفانمادا  بە مۆبایلەکەم وێنەی بگرم.
ڤاورن: لە ئۆتۆمبێلەکە لە بیرت چوو، نانەکەت بخۆ و بیر لە تەلەفۆن مەکەرەوە، ئەم خواردنە بۆ تۆ باشە.

ماکوان: دەستتان خۆش سوپاسی داوەتەکەتان دەکەم، ئەرێ بەڕاست شێخ برقان من هەر دەبێت لەسەر خۆڵەوە بێم بۆ ئەم وڵات و مەملەکەتی ئێوە؟
شێخ برقان: ئەگەر بەڕێز ڤاورن لێرەبێت من قسە ناکەم، چونکە ئەو برا گەورە و شێخی هەموومانە!

ڤاورن: ئەوە گەورەیی خۆتانە، بەڵێ کاك ماکوان دەبێت هەموو پێگەیشتنێك بە ئێمە و هاتنی تۆ دەبێت لە ڕێگای هەموو کەرەستە سروشتیەکانەوە بێت، ناتوانین لە ڕێگای چیمەنتۆ یاخود لە نێوان تەلبەند و ئاسانی دروستکراوەکاندا خەڵکی بێتە لای ئێمە زۆر بەئاستەم دەتوانیت، بەڵام جاران دەکرا ئێستا کەس لەناو ئێمەدا ئەو توانایەی نیە، ئەوەشی ئەوەی هەیە لەم ناوچەیەی ئێمە نیە.
ماکوان: ئێوە ئێستا لە کوێن و ئەم ناوچەی ئێوە ناوی چیە؟
ڤاورن: ئەم ناوچەیە ناوی مەملەکەتی ڤاورنە بەناوی منەوەیە، من گەورەی ئەم ناوچەیەم لای ئێمە هەر جنۆکەیەك حوکمی هەر جێگایەك بکات شوێنەکە بەناوی ئەوەوە ناو دەنرێت، کە ئەو مرد جێگرەوەکەی ناوەکەی دەبات.
ماکوان: هەندێك پرسیار هەیە مێشکی خواردووم، بەس پێم بڵێن ئێوە دڵ و مێشك و ئەو ئەندامانەتان هەیە؟
ڤاورن: نەخێر؛ ئێمە جۆرە لاشەیەکمان هەیە کە تەنها وزەیە وەکو ئێوە ماددە نییە، بەڵام دەتوانین لە ناو ماددەدا جێگای خۆمان بکەینەوە، تاکو بتوانین لەگەڵ خەڵکانێکی وەکو بەڕێزتاندا قسە و ئاخاوتن و گفتوگۆ بکەین.
ماکوان: ئێوە تەنها لەگەڵ مندا بەو شێوەیە قسە دەکەن؟
ڤاورن: نەخێر؛ لەگەڵ زۆر کەسی تردا پەیوەندیمان هەیە، بەڵام هەندێکیان توانای ئێمەی نامێنێت و دواکاریان زۆرە ئێمەش ئیهمالیان دەکەین، یان پەنا دەبەن بۆ جنە شەیتانەکان لەگەڵ ئەوان تێکەڵ دەبن و ئامۆژگاریان دەکەین بەقسەمان ناکەن وازیان لێدەهێنین، هەیە کەسی بەڕێز و خواناسە، بە کەراماتی دەزانێت باسی ناکات لای کەس، خەڵکێکیش هەیە وەکو تۆ توانای نوسین و دەربڕینی باشە ڕاستیەکان دەگەیەنێت، هەیە هەر باسی ناکات دەترسێت خەڵکی بڕوای پێنەکات.
ماکوان: ئەی ئێوە مێژووی خۆتان دەنوسن، مێژووتان چیە؟
ڤاورن: ئێمە وەکو ئێوەی مرۆڤ توانای زۆر مانەوەی بیرەوەریمان نیە لەناو کەلەی سەرمان و مێشك کە ئێوە هەتانە، بەڵکو ئێمە زۆر کەم یادەوری و بیرەوەری لامان دەمێنێتەوە، وەکو ماسی واین لەبیرمان دەچیتەوە، بەڵام کە چووینەوە سەری خوای گەورە توانایەکی پێداوین شتەکانمان گشتی بیر دەکەوێتەوە وەکو خۆی، ئێمە بەدوای مێژووەوە نین، ئێوە بەدوای مێژووەوەن لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن، لەم دواییانەدا فێربووین مێژووی خۆمان

بنوسینەوە لای ئێوەی مرۆڤ، چونکە هەڵدەگیرێت لاتان لای ئێمە هەڵناگیرێت.
ماکوان: ئێوە چەندین ساڵی خۆتان نازانن، مەگەر یاداشتی ناکەن؟
ڤاورن: نەخێر؛ ئێمە ئەوە ناکەین لە ئێستادا، بەڵام بەبێ ئەوەی تۆ بەخۆت بزانیت ئەوە بۆ ئێمە دەکەیت!
ماکوان: زۆر ڕاستە، کەواتە من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم، ئێستا زانیم بۆ هاوکاری من دەکەن. دانیشتن لەگەڵ تۆدا فێری زۆر شتی کردم سوپاس بۆ هێمنی و لەسەرخۆییت و کەسایەتیە جوانەکەشت، بەڵام هەیە بە پێچەوانەی منەوە بنوسێت بۆ جنۆکە شەیتانەکان؟
ڤاورن: بەڵێ هەیە، بەڵام کێشە لە مرۆڤەکاندا هەیە کە تەرەفی ئەو جنۆکە شەیتانانەن، ناوێرن وەکو تۆ خۆی ئاشکرا بکات بنوسێت، ئەگەر بیشنووسن هەمووی درۆ و دەلەسە و طلیسم دەنوسن بۆ ئەوەی خەڵکی سەرگەردان بکەن.
ماکوان: مەبەستت ساحیرەکانە، ئەوانیش دەردەکەون لە تیڤی و کەناڵەکانەوە سیحر دەکەن خۆیان نمایش دەکەن.
ڤاورن: پێوا مەکە ئەوانە ساحیربن کە دەردەکەون، ساحیر مەرجی ئەوەی لەگەڵ دەکرێت نابێت دەرکەون، خۆ شەیتانەکان یەکجار ئەوەندە گەمژە نین دەستی خۆیان ئاشکرا بکەن، ناهێڵن ساحیرەکان دەرکەون مەگەر بۆ کەسانێك کە بزانن زوو هەڵدەخڵەتێن.
ماکوان: ئەی ئەوانە چین لەو شوێنانەوە دەردەکەون شتی سەیر و سەمەرە دەکەن؟
ڤاورن: ئەوانە هونەر و چاوبەستی لەخەڵکی و خێرای دەست و ئەوکارانەیە دەیکەن، هیچ پەیوەندی نیە بە جادوو، بەشێکیشیان هەر جادووە و سیحرە، وەکو ئافرەتە سەماکەرەکان خۆیان داوا دەکەن لە ساحیرەکان کە جنۆکە شەیتانەکان بچنە لاشەیان درەنگتر ماندوو دەبن و لەرزینی لاشەیان بەهێزتر دەبێت کە خۆیان دەلەرزێنن، بۆ وروژاندنی هەستی مرۆڤە پیاوەکان پارەی پێ پەیدا دەکەن، هەرشتێکیش تاوان بێت ئەوان هاوکاری مرۆڤ دەکەن.
ماکوان: ئەی من بۆ قاچم ئاوای لێهات و ئەوەندە ماندوو بووم، قاچەکانم لەدەست دابوو، تا بە کەرەمی خوای گەورە و پاشان دەرمانی جەنابت توانیم باش بم؟
ڤاورن: لەبەر پەروانە، لە سەر شێوەی مرۆڤ هاتە لات و هێزەکەت تواندبووەوە لەناو ماددەکەدا، توانیت وزەکەش بەدەستی ماددی خۆت بگریت و هەرچی توانا و هێزی ئەو بوو لەخۆتا بەرجەستەی بکەیت و ئەوت وێران کرد، هەموو وزەکەیت برد بۆ خۆت، ئەویش توانای خۆ دەرباز کردنی نەبوو، ئەو وزەیەی ئەو هەیبوو لە شێوەی کارۆموگناتیسیدا بوو، تۆش ماددەکانی کالیسۆم و پۆتاسیۆم ئەو توخمانەی کە لەخاك و خۆڵدا هەیە، هەمووی لاواز کرد و شیتەڵی کرد بەهێز و وزەکەی ئەو ڕاتکێشا بۆ خۆت، ئەوەش زۆر بە

دەگمەن ڕوودەدات، بەڵام فەزڵی خوا بەسەر تۆوە بوو توانیت بەسەریدا زاڵبیت و وات لێكرد بۆ پشتاو پشتی ئاقڵ بێت، ئیتر لەو حاڵەتەدا وزەكەی ئەوان لە جێگایەكدا كۆدەبێتەوە، چارەسەریشی نییە مەگەر تەنها خوای پەروەردگار، پاشان لای خۆمان نەبێت، سوپاس بۆ خوا توانیمان تۆ باش بكەینەوە بە فەزڵی خوا. كەواتە كورت و پوخت بۆ ئەوەی تێبگەیت كاری وزە كارەبەییەكەی ئێمەی جنۆكە بوو لە لاشەتدا، ئەو هێزەش تەنها بۆ دڵ باشە، بەڵام دەبێت بزانی چاو لاواز دەكات، هەوڵ بدە كە گەڕایتەوە چاویلكەیەكی باش بكڕە و پشكنینێك بكە بۆ چاوت، بەڵام دڵنیابە بۆ چەوری خوێن و دڵ و چەوری جگەر زۆر باشە و خەفەتی ناوێت، بەڵكو نیعمەتێكی خودایە.

ماكوان: جا جەنابی ڤاورن، تۆ حەكیم و باشیت لە بواری مرۆڤ یان جنۆكە؟

ڤاورن: دەی خۆ ئەوەشی فێربووم، بەشی زۆری لە ئێوەوە وەرمگرتووە زاناكانی ئێوە بەڕاستی نمونەن.

ماكوان: كۆتا پرسیار، ماندووت ناكەم حەز دەكەم ببمە هاوڕێت، بۆ زانیاریت حەزم بە هاوڕێی جنۆكە نەبووە و داواشم لەكەس نەكردووە، بەس داوا لە تۆ دەكەم ببینە هاوڕێ و برا، هیوام وایە داواكەم ڕەتنەكەیتەوە، زۆر سەرسامم بەو كەسایەتیەی هەڵتگرتووە و كێیە؟

ڤاورن: من خۆشحاڵ دەبم، بەس پڕوا ناكەم بتوانین، ناشمەوێت خەفەت بخۆیت. ئەم كەسایەتیەی كە تۆ دەیبینیت ئەمە ناوی زانایەكی گەورەی خوزستانیە و پیاوێكی زۆر بەڕێزو نەجیبە.

ماكوان: واتا ئێوە ناتوانن بۆ خۆتان شێوەی مرۆڤ دروست بكەن؟

ڤاورن: نەخێر؛ ئەوە كاری خوای پەروەردگارە لە دەستی هیچ مەخلوقێكدا نیە.

ماكوان: چۆن؟ وەڵڵا لە مەملەكەتی ئێمەی مرۆڤ وێنە و بوك و شتی وا دروست دەكەن و هیچ جیاوازی ناكەیت لەگەڵ مرۆڤەكاندا.

ڤارون: بەڵێ ڕاست دەكەیت، مەبەستم ئەوەیە ئەوەی كە ئێمە هەڵمانگرتووە مرۆڤە، ئێوە ناتوانن مرۆڤ و دەمچاوی مرۆڤ بەڕاستی دروست بكەن، ئەوەی ئێمە ڕاستیە، بەڵام شێوە و شكڵەكەیمان كردۆتە قاڵب بۆ وزەكانمان.

ماكوان: چۆن دەتوانن؟

ڤارون: ئەویش جۆرێكە لەو بەهرەیەی خوای گەورە بەخشیویەتی بە ئێمە، بەڵام لێرەوە دەتوانیت یەك شت فێر بیت، كە ڕوخسار و لاشەی هیچ كەس نافەوتێت و خوای گەورە لە قیامەتەدا هەمووی وەكو خۆی زیندوو دەكات بە لاشە و بە هەمان سیماوە ئەوەش بەشێكە لە دونیای غەیبیات، چونكە مەرج نیە هەموو شتێك بزانین لەم ژینەماندا، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە كە هەموو لاشە و سیما و توانای مرۆڤەكان لە ماددەوە دەبنەوە بە وزە، بە هەمان شێوە ئەویش ڕۆح ئاراستەی دەكات و دەیهێڵێتەوە شێوە و سیماكەی، بەڵام ماددەكەی دەفەوتێت تا لە قیامەتدا بارانێكی وەكو تۆوی پیاو دەبارێت

لەگەڵ عەجم كە لەپشتی ئێوەی مرۆڤدا هەیە تێكەڵ دەبێت و سەرلەنوێ دی ئێن ئەیەكانتان چالاك دەبنەوە، هەموو كۆدەكانیان دەكەوێتەوە كاركردن و دەست دەكەنەوە بە دروستكردنی ئەندامەكانی لاشە بە شێوەیەكی زۆر خێرا هۆكاری خێراییەكەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە پێشتر وجود و كۆد و شفرەكان هەبووە، ئەم سەرلەنوێ كۆپی دەكاتەوە نەك دروستی بكاتەوە بۆیە لەماوەیەكی كەمدا توانای دروستككردنی دەبێتەوە.
سەسیل: ماكوان تەلەفۆنەكەت زۆر لێئەدات و كەسوكارت بەشوێنتا دەگەڕێن، تۆ وتت چەند كاتژمێرێكی تر دەگەڕێمەوە بۆ نەرویج، بەڵام ئاگاداری كاتت بە.
ماكوان: جا چەندمان پێچووە؟
سەسیل: لای ئێمە كات ناڕوات، بەڵكو ئەوە خۆمانین دەڕۆین. لای ئێوەی مرۆڤ حساب بۆ كات دەكەن، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە كارێكی باشە.
ماكوان: ئەی لێرە بمێنمەوە چی دەبێت جارێ نەڕۆین؟
سەسیل: خۆت باشتر دەزانیت.
ڤاورن: دەتوانیت بمێنیتەوە بە سەدان ساڵ، بەڵام كۆتاییەكەی دەبێت بگەڕێیتەوە، چونكە دوای ئەوە كاتەكان لە تۆ ڕۆشتووە، خۆ ئەگەر نەگەڕێیتەوە ئەوا كەس و كارت هەمووی مردوون، تۆ ماویتەوە، ژیانت زۆر ناخۆش دەبێت وەكو یارانی ئەشكەوتت لێدێت، بە مەرگ ئاواتە خواز دەبیت، نازانی قەدەرت چی لێهاتووە.
ماكوان: تەواو تێگەیشتم، هەڵسە بمبەرەوە بۆ جێگای خۆم، دووركەوتینەوە لە جەماعەت و خەتێكی ترم كێشا بەدەوری خۆمدا، گەڕامەوە هەمان جێگا.

## گفتوگۆیەكی زانستی نێوان بەندە و حەزقیل و سەسیل

لەمەملەكەتی ئەوان گەڕامەوە حەزقیل و سەسیل لەگەڵمدا هاتن، ووتم لەگەڵمدا دێن؟
حەزقیل: بیرتە لەناو كەشتیەكە تەریقت كردمەوە باسی فیكری ئیسلامیم لێپرسیت وتت خەوم دێت؟
ماكوان: وابوو، ئەوە خۆ شێخ ڤاورن وتی زاكیرە و میمۆری مێشكتان لاوازە بەس تۆ هیچیت بیر ناچێت حەزەی برام.
حەزقیل: خۆ مانای وانیە هیچمان بیرنامێنێت، لەچاو ئێوەدا كەمتر هەڵدەگرین و منداڵیمان بیرنیە، یاخود چەندین ساڵ بەر لە ئێستا لەبیر دەكەین.
ماكوان: ئاساییە، حەزە گیان لەخزمەتام ئەمركە بەس با بچمەوە سەر خەتی خێرا و ئیتر مێشكم ساف دەبێت با ڕێگام لێ تێك نەچێت.
سەسیل "بە ڕابواردنەوە": بەخوا نازانی ئۆتۆمبێل لێخوڕیت.

ماکوان: تورە بووم، دە وەرە پیاو بەو تۆ لێیبخورە دەی سەسیلە سیلاوی، تۆ کە قسە دەکەیت من هەر خەیاڵم دەڕوات.
سەسیل"بەپێکەنینەوە": وەڵا من جنۆکەم و پیاویشم جا ئۆتۆمبێل چییە، فڕۆکەش لێدەخورم.
ماکوان: وەستام، دە وەرە لێخورە سیلاوی.
سەسیل: پڕۆ باشە، بەخوا بەجێت دێڵین ئەبێت خۆت تا نەرویج بەتەنها هەر تف قوت بدەیت بێکەس و هاوڕێ بڕۆیت.
بەوە ترساندمی کە ئۆتۆمبێل لێدەخورم بەتەنها زۆر ناخۆشە،خاڵی لاوازی منی دەزانی، قسەم نەکرد و وتم حەزە گیان قسەی خۆت بکە، لە خزمەت تۆ دام.
حەزقیل: دەمەوێت بزانم خوێندنەوەت چییە بۆ خوێندنەوەی مێژوو ڕەهەندەکانی چۆن دەبینی؟
ماکوان: من خوێندنەوەم بۆ مێژوو بە چەند ڕەهەندێك دەست پێدەکات، سەرەتا لەپێناسەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت و ڕەهەندەکانی پێ دەستنیشان دەکرێت.
مێژوو زانستی هەموو زانستەکانە، ڕاستە ئەم پێناسەیەم لە م. کەمال مەزهەرم وەرگرتووە، بەڵام پێش ئەو تەبەری هەمان وتەی فەرمووە بە عیبارەتێکی تر، ئیمامی شافعی دەفەرموێت: (هەرکەس شارەزا بوو لە مێژوو ئەقڵی بەرفراونتر دەبێت)[٦]. منیش بۆ خۆم وەك مەشخەڵێك دەیبینم بۆ ڕۆشنکردنەوەی داهاتوو.
ڕەهەندەکانی خوێندنەوەی من بۆ مێژوو
ڕەهەندی یەکەم: توراسی گەلانە و گەنجینەیەتی.
ڕەهەندی دووەم: پێوەری گەورە و پیاوانیەتی بۆ دروستکردنی شارستانیەتی و ڕۆشنبیری.
ڕەهەندی سێیەم: یادگار و ئەلبومی گەلانە و وەك شیعری لەبەرکراو وایە.
ڕەهەندی چوارەم: پەند و ئامۆژگاری لەسەر وەردەگیرێت و گەلانی لەسەر پەروەردە دەکرێت.
ڕەهەندی پێنجەم: ئەزموونی پیاوچاك و خراپەکارانی ئاشنا دەکەیت بە ئەزموونت.
ڕەهەندی شەشەم: مێژوو زانستێکی ڕابردووە سودی هەیە و پاڵپشتە بۆ ئێستا، باشترین ئەزموونیشە بۆ داهاتوو.
حەزقیل: چۆنیەتی هەڵسەنگاندنت بۆ خوێندنەوەی مێژوو؟
ماکوان: ئەم پرسیارەش هەر پێناسەی دەوێت، واتا کەیفیەت و چۆنیەتی خوێندنەوەی مێژوو. زانایانی مێژوو زۆر قسەیان لە سەر کردووە ئەوەی من پێیگەیشتوم و ئێستا بڕوام لەسەری دامەزراوە ئەوەیە کە چۆنیەتی

---

[٦] من عرف التاريخ زاد عقله

خوێندنەوەی مێژوو بۆ زانین و گۆڕانکاریە، واتا ئەگەر مێژووی گەلانێك نەتوانێت گۆڕانکاری لەناو گەلێکی نوێدا بکات ئیتر مێژوو زانستەکەی خۆی لەدەست دەدات، بەو مێژووە ناوترێت زانستی، هەر بۆیە دەڵێم مێژوو گەنجینەیە لەبەر ئەوەی ئەو ئالیەتی گۆڕانکاریە وای کردووە کە مێژوو کەیفیەتی خوێندنەوەی هەبێت، جیاوازتر لە هەموو زانستەکانی تر تایبەتمەندێتی هەیە.
باشە تۆ ئیشت چییە بەم پرسیارانە حەزەی برام؟
سەسیل"بەپێکەنینەوە": دەیەوێت ئەکادیمیای مێژوو بکاتەوە لە ناو ئێمە بۆ نایێت؟
ماکوان: من پرسیار لە حەزەی برام دەکەم، لە سیلاویەکی وەکو تۆی ناکەم.
حەزقیل: ڕاستیت دەوێت سەسیلی برامان ڕاست دەکات، دەمانەوێت لەو بوارانە خۆمان دەوڵەمەند بکەین و سوود لە تۆ وەرگرین.
ماکوان: ئەگەر جدیە لەخزمەتاندام.
حەزقیل: بەدڵنیاییەوە بەجدی قسە دەکەین، ئەی ئەم چۆنیەتیە لایەنی هەیە؟
ماکوان: بەڵێ بە دڵنیاییەوە ڕەهەندی زۆرە ئەگەر ڕەهەندی نەبێت دووبارە بە مێژوو ناوترێت زانست.
حەزقیل: ڕەهەندەکان چین؟
ماکوان: ئەگەر مۆڵەتم بدەن دەبێت هەندێك شیکاری بۆ ڕەهەندەکان بکەم.
حەزقیل: بفەرموون.
ماکوان: سوپاس!
یەکەم: خوێندنەوەیەکی هەمە لایەنە وەك عەرەب دەڵێت: شامل-ە
چۆنیەتی خوێندنەوەت بۆ هەر ڕووداوێکی مێژوویی دەبێت هەموولایەنەکانی تەماشا بکرێت، بۆ نموونە نابێت بە تەنها باسی عەباسیەکان بکەین کە بە خوێن ڕێژی هاتنە سەر حوکم، دەبێت ئەوە بزانین کە خەلیفەکانی ئەمەوی رەفتاریان چۆن بوو لە کۆتایی دەسەڵاتیاندا وە ناسینی بزوتنەوەی تاڵیبین و بزوتنەوەی عەباسی و کاریگەری نەوەکانی سامان و بوهەیئی، ئینجا دەتوانی دەستنیشانی هەموو لایەنەکان بکەین. کەواتە مێژوو لە بنەڕەتا دەبێت وا تەماشا بکرێت کە سیستەمەکانی کۆمەڵگای تێدا بەرجەستە بێت، وەك سیستەمەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری و...هتد.
دووەم: دوورکەوتنەوە لە جوانکردنی مێژوو.
بۆ نموونە من بۆ خۆم کە کەسێکی ئیسلامیم نابێت لەبەر ئەوەی کە من ئیسلامیم ئیتر بە ئارەزووی خۆم مێژووی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقفی جوان بکەم و مێژووی جیڤارا ڕسوا بکەم، محمدی کوری تومرت بە عەزیمول عوزەما ناوبەرم و مێژووی گەلانی تری دونیا بە هیچ و پوچ، لەبەر ئەوە پێویستی بە بێلایەنی هەیە تا بتوانی دەرئەنجامی باشت بۆ دروست بێت لە چۆنیەتی خوێنەوەت بۆ مێژوو.

سێیەم: دووركەوتنەوە لە ناشرین كردنی مێژوو.
 بەداخەوە ئەمە لەناو عەلمانی و نەتەوەیی و لیبراڵیەكاندا دەبینرێت، تەنها بۆ ئەوەی ئیسلام ناشرین بكەن بە ئارەزووی خۆیان درۆ هەڵدەبەستن و گومان بڵاودەكەنەوە، زۆر پێویستە لەو بوارەدا بابای مێژوو خوێنەر خۆی بپارێزت، چونكە لە كاتی شیكاری مێژوویدا زەرەری لێئەدات و میسداقیەتی خۆی لەدەست ئەدات لە نوسین و باسەكانیدا بەگشتی، واتا نابێت هیچ ئایدۆلۆژیەك كاریگەی لەسەر دروست بكات.

چوارەم: خۆ هەڵواسین بەكتێبی مێژووی كۆندا كە توانات بەسەریدا نەشكێت.
 ئێستا ئەم خاڵە زۆر دەیبینم كەلەناو خەڵكیدا باوە، سەرەتای مێژووی نیە خۆی ئالودە كردووە بە مێژووی ئیبنو كەسیرو (البداية والنهاية) ئیبنو ئەسیری جزیری(كامل فی التاريخ) ئیبنو جەریری تەبەری(تاريخ الرسل والأمم والملوك) رەحمەتی خوا لە هەموویان بێت، ئەمانە زۆر جار لە عەلمانیەكانیش دەبینم باسی ئەم مێژووانە دەكەن، مەبەستم هەندێك لە بێدینەكانی ئێوە و ئێمەش، نەك هەر دڵنیام یەقینی ١٠٠٪ م هەیە كە نەیانخوێندۆتەوە، لەوانەیە لە ماقالەیەكدا یان لە باسێكدا كەسێك باسی ئەم كەڵە پیاوانەی كردبێت، ئیتر دەڵێت لە مێژووی ئەم پیاوانەدا وانوسراوە بۆ خۆی ئەم مێژووانە هەموو دونیا سودی لێدەبینێت و سەرچاوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەریەك ئوسلوب و تایبەتمەندێتی هەیە، مێژووی طەبەری موعەن عەنە واتا سەنەدیە، مێژووی ئیبنو ئەسیر (دەوریە) بازنەییە، مێژووی ئیبنو كەسیرساڵە، كە هەریەكە بۆخۆی قسە و باسی ئەوەندە زۆر هەڵدەگرێت كە من زۆر جار بۆ خۆم بەدیاریەوە خەوم لێدەكەوێت، كەواتە ئەم جۆرە مێژووانە بۆ خەڵكانی خوێنەری مێژوو نابێت، باشتر وایە بگەڕێنەوە سەر مێژووی محمود شاكر، سەلابی، موسا شەریف، سەرجانی و...هتد.
پێنجەم: جیاوازی نێوان مەنهەجی مێژوو نوسانی ئێستاو كۆن
 زۆر گرنگە بزانرێت نێوانی مێژوونوسانی كۆن و نوێ چییە، ئەو كەسەی كە مێژووی كۆن دیراسە دەكات دەبێت شارەزابێت لە ئوسلوبی فەرمودەوانی ئیسلام، یاخود زانستی پیاوناسی بزانێت، كە پێ دەوتریت (علم الرجال) ئەمەش بۆ خۆی چەند بەشێكە.
 أ- ئوسلوب و تایبەتمەندیەتی مێژوو نوسەكە.
 ب- جۆری بەكارهێنانی ماددەی مێژوویی (السرد).
 ت- ڕەخنە و جۆریەتی نەقدەكان.

شەشەم: دووركەوتنەوە لە بواری بیروباوەڕی
 وەك نموونەی كێشەی نێوانی هاوەڵان رەزامەندی خوایان لێبێت، پێشینانمان فەرموویانە كە دەستمان نەبووە لە شتێكدا بۆ دەممان تێیدا

هەبێت، وەك خۆی باسی بکەین کۆتایی بە باسەکە بێنین کە مێژوونوسانی ناوچەکە و مێژوونوسانی سەردەمی خۆیان و پاشماوەکانیان چیان وتووە.
حەوتەم: ئاگادار بوون لە مێژووی نوێ.
مەبەستم زیاتر ڕووداوەکانی دوای هەڵسانەوەی ئەوروپا واتا ڕێنسانس تا کۆتایی سەدەی نۆزدە کە زۆر شتی لەسەر بینا دەکرێت.

هەشتەم: دوورکەوتنەوە و وازهێنان لە مێژوویەك کە باسی داهاتووی تێدا کراوە.
ئەمە زیاتر لە ناو ئاینەکانی تردا دەبینرێت تەنانەت لە ناو ئیسلامیشدا هەر هەیە بە نیشانەی قیامەت دێت، ئەمە لە زانستی مێژوویدا ئیعتیباری بۆ ناکرێت نەك خوانەخواستە پروامان پێی نەبێت، بەڵام مێژوو ناوەستنێت. فەرموودەی پێغەمبەرمان  هەیە لەسەر ئەوەی کە خەڵکی بەردەوامن لە کار و چالاکیان ئەگەر قیامەتیش بێت ئەو دارەی بەدەستەوەیە بیروێنە.[٧]
هیوادارم زۆر دوورم نەکردبێتەوە پروا بکە وەڵامەکان بەدڵی خۆم نیە، ئەگەر تێنگەیشتی زیاتر بۆت شی دەکەمەوە حەزە گیان.
حەزقیل: هەر زۆر باشە سودی باشم وەرگرت، کۆتا پرسیارم لەم تەوەرەیەدا دەڵێم لە مێژوونوسانی نوێی کورد کامیان سەرنجی ڕاکێشاوی؟
ماکوان: باوکی خۆم بە ڕەحمەت بێت، د. ئازاد گەرمیانی، نەوشیروان موستەفا، فازیل قەرەداغی، حەسەن محمود حەمەکەریم، جەمال نەبەز، هەرئەوەندەم لەبیرە ئێستا.
حەزقیل: باشە ئەکرێت بپرسم ئەدەب چییە؟
ماکوان: ئەمانەت بۆ چییە، ئەڵێی تاقیکردنەوەی من دەکەیت یاخۆت ئەتەوێت فێر بیت؟
حەزقیل: کاکە پرسیارە وەڵامم بدەرەوە ئەگەر دەیزانی، دەپرسم: ئەدەب لای ماکوان چۆن پێناسە دەکرێت؟
ماکوان: پێناسە بە دەست من نیە، ئەدەب بۆ خۆی زانستە حەزە گیان ئەویش پێناسەی بۆ کراوە، من ناتوانم شتێکی بۆ دابتاشم بە ئارەزووی خۆم، ناتوانم لە ئەدەبا لە ڕێبازی کافکاو و نەجیب مەحفوظ و شکسپیرو موعەلەقاتی عەرەب و لیل و مەجنون و شاکاری جوانی کوردان مەم و زین و حەمە دۆك و نوسینەکانی حریر و گەڕانی ئیبن وبەطوطە دەربچم، بەڵکو دێمە سەر هەمان پێناسە دەڵێم ئەدەب ئەو هەست و نەست و سۆزەیە کە مرۆڤ لەسەر پەری دڵی و هەستەکانی دەیگوازێتەوە بۆ سەر خامە و پەڕاو وای لێدەکات بە شاکارێکی جوان گوزارشت لە ئازارو خەم و ڕازو ویستەکانی خۆی بکات.

---

[٧] لە موسلیمدایە فەرمودەکە دەفەرموێت: (إذا قامت الساعة وفي يد أحدكم فسيلة فليغرسها).

حەزقیل: ئەگەر ئەمە پێناسەی ئەدەب بێت پێت وایە ئەدەب زانست بێت یان بەس هونەرە؟
ماكوان: ئەدەب زانستێكی زۆر موعتەبەرە و زۆربەی هونەرەكانی لەخۆدا كۆكردۆتەوە، بۆچی خەڵك دیراسەی ئەدەب دەكات؟
حەزقیل: نازانم!
بۆ ئەوەی جوانیەكانی مرۆڤ كە پەیوەستە بە فەلسەفە، فیكر، هەست، سۆز و وێنا هەموو ئەمانە ڕێك دەخات، بۆ نموونە ئەگەر وێنە كێشان بەهرەیەكی خوایی بێت، ٩٩ زانستی ترە پێویستی بەخوێندن و توێژینەوە هەیە، هونەر كارەكەیە نەك ئەدەبەكە، چونكە ئەدەبەكە زانستە بۆ خۆی ئاسەوارێكی فیكری، ئەخلاقی و رۆشنبیری لە ناخی مرۆڤدا بە جێ دەهێڵێت.
حەزقیل: لە ئەدەب دا یاخی بوون هەیە ؟
ماكوان: بەدڵنیاییەوە هەیە.
حەزقیل: هەرگیز یاخی بوویت؟
ماكوان: بەڵێ، بەڵام نەمتوانیووە بەخەڵكی بناسێنم كەس نەزانێت ئێوە دەزانن، ئەگەر من یاخی نەبم كی یاخیە حەزە، بەس ناوێرم.
حەزقیل: بۆ؟
لەبەر ئەوەی كاتێك كە چومەوە كوردستان خۆشەویستەكەم بە بەردەما تێپەڕی بە دوو منداڵەوە، ئەمە نموونەیە دەی وەرە بۆ ئەمە بنووسە بڵاوی بكەرەوە، هەندێك قورسی پێوە دیارە. لەسەرەتاوە دەبێت یاخی بیت لە یەكێتی و پارتی و بیانشۆیت ئینجا شۆڕبیتەوە بە فرمێسك و هەموو هەست و ئیحساسێكی خۆمدا، وا یاخیش بووم هیچ كاریگەری نابێت ئەوەی من دەمویست ڕۆیشت.
حەزقیل: ئەدەب دەكرێت بەچەند بەشەوە؟
ماكوان: جۆری ئەدەب زۆرە وەكو هۆنراوە، پەخشان (نثر)، چیرۆك، ئەدەبی كلاسیك(باسە فۆلكۆریەكان)، موزیك (مقامە) و مقالە ئێستا كورد پێی دەڵێت ڕاپۆرت، ئەمانە پێیاندەوترێت ئوسلوبی ئەدەبی، كەرەسەی ئەدەب بریتین لە ئەدا و نوسین و (ئیرتجال وعەفویەت)، شكڵی ئەدەبیش ئەمانەن: ڕۆمانسیەت، ملحمە، ڕیوایە، هەموو ئەم باسانەش مێژوو دەگێڕێتەوە بۆ هۆنراوە و پەخشان (شیعر ونثر) ئیتر لە دوایدا ئەو بەشانەیان لێ جیاكردۆتەوە. مەزهەبی ئەدەبمان هەیە وەك ئەدەبی سریالی و ئەدەبی ئیسلامی و ئەدەبی مۆدێرن (حداثە)...هتد.
حەزقل: مێژووی ئەدەب لە كوێوە سەرچاوەی گرتووە؟
ماكوان: دەڵێن سۆمەریەكان و میسریەكان، ئەوەی كە ئێستا لەبەردەستدایە وەك بەڵگە ئەو دووانەن.
حەزقیل: وشەی ئەدەب لە كوێوە سەرچاوەی گرتووە؟

ماكوان: ئەدەب فیكرە، ڕەوشتە، جوانیە، فەلسەفەیە، هێمنی یە، وشەكە لە بنەڕەتدا من وای دەبینم عەرەبی بێت، ئەم وشەیە بە كەسێك دەوترێت، كە تێڕوانینی بۆ خالق و گەردون و ژیان و مرۆڤ زۆر جوان و خواناسانە بێت، یاخود لە ناو عەرەبدا بە كەسێك دەوترێت كە دوور بێت لەهەموو هەڵەیەك لە زار و لاشەیی، كەسی هەڵگری ئەم ئەدەبە پێ دەوترێت: "ئەدیب" لە عەرەبیدا، ئەدەبیش بەگشتی لای من هونەری جوانیە بەمانای هزرڤان و هۆنەرو و ژیار.

حەزقیل: ئەدەبی ئیسلامی چییە؟

ماكوان: من خۆشم پروام بە پێناسەكەی سەید قوتب هەیە ڕەحمەتی خوای لێبت كە دەڵێت: ئەدەبی ئیسلامی مانای تێگەیشتن وپێگەیشتن و پربوونی نەفسە لە سۆزو ناسكی ئیسلام.

لە سەرەتایی كتێبەكەی ئیبنو حەجەردا دەڵێت: واتا ڕەوشت جوانی لە قەول و عەمەلدا، واتە ڕەوشت جوانی مانای ئەدەبە، وەستانە لەسەر شاكارە جوانەكان، ڕێزگرتنی سەرەوەی خۆت و حورمەتی خوارووی خۆت و باشی لەگەڵ خەڵكانی تردا.[٨]

حەزقیل: كۆتایی پرسیاری ئەم تەوەرەیەمان ئەوەیە، ماكوان و ئەدەب؟

ماكوان: من بۆ خۆم كەسێكی ئەدەبیم و دەنوسم لە بوارەكانی چیرۆك و هۆنراوە بەكەمی، بەڵام زیاتر لە بواری شیكاری فیكر و مێژوویدا قاڵ بوومەتەوە.

ئەوە چییە هەتیو ئەڵێی لە تەلەفزیۆنیت و ڕۆژنامەنوسیت چاوپێكەوتنم لەگەڵ دەكەیت.

حەزقیل"بەپێكەنینەوە": بەدڵنیاییەوە دەیناسینەوە و تۆش دەینوسیتەوە خەڵك زۆر سودی لێ دەبینێت، ئیمە تۆ دەناسین، ماكوان گیان.

سەسیل: ماكوان، پرسیارێك بكەم تورە نابیت؟

ماكوان: ئەگەر جدی بێت تورە نابم، بەس قسەی قۆڕ نەكەیت باشە؟

سەسیل: نا؛ دەڵێم مەزهەب چییە؟

ماكوان: مەزهەب واتای ئیجتیهاد كردنە لەسەر باسێك و خواستێك كە لە دیندا بوونی نییە واتا دەقی ڕاستەوخۆی لەسەر نەهاتووە بەڕاشكاوی.

بۆ نموونە چۆنیەتی دەست نوێژ گرتن یان نوێژ كردن یاخود ڕۆژوو گرتن و زەكات دان، ئەمانە هیچی پەیوەندی نییە بە مەزهەبەوە، بەڵكو ئەوە دینە و ڕاستەوخۆ لەپێغەمبەر  ەوە وەرمانگرتووە ئەویش لە جوبریل علیە السلام پاشان لەخوای موتەعال .

---

[٨] "وقال الحافظ ابن حجر في شرح البخاري: الادب استعمال ما يحمد قولا وفعلا، وعبر بعضهم عنه بانه الاخذ بمكارم الاخلاق، وقيل الوقوف مع المستحسنات، وقيل هو تعظيم من فوقك والرفق بمن دونك".

کەواتە مەزهەب لەسەر بنەمای بیرکردنەوە و دەرهێنانی ئەحکامە کە دەقی قورئان و سونەتی لەسەر نەهاتووە، دەقی ڕاشکاو هەبوو وەك دەڵێن: النص الصریح. ئەوە ئیجتیهاد و بیرکردنەوەی تێدا ناکرێت، بەڵکو لە باسێك و خواستێك دەکرێت کە دەقی ڕاشکاو و ڕاستەوخۆی لەسەر نەهاتبێ.
مەزهەبیش ڕاستەوخۆ دەبێت ناوی زاناکە لە پەنایدا هەبێت، بۆ ئەوەی ئەو ئەحکام و ئیجتیهادەی کردوویەتی یان فتوای داوە لەسەری دەبێت بزانرێت لەسەر چ بنەمایەکە، ئایا قورئان و سونەتە یان ئەحکامی مورسلە، یاخود عورفە یاخود ئیستبضاعة یان قیاسە ...هتد.
لێرەدا مەبەستم ئەوەیە هەندێك کەس باسی لەمەزهەبی سەلەف دەکەن کە بەهیچ شێوەیەك مەزهەبی سەلەف بوونی نییە، بەڵکو وشەیەکی بیدعەیە و داهێنراوە. ئەگەر بە کەسێك دەستنیشان کرا کە ئەوکەسە مەزهەبی سەلەفە واتا خۆی زانا و شارەزایە لەبوارەکانی زمانی عەرەبی و فەرموودەوانی و تەفسیرو ڕاڤە بەگشتی و لەزانستی أصول کە مەبەستم عەقیدەیە و زانستەکانی تر بە گشتی ئیجتیهادی کرد، ئەمە تەنها بەو کەسە دەتوانرێت بڵێن مەزهەبی سەلەفە لە ڕووی دروستی کارەکە، بەڵام لە ڕووی زمانەوانیەوە من بۆ خۆم ئیشکالی زۆری تێدا دەبینم، چونکە سەلەف مەرج نییە هەمووی باش بێت. لە ڕووی زاراوەی شەرعیەوە کێشەی نیە، چونکە سەلەف واتا ئەو سێ جیلەی دواى پێغەمبەری خوا . 
تێگەیشتی؟
سەسیل: نا؛ هیچ تێنەگەیشتم!
ماکوان: ملت شکێنە و پڕۆ دەی دابەزە، خۆم بۆ کێ ماندوو دەکەم و قسەی جدی بۆ دەکەم، سەسیل نەما هەر حەزە مایەوە، زۆرم نەمابوو بگەمە ماڵەوە ئەویش جێی هیشتم.

# لە نێوانی شەماڵ و بەهجەت دا و هەندێك باس لە دانیشتنێك دا

بەیانی بۆ بەرچایی گەشتمەوە ماڵەوە، کە خێزانم بینیمی وتی ئەوە لەکوێ بوویت؟ لەوە دەچێت لە شەڕ و جەبهەوە هاتبیتەوە ئەو هەموو ماندوو بوون و سەرچاو تێکچوونەت بۆ پێوە دیارە؟
ڕاستی دەکرد ماندوویەتی ڕێ و ئیسراحەت نەکردنم، ئەو ماوەیە کە مابوومەوە بۆنی عارەق چڵکنیم شەکەتی کردبووم، خێرا چووم خۆم شۆرد و

نانێكی باشم خوارد لێی خەوتم تا دەمەو عەسر، دواتر چووم بەرەو دوكان دەستم كرد بە كاركردن و ماوەیەكی زۆر پشووم دا بەخێزانم، ئەویش ماندوو بوو.
بەردەوام بووم لە كاری رۆژانە و ژیانم زۆر ئاسایی بووبووەوە، ئێوارەیەك دوكانم داخست پیاوێكی خزمی خۆم تێلی بۆ كردم ووتی تا ماڵی ئێمە وەرە ئیشم پێتە.
كە چووم  دەنگە دەنگێك كەوتبووە نێوانی كچەكەی و مێردی كچەكەی دەیانویست لەیەكتر جیاببنەوە، منیش كە چووم نەمهێشت ئەو جیابوونەوەیە ڕووبدات سوپاس بۆ خوا، لەسەر هەندێك پەیمان دان بەیەك ڕێكمخستنەوە.
خانەوادەی هەردوولا دانیشتبوون، یەكێك لە خانەوادەی ماڵی زاوا ناوی بەهجەت بوو دەستی كرد بەقسە كردن و ڕووی تێكردم و ووتی:
هەرچەندە من پروام بە ئاین و دین نیە، بەڵام كاریگەری پیاوانی ئاینی  زۆرە و لاشم سەیرە  كە ئیسلام ووردە ووردە بەرەو كۆتایی دەڕوات، كەسێكی زیرەكی وەكو كاك ماكوان هەر بەو شێوەی ١٤٠٠ ساڵە كار دەكات دەست خۆشیت لێدەكەم، بەڵام ئەو هەموو ماندوو بوون ئێنێرجیە بۆ لە خزمەتێكی تردا  بەكارناهێنیت؟
ماكوان: خۆی لە ڕاستیدا عەلمانیەت و بێدینی ئێوەی خومار كردووە لە بنەڕەتی خۆتانی لابردوون، خۆت دانت پێدانا تا كەسێكی دیندار نەهاتە ناو كێشەكە نەتانتوانی چارەسەری بكەن بە چاك، ئەوە گەورەیی من نیە، بەڵكو گەورەیی ئیسلامە.
بەهجەت: من ناڵێم وانیە، بەڵام ئیسلام باوی نەماوە عەلمانیەت جێگای گرتۆتەوە، ئەوە منیش و تۆش لە وڵاتی عیلمانین.
ماكوان: خۆ لە ژێر دەستی خەلیفەی ئیسلامی ڕامانەكردووە و وڵاتمان شەریعەت پیادە بكات، بەڵكو ئێمەش لە دەست عەلمانی ڕامانكرد، عەلمانی ئێرە دادپەروەرە عەلمانی ئەولا مشەخۆرو دز بوو. لەبەر ئیسلام نەهاتین ئەی ئەوانیش نەیان دەووت دیموكراسی و مافی مرۆڤ بۆ خەڵكی دەستەبەردەكەین، كارەباشیان بۆ دەستە بەر نەكرا دەزانی ئەوە عەلمانی بوو.
بەهجەت: كاكە عەلمانی ئەوندە ترسناك نیە.
ماكوان: چۆن ترسناك نیە! هەرچەندە من ناحەقی تۆ ناگرم، چونكە عەلمانیەكان چوار تاوانی گەورەیان ئەنجامداوە بەرانبەر بەخەڵكی موسوڵمان لەسەر خاك و زێدو مەڵبەندی خۆیاندا كە ئەوانیش:
تاوانی یەكەم: دروستكردنی موستەشریقەكان:
 موستەشریقەكان كۆمەڵێك زاناو لێكۆڵەرەوەی داخ لەدڵی ڕۆژئاوان، پیسترین و دڵ ڕەشترین خەڵكن، قورئان و سوننەت دەخوێنن و مێژووی ئیسلام و هەموو زانستەكانی ئیسلام وەردەگرن نەك بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن، نەخێر؛ بەڵكو بۆ ئەوەی تانە و تەشەرو تەزویری مێژوو و گومان دروست بكەن،

تەنها مێژوویەکی شێوێنراو و باسێکی سیاسی ڕووت بدەن بەخەڵکی موسوڵمان و بڵێن ئەوە مێژووەکەتانە، ئیتر زانست، زانیاری، میعمار، بینا، پیاوچاك، پیاوی دیندار و خواناس هەمووی ئەشارنەوە.
تاوانی دووەم: دروستکردنی گەرایی خۆیان لە ناو موسوڵمانناندا:
موعجیبیان دەکەن بەخۆیان واتا بە عەلمانیەتی ڕۆژئاوا سەرسامیان دەکەن، پاشان بەچکە موستەشریق دروست دەکەن تا کاری ئەوان بکەن لەناو ئەهلی ئیسلامدا و کە من ناوم ناون بەڕۆژئاواچیەکان! ئەمانە کاریان ئەوەیە وەك تووتی قەوان شتی ئەوان بڵێنەوە وەك زەڕنەقوتە دەمیان کردۆتەوە تا ڕۆژئاوا و موستەشریقەکان کرمی خۆیان بکەن بەدەمی ئەم زەڕنەقوتە عەلمانیانەی وڵاتی موسوڵمان.
تاوانی سێیەم: گەورە نیشاندانی ڕۆژئاوا:
تەنانەت هەموو شتێکی ڕۆژئاوا بە چاك و خراپیانەوە دەیانەوێت بگوازنەوە بۆ وڵاتی موسوڵمانان کە چاکەیان هەیە، بەڵام پۆخڵەواتیان خۆیانی بێزار کردووە کەچی عەلمانیەکانی وڵاتی موسوڵمان تەنها داوای پۆخڵەواتەکان دەکەن زیاتر.
تاوانی چوارەم: شێواندنی واقیعی وڵات و میللەتی موسوڵمان:
بۆ نموونە ئەوەی ڕیشی هەبێت و پابەند بێت بە ئیسلامەوە ناویان ناوە ئیرهابی، ئەوەی داوای شەریعەتی خوا بکات ناویان ناوە ڕجعی و دواکەوتوو، موحاجەبە بەدێو وە هەروەها...
لەڕاستیدا ئەگەر بمەوێت لەسەر ئەم چوار تاوانەی عەلمانی بدوێم زۆری دەوێت، گرنگ ئێوەیە بزانن ئەم چوار تاوانەی عەلمانی هۆکاری دواکەتووی وڵاتی ئێمەیە.
بەهجەت "بە پێکەنین و تانە و تەشەرەوە": دەی ئێوەی ئیسلامی بۆ چاکی ناکەن؟
ماکوان: دەمەوێت مژدەیەکت پێبڵێم ئەویش ئەوەیە خوای گەورە لە سوننەت و نەوامیس و ڕێسای کەونی خۆیدا وادایناوە، کەدەبێت دەسەڵات دەستا و دەست بکات.
تاکە ئاینێك لە سەر زەویدا دەمێنێتەوە لەناو ناچێت ئاینی ئیسلامە، لە هەندێك زەمەندا زەلیل دەبێت، بەڵام بە عیزەتەوە هەڵدەستێتەوە و لەهەندێك کاتدا دەکەوێت، بەڵام دوایی وەك شێر ڕادەپەڕێتەوە. ئەوەی گرنگە بیزانیت کە موسوڵمان و ئیسلام لەناو ناچن، ئەگەر لە ناو چوو ئیسلام نەما ئەوە زەویش کۆتایی پێدێت واتا قیامەتە.
چونکە هەموو گەلانی تر لەناوچوون نەماون بۆ نموونە...
- کوا شارستانیەتی ڕۆم؟ تەنها هەندێك پایە و بینا و ئاسەوارێکی ڕوخاوی داچەکاوی نەبێت هیچی نەماوە.
- کوا شارستانیەتی ئیغریق؟ تەنها کۆمەڵێك فەلسەفەی بەتاڵ و هەندێك مەعبەدی وێرانی وەثەنی نەبێت هیچی نەماوە.

- کوا شارستانیەتی فارس؟ کە لەدوای خۆی هیچ میراتیشی جێنەهێشتوە.
- کوا شارستانیەتی تەتار؟ کە هەموو دنیایی داگیر کرد، کوان چیان لێهات.
کوا شارستانیەتی فیرعەونەکان؟ کۆمەڵێك خاك و خۆڵ و بت و هەیکەل نەبێت چییان ماوە، فیرعەونەکان یان مۆمیا کراون یان لە ناو سکی خاکدا ڕاکشاون.
کوا ئیمپراتۆریەتی قەیصری ڕوسی؟ کە وجودی ئەرتۆدۆکسیشی نەماوە لەسەر زەویدا.
کوا دەسەڵاتی کۆمەنیزمی شورەوی و بەلشەفی کوا سوپای سوری؟ چیان لێهات، نابینن چۆن ئاوا بوون.
کوا ئیمپراتۆری گەورەی دنیا ئینگلیز کە دەوترا ڕۆژ لە ئیمپراتۆرەکەدا ئاوا نابێت، ئێستا زەلیل و حەقیر شوێن کەوتووی ئەمریکایە.
لەکۆتاییدا موسوڵمان سەربەرز بکەرەوە و فرمێسکی چاوت بسڕەوە سنگ دەرپەڕێنە خوای گەورە هەرگیز ئیسلام لەناو نابات، چونکە دەبێ شاهید بێت بەسەر هەموو گەلانی تری دنیاوە. ئەوە موعجیزەی ئیسلامە کە بەم نزیکانە دەسەڵات لە هەموو جیهان وەردەگرێتەوە.
بەهەجەت: بەڵگە چیە بۆ ئەم قسەیەی جەنابت مامۆستا ماکوان؟
ماکوان: بەڵگەم زۆرە.
- تەماشای مزگەوتەکان بکەن نەك لە کوردستان، بەڵکو لە هەموو جیهاندا ساڵی ١٩٦٠ تەنها پیاوە پیرەکان لە مزگەوتدا دەبینران ئێستا ئەوەی کە زۆر دەچێتە مزگەوت لاوەکان و منداڵەکانن.
- تەماشای ئافرەتانی باڵا پۆشی سەربەرز بکەن، جاران تا ساڵی ١٩٨٠ لە زانکۆیەك ئەگەر یەك ئافرەت موحاجەبە بووایە، بەڵام ئێستا لە تەلەفزیۆنی عەلمانیەکانیشەوە دەیانبین کە سوپاس بۆ خوا هەموو زانکۆکان پڕیەتی لە باڵاپۆشە سەربەرزکان.
- تەماشای پێشانگای نێودەوڵەتی کتێب بکەن زۆرترین فرۆش و ئەوەی ئیزدحامی لەسەرە تەنها کتێبی ئیسلامیە.
- تەماشای دەسەڵاتی عەلمانیەکان بکەن، ناوێرن بڵێن ئێمە عەلمانین ناچارن بە ئاشکرا دان بە مەرجەعیەتی ئیسلامدا بنێن.
- تەماشای ڕۆژئاوا بکەن شارو شارۆچکە نیە موسوڵمانان مزگەوتیان تێدا نەکردبێتەوە، ڕۆژ بەڕۆژ ڕێژەی موسوڵمانان زیاد دەکات.
- تەماشای ڕاگەیاندنەکان بکەن لە جیهاندا ناچارن مامەڵە لەگەڵ موسوڵماناندا بکەن بە هەموو شێوەیەك.
- تەماشای ئابووری و بۆرصەی جیهانی بکەن، بەشی بانکی ئیسلامی کراوەتەوە کە مامەڵە بە ڕیبا ناکات لە ڕۆژئاوادا.
ئەوانە هەمووی بەڵگەن.
بەهجەت: ببورە کاك ماکوان من دەبێت بڕۆم منداڵەکانم تەنهان، خۆشحاڵ بووم کە کۆتایی هات و هیوای ژیانێکی باش بۆ هەموو لایەکتان دەخوازم.

ئەو ڕۆشت  و ماڵئاواییمان کرد، یەکێکی تر لە خزمانی زاوا بەناوی شەماڵ کەوتە پرسیار کردن.
شەماڵ: کاك ماکوان پێتان ناخۆش نەبێت، ئاین لە سەردەمی ئیبراهیمەوە دەست پێدەکات.
ماکوان: چۆن؟
شەماڵ: من دەیسەلمێنم ئەوە نیە ئیبراهیم ئیسماعیل سەردەبرێت، کە ئێوە پێی دەڵێن باوکی پێغەمبەران.
ماکوان: لە کوێدا نوسراوە ئیسماعیل سەردەبڕێت؟
شەماڵ: قورئان.
ماکوان: کاك شەماڵ بەڕاستە؟ یان خۆت گێلەکەی  یان نایزانیت و مەبەستتە بڵێی ویستی سەریبڕێت؟
شەماڵ: مەبەستمە بڵێم ویستی سەربڕێت.
ماکوان: باشە کردی؟
شەماڵ: - نەخێر؛ بەڵام بە هەموو پێوەرێك ئەوە تاوانە چۆن باوك منداڵی خۆی سەر دەبڕێت؟
ماکوان: باشە کاك شەماڵ، پرسیارێکت لێدەکەم وەڵامم بدەرەوە، تۆش هەرچی پرسیارت کرد منیش وەڵامت ئەدەمەوە ڕازیت؟
شەماڵ: ڕازیم
ماکوان: کاك شەماڵ ئاخر وەعدی پیاو؟
شەماڵ: بەڵێ وەعد.
ماکوان: ئەگەر لەناو گەلێکدا وا باو بێت کە باوکێك دەبێت کوڕێکی خۆی سەربڕێت ئەگەر کەسێك بیەوێت ئەو کلتورە بگۆڕێت کارێکی خراپی کردووە؟
شەماڵ: نەخێر، کارێکی باشە.
ماکوان: کاك شەماڵ لەناو عەرەبدا وا باو بوو کە دەبوو کوڕێك لە کورەکانی خۆیان بکەنە قوربانی، تەنانەت تا سەردەمی پێغەمبەر  ئەمە هەر باو بووە لەناو قورەیشدا، بەڵام کورەکانیان دەکردە قوربانی دوایی لە جیاتی سەربڕینی کوڕەکەیان فیدەی ١٠٠ حوشتریان ئەدا، تەنانەت بەسەر باوکی پێغەمبەری ئێمەشدا هاتووە  کە ناوی عەبدوڵلایە کوری عەبدوڵموتەلیب بووە.
کەواتە ئیبراهیم پێغەمبەر - سەلامی خوای لێبێت- وەك پێشەنگ و قودوەیەك هەڵسا بەوکارە بە وەحی بۆ ئەوەی ئەو باوە جاهیلیە کۆتایی پێبهێنیت، چونکە پێغەمبەران بۆ گۆڕانکاری هاتوون ئەگەر ئەوان کاری فەساد و قێزەون چارەسەر نەکەن، ئەی کێ چارەسەری دەکات؟
کەواتە مەبەستەکە ئەوە نەبوو کە ئەو کورەکەی خۆی سەربڕێت، بەڵکو بۆ ئەوە بوو کە ئەو باوە بۆگەنە و خراپە لە ناو خەڵکیدا نەمێنیت و پێغەمبەرانیش بە گشتی خەڵکی چاویان لێدەکات.
ڕوونە، کاك شەماڵ؟

شەماڵ: بەڵێ دەست خۆش تێگەیشتم کاك ماکوان، سوپاس بۆ ڕوونکردنەوەکەت.
شەماڵ: کاك ماکوان ئەی نیکاحی جیهاد هەیە؟
ماکوان: شتی وام لە شەرعدا نەبیستووە.
شەماڵ: ئەی بۆ داعش دەیکات؟
ماکوان: دەی ڕۆ لە داعشێك پرسیار بکە من ئەوە نازانم.
شەماڵ: کاك ماکوان ئاساییە هەر پرسیارێکم بوو لێت بکەم؟
ماکوان: بەڵێ ئاسایە بەو مەرجەی کاتم هەبێت من لەخزمەتی موسوڵمانان و بە تایبەت ڕووبەڕووی مولحیدەکان دەبمەوە بە دەنگ و بە نوسین، بەوەندەی پێم بکرێت هیچی شاراوەیشم نیە.
شەماڵ: لە ئیسلامدا شیعر حەرامە، تۆ چۆن شیعر دەنوسیت؟
ماکوان: لەکوێدا نوسراوە شیعر حەڕامە؟
شەماڵ: سورەتی شوعەرا.
ماکوان : ئاخر وانیە، ئەمەشت هەڵەیە.
شەماڵ: ئەتوانی ڕوونیکەیتەوە و بیسەلمێنیت؟
ماکوان: شیعر واتای چیە؟
شەماڵ: شارەزا نیم زۆر، تۆ باسی بکە.
ماکوان: شیعر واتا بە کەمترین وشە زۆرترین مانا بدەیت بە دەستەوە، ئەمە پێناسەیە بۆ شیعر. هەرکەس موسوڵمان بوو پابەند بوو بە زانستە ئیسلامیەکان بۆ خۆی خەیاڵی زۆر فراوان دەبێت ئەتوانێت بە ئارەزووی خۆی لەو مەیدانەدا ئەسپی خەیاڵی هونەری تاو بدات.
خوای گەورە شاعیران بەوە باس دەکات کەسەر دەکەن بە هەموو دۆڵێکدا واتا سەرلێشێواون ئەگەر پابەند نەبن بە ئیسلامەوە، ئەمەش دەقی ئایەتەکەیە لە سورەتی شوعەرا.
وَالشيعراء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ ﴿٢٢٤﴾
سەرگەردان و سەرلێشێواوەکانیش شوێنی شاعیران دەکەون.
أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾
ئایا نابینی کە ئەوانە لە هەموو دۆڵێکدا سەرهەڵدەدەن و لەهەموو شتێك دەدوێن.
وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾
ئەوانە شتێك دەڵێن و بەکردەوە نایکەن (کردارو گوفتاریان دوورە لە یەکەوە).
إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾
جگە لەوانەیان کە باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن و یادی خوا زۆر دەکەن، (وە بەو توانایەی کە هەیانە)پشتیوانی لە ئیمانداران دەکەن کاتێك کە ستەمێکیان لێبکرێت واتا بە هونەرو ئەدەب

شیعر،سەرئەنجام ئەوانەی ستەمکارن دەزانن کە چۆن ژێرەو ژوور دەبن و تیادەچن.
ئەوە ئەو ئایەتەیە کە تۆ باسی دەکەیت و لێت نەزانی.
شەماڵ: بۆ شیعر لە ئیسلامدا گرنگە، لەبەر ئەوەیە من پێم وایە قورئان خۆی شیعرە.
ماکوان: ئێ وانیە، واقیعی ئیسلامی قسەکەی تۆ بەدرۆ دەخاتەوە.
شەماڵ: چۆن؟
ماکوان: ئەم ئیسلامە لەسەردەمی بازاڕی شیعردا هاتە خوارەوە شاعیران لەبەردەمیدا دەستەوسان بوون، دوو نموونە دەخەمە بەرچاو.
لەسەرەتای بانگەوازی مەککەدا خوای موتەعال ئایەتی دابەزاند لە سورەتی هود فەرمووی ئەگەر ڕاست دەکەن ١٠ سورەت وەك ئەم قورئانە بێنن، ڕۆژێك لە ڕۆژان قورەیش کە بازاڕو دوکانی وشەیان هەبوو بیریان لەوە نەکردەوە کە وەك قورئان بێنن، چونکە هەموویان دەستەوسان بوون لەبەردەمیدا تەنانەت بازاری "عوکاز" شاعیرەکانی خۆیان بە دەقەکانی قورئان سەرسام بووبوون.
دەقی ئایەتەکە دەفەرموێت:
أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٣﴾
(بێ باوەڕان) دەڵێن: (ئەم قورئانە) خۆی هەڵی بەستووە، پێیان بڵێ: دە ئێوەش دە سورەت وێنەی ئەم قورئانە بێنن وە هەرکەس لە خوای گەورە بەدەر، دەتوانن بانگی بکەن (بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر ڕاست دەکەن.
ڕۆژێك لە ڕۆژان خەڵکی شاری مەککە نەیانتوانی کۆببنەوە هاوشێوەی قورئان شتێك بنوسن.
هەروەها لەسەرەتای چوونی بۆ شاری مەدینە پێغەمبەری خوا  لەوێشدا ئایەتێکی هاوشێوەی ئەو ئایەتە لەسەرەتای سورەتی "البقرة" دابەزی، بەڵام لە مەدینە تەحەداکە بەهێزتربوو داوای لێکردن کە تەنها یەك سورەت بنوسن.
دەقی ئایەتەکە دەفەرموێت:
وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾
ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامان بەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد  ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.
موعجیزەکە لێرەدایە هیچ کاتێك بیریان لەوە نەکردەوە بڵێن وەرە محمد ئێمەش لەو وشە و بەلاغەت و نحو و ڕێکخستن و تەنانەت ماناو تێگەیشتنەوە هاوشێوەی قورئانمان لایە، بەڵکو سەرسام بوون. چونکە قورئان خاوەنی کەرەستەی وشە بوو، شیعریش هەر وشە جیاوازیەکە ئەوەیە کە قورئان وەحیە ئەوەی دەیخوێنیت و بەکاری دێنیتەوە وەك خەیاڵ دنیایەکی فەنتازیای شیعریە خەیاڵ فراوان دەکات، واقیعەکەش ئەوەندەی تر هەموو

لاکانی سەرسام کردبوو لە ئێستا و لەو سەردەمەشدا، چونکە هەموو چیرۆك و مێژووی بەنی ئیسرائیل بۆ نموونە لە مەککە هاتووە، بێجگە ئەحکام ئەهلی کیتاب زیاتر لە مەدینە دابەزیووە، بەڵام ئەوەی مێژووی بەنی ئیسرائیل و تەنانەت مێژووی گەلانی ترە زۆربەی لە مەککە دابەزیوە، موعجیزەکە لێرەدایە لەناو شاری مەککەدا یەك تاکە ماڵ مەسیحی و یەهودی تێدا نەژیاوە، بۆیە جولەکەکانی خەیبەرو و ناوچەکانی تر سەرسام بوون هەروەها مەسیحیەکانی نەجرانیش هەر سەرسام بوون بە باس و زانیاریەکانی ناو قورئان، ئەو زانیاریانەشی قورئان ئەیدا بە خەڵکی بە گشتی تەنها زاناو ڕاهیب و کەسە دیارەکانی ئەو گەل و هۆزانە دەیانزانی، کەواتە قورئان بە هەموو پێوەرێك موعجیزە بوو، بۆیە نەیانتوانی ڕووبەڕووی بوەستنەوە.
قورئانیش هاتە ناو ئەو گەلە دواکەوتووە بە خێرایی هەموویانی گۆڕی بۆ باشترین خەڵك ئەویش موعجیزەیەکی تر بوو، چونکە ئەو ناوچەیە لە جەهالەت دا دەژیان، بەڵام دوایی کە قورئان بووە مەنهەج و دینیان ئیتر وڵات لە دوای وڵات فەتحیان دەکرد. ئەمان ڕەوشت و دادپەروەری و بیروباوەڕیان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرد، ئەمە نهێنیەکی گەورەیە کە دەمەوێت ئەو نهێنیە بۆ ئێوەی بەڕێز ئاشکرا بکەم.
شەماڵ: کات درەنگە دەبێت بڕۆم.
ماکوان: فەرموو کاك شەماڵ.
لەدوایدا منیش هەڵسام بەرەو ماڵەوە هاتمەوە چوومە ناو ئۆتۆمبێلەکەم حەزقیل و سەسیل و شێخ برقان دانیشتبوون.

## لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتایەکی پڕ وەیشومە

لە هەڵسانم لە ناو مەجلیسەکەدا بەڕێ کەوتم بەرەو ماڵەوە لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا هەر سێك لە شێخ برقان و کاکە حەزەو سەسیل دانیشتبوون.
ماکوان: السلام علیکم دیمانەتان بەخێر، ئەوە ماوەیەکی زۆرە دیار نین؟
شێخ برقان: وعلیکم السلام ماکوان شتێکی زۆر ترسناك ڕوویداوە.
ماکوان: خێر چی بووە یاشێخ، ڤاورن مردووە؟
شێخ برقان: پەروانە مرد!
ماکوان: جا هەردوو چاوی دەرێ سوپاس بۆ خوای گەورە کە مرد.

شیخ برقان: ئاخر لەدوای ئەوەی تۆ پەلامارتدا مرد و بەو ئازارەوە کۆتای بە ژیانی هات.
ماکوان: ئەمەش هەر سوپاسی خوای دەوێت الحمد الله که ئەو سەگەم کوشت، کێشە چییە؟! ئەزانی چی بەسەر مندا هێنا ئەو هیچ و پوچە موستحەقە ئەگەر زیندوو بێتەوە جارێکی تریش دەیکوژمەوە.
حەزقیل: ئاخر ئەیانەوێت تۆڵەت لێبکەنەوە، ئازارت بدەن.
ماکوان: ژیان بە دەست خوای پەروەردگارە، چیان لەدەست دێت با درێغی نەکەن. من خوام هەیە ئەوان شەیتان، جا بابزانم کاممان بەهێزین.
شێخ برقان: ئەم قسەیەی تۆ ڕاستە و تەواوە، بەڵام گرنگە هەرگیز لایەنی خوای گەورە بەرنەدەیت و ئەوانیش لە کەمیندان بۆت، ئاگادارمان کردیتەوە و خوای گەوەرەش ئاگاداری هەمووانە.
ماکوان: ئەی باشە ویرسان نەیووت من کۆتایی دێنم بە هێرش و پلانەکانم دژتان؟
سەسیل: با وابوو، بەڵام کەسێکی تر بەناوی (وەرماش) خۆی ئامادە کردووە مەلەفی تۆی وەرگرتووە لە ویرسان و ویرسان پەیمانی خۆی دەباتە سەر.
ماکوان : وامزانی هەر فرتوفێڵ لەناو ئێمەی مرۆڤ هەیە، ئێ ئەوە چییە ئەو بەڵێن دەدات و پاشان یەکێکی تر بەڵێنەکە دەشکێنێت، وەکو حزبە عەلمانیەکانی لای خۆمان دێتە بەرچاوم.
سەسیل: ئیتر ژیانە و ئاوایە، ئاگاداری خۆت بە.
ماکوان: جا ئەم تەڕەماشە ناوی وەرماش-ە بەهێزترە لە ویرسان؟
سەسیل: هەر وەکو یەکن لەپلەو پایەدا، بەڵام ویرسان هێمنتر بوو، ئەم زۆر خێراو بێ ڕەحمە.
ماکوان: چییە سەسیلی برام ئەمترسێنیت؟
سەسیل: نەبەخوا، تەنها ڕاستیەکەت بۆ باس دەکەم. خوای گەورە پشت و پەنای هەمووانە، پاشان دڵنیابە ئێمەش پشتت بەرنادەین.
شێخ برقان: تاکە چارەسەرێکی بنەڕەتی بۆ دوورخستنەوەی شەیتانەکان لە خۆمان، ئەوەیە خاوەنی تەوحید و بە تەواوەتی یەکتاپەرستی خوای پەروەردگار ڕابگرین و ڕەچاوی وەحدانیەتی خوای پەروەدگار بکەین لە هەموو بوارەکانی ژیانمان دا توشی شیرك نەبین، چونکە ئەوان بە شیرك کردنیان درزو کەلێنی گەورە گەورە دەکەنە ناو ئیمانداران بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن.
سەسیل: توحید چییە، چەند جار ویستومە ئەو پرسیارە بکەم، دەزانم خوا تاك و تەنهایە، بەڵام دەمەوێت لە زانستەکە تێبگەم؟
شێخ برقان: تەوحید بریتیە لە:
یەکەم: یەکتاپەرستی لە خوایەتی و هەموو جۆرە بەندایەتیەکانی، هەر لە نوێژو زیکرو حەج و ڕۆژ و تا خوێندنی قورئان وسەربڕین و قوربانی کردن، هەموو ئەمانە پاداشت و سزای لەسەر دیاری کراوە لە دونیاداو لە قیامەتیشدا، بۆنموونە ئەوەی نوێژ نەکات لە یاسای ئیسلامدا سزا دەدرێت،

یان ئەوەی زەكات نەدات بە هەمان شێوە سزا دەدرێت لە دونیادا، وەك ئەبوبكر خەلیفەی موسوڵمانان -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت – كردی و لە مێژوودا بە جەنگی هەڵگەڕاوەكان ناسراوە، كەواتە ئەمە بۆیە سزای بۆدانراوە دەبێت سەروەری بپارێزرێت.
دووەم: یەكتاپەرستی لە پەروەردگاریەتی خوای موتەعالدا، هیچ كەس ناتوانێت لابدات لەوەی كە ئەم گەردوونە خوای گەورە و كارساز دروستی كردووە و بونیادی ناوە بە جوانترین شێوە، ئەوەی هاوبەش بۆ خوای گەورە دابنێت لە ناو ئاینی ئیسلامدا سزا دەدرێت و هەروەك چۆن حەلاج سزدارا و پێی وابوو خوا دەتوێتەوە لەگەڵ مرۆڤەكاندا، یاخود هەندێك لە سۆفی و شیعەكان پێیان وایە پیاوچاكان شتیان بەدەستە خوای گەورە داویەتی بە دەست ئەوان و وەكیلن بۆ خوا  كە پەنا دەگرم بە خوای موتەعال لەو جۆرە گوفتارە شیركیانە، زۆرێكیش لەوان لەسەردەمی یوسف كوری تاشفین و ئەبو منصوری موحیدی سزاو حەدی لەسەر دانراوە، چونكە لەسەردەمی سەلەف موسوڵمانان زۆر بەكەمی توشی ئەم جۆرە شیركیاتانە دەبوونەوە، تا ئەوكاتەی تەرجومەی فەلسەفەی یۆنانی و بیروبۆچونەكانی مەجوسی هاتە ناو موسوڵمانان لەسەردەمی دوای هارونە ڕەشید - ڕەحمەتی خوا لە هەموو ئەو پیاو چاكانە بێت-، لەسەردەمی مەئمونەوە دەستی پێكرد ئەمەش بەدرێژایی مێژوو موسوڵمانان باسیان لەم چەمكە هەڵانە كردووە بۆ ڕاستكردنەوەی تێگەیشتنەكان و پاراستنی شەریعەتی خوای گەورە، چونكە ئەگەر سەروەری توحید و بیروباوەڕ نەبێت ئەم ئیسلامە هیچ بەندایەتی و كارێكی تێدا دروست نیە، هەروەك چۆن كە مرۆڤێك موسوڵمان دەبێت سەرەتا پێی ناڵێیت نوێژ بكە یان ڕۆژوو بگرە یان حەج بكە، بەڵكو دەڵێیت: شایەتومان بێنەوە بە توحید دێتە ناو ئیسلام، بەهیچ شێوەك لە ئیسلامدا دروست نیە نیو بەندایەتی بۆ خودا دەبێت هەرچی كارە بۆ خوابێت، چونكە لە بەندە وەرناگیرێت ئەگەر هەمووی بەشی خوا نەبێت، كەواتە سەروەری ئەم چەمكەش هەر پارێزراو بووە بە درێژایی مێژوو ئیسلام كە موجەدید لە دوای موجەدید پاراستویەتی.
سێیەم: ناو سیفاتە پیرۆزەكانی خوای موتەعالە، دەبێت سەروەری ناو سیفەتەكانی خوا بپارێزرێت ئەگەر موسوڵمان قەناعەت و بیرو ڕوای وایە خوا دەپرستێت و خوا هەیە.
ئاخر ناشێت خوای گەورە سیفاتی حاكم بێت، بڵێن ئاساییە ئێمەش هاوكاری دەبین لەحاكمیەتدا، پەنا بە خوای گەورە، خوای موتەعال هاوكاری ناوێت یان لە خوای گەورە كەم بكەینەوە بڵێین ئەو نازانێت یاسا بۆ مرۆڤ و جنۆكەكان دابنێت ئێمە خۆمان دایدەنێین، ئەمە كەی پاراستنی سەروەری سیفات و ناوە پیرۆزەكانی خوایە، پێویستە ئەو سەروەریەش بپارێزرێت.
بەم سێ توحیدە حاكمیەتی خوای گەورە و شوێنكەوتنی پێغەمبەرەكەیمان  بۆ دەستەبەر دەبێت.

هەرچەندە ئەم پۆلێنکردنە "ئیبن تەیمییە" کردوویەتی پێشتر زانایانی بیروباوەڕ نەیانکردووە هەمووی هەر بە توحیدی خوای ناسراو بووە، بەڵام شێخولئیسلام بۆ زوو تێگەیشتن و ئاسانکاری بۆ کۆمەڵە سەرلێشیواوەکان ئاسانی کردووە.

ماکوان: دەستت خۆش یاشێخ گیان خوێندنەوەیەکی جوان و نایابت کرد، کردت بە بابۆڵەیەك بە ئاسانی لێتێبگەین.

شێخ برقان: گرنگە سەسیلیش تێگەیشتبێت.

سەسیل: بەڵێ تێگەیشتم و زۆر مەمنونم خوا پاداشتت بداتەوە، بەڵام ئەوەی هەموو جارێك باسی دەکەن کە دین بەزۆر بەسەر خەڵکیدا نادرێت واتای چییە، یان ئایەتی لا اکراه في دین مانای چییە؟

شێخ برقان: حەزدەکەم ماکوان وەڵامت بداتەوە..

**ماکوان**: لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾ البقرة

واتا: دینداری بە زۆر نابێ بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بە سەر کەسدا، چونکە ڕێبازی چاك و دروست و ئاشکرا بوەو (جیا بۆتەوە لە تولە ڕێگای) گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە (طاغوت) کە بریتیە لە هەموو ڕێگەو ڕێباز و هێز و بەرنامە و بت و لادانێك، وە باوەڕی دامەزراو بێنێت بە خوا، بێگومان ئەوە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارپییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هەڵناوەشیت و هەڵناتەکێت، وە هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە، (بە هەموو کردار و گوفتار و نیەت و نهێنی بەندەکانی).

کاتێك کە ئەم ئایەتە دابەزی موسوڵمانان لەوپەڕی دەسەڵات و هێزدا بوون، ئەعرابیەکان واتە عەرەبە دەشتەکیەکان منداڵەکانی خۆیان دەنارده لای جولەکەکان بۆ ئەوەی لە میدراسی ئەواندا فێری خوێندەواری بن، دوای ئەوەی کە دەگەڕانەوە بۆ ناو کەسوکاریان هەمووی بە جولەکەیی دەگەڕانەوە، دایك و باوکیشیان بۆ موسوڵمان بوونیان زۆریان لێ دەکردن خوای گەورەش ئایەتی دابەزاند و فەرمووی ئایین بەزۆر ناسەپێنرێت.

مانای ئەوەیە بیروباوەڕی خەڵکی بەزۆر ناگۆڕدرێت، ئەگەرچی ڕاستی و حەق لەگەڵ چەواشەکاری وباطل ئیسلام جیای کردۆتەوە، ئەمە گەورەیی ئیسلام دەگەیەنێت کە ترسی نیە لە ئازادی بیروباوەڕ، بەڵکو خەڵکیشی ئازاد کردووە بۆ کوفر کردن.

ئەوەتا خوای گەورە ڕێگای داوە بە جولەکە، مەسیحی و زەردەشتی وە لە قورئانیشدا ئەحکامی بۆ دیاری کردوون بە ئارەزووی خۆشیان کوفر دەکەن، کە دەڵێن عیسا کوڕی خوایە وە هەندێك لە جولەکەکانیش دەڵێن عوزێر کوڕی خوایە، وە زەردەشتیەکانیش پڕوایان بە فرە خوایی هەیە وەکو ئەهریمەن و ئاهورامازدا و زەراوەن.

ئیسلام لە ڕووی ئازادیەوە هیچ کەس لە قاڵب نادات و مافی کەسیش پێشێل ناکات، پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێکی مزگەوتەکەی دایە مەسیحیەکانی نەجران بۆ حەوانەوە و عیبادەتی خۆیان.
برادەرێکی قسەخۆش لێی تێك چووە وادەزانیت بیرو باوەڕ و مەشروب خواردنەوە وەکو یەك وایە، ئاخر داماو مەی خواردنەوە چ پەیوەندیەکەی هەیە بەسەر بیرو باوەڕ و ئازادیەوە.
لەساڵەکانی ١٩٦٠ ئەمەریکا بە ڕەسمی داوای کرد کە مەی قەدەغە بکرێت لەو وڵاتەدا بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، لەوڵاتێکی وەکو نەرویج لە هەندێك جێگاکان دا دەبێت لەسەر و ١٨ ساڵ بن تا مەی بکڕن وە هەندێك جێگاش هەیە دەبێت ٢٥ ساڵ بێت بۆ ئەوەی بتوانێت مەی قورس لە کحولەکەی بکڕێت، ئایا ئەمە پێشێلکردنی مافی تاکەکانە یاخود دەسەڵات دەیەوێت بیانپارێزێت.
ئەگەر کەسێك مەی بخواتەوە و شۆفێری بکات، ئایا ئەمە ئازادیە یان خۆکوشتنە؟
ئازادی عەقڵی دەوێت وە زەبتی دەوێت نەك بەرەڵڵای، ئەگەر ئازادی بەرەڵڵایی بێت کەواتە دەبێت ئازادی بۆ ئازادی داوا بکەین.
بەنسبەتی ئایەتی لا اكراه في الدين خیتابە بەرانبەر بە هەموو کافر و بێ باوەڕێك، ئەگەر کەسەکە بە ئاشکرا خواردیەوە و خەڵکی بەرەو ئەوە برد کە مەشروب بخۆنەوە و خۆشی بە سەرخۆشی دەرکەوت و تاوانەکەی ئاشکرا کرد، بانگەشەی بۆ بەد ڕەوشتی و مەی خواردنەوەکەی خۆی کرد بەدڵنیاییەوە جەڵدی لێ دەدرێت تا سێ جار ڕێگا پێدراوە، بەڵام ئەگەر هەر وازی نەهێنا ئەوا لەو کەسانەیە کە لە کۆمەڵگەدا زیادەیە و دەبێت پاك بکرێتەوە و بچێتەوە بۆلای خوای پەروەردگار.
بە دەیان هاوەڵمان هەبووە کە مەشروب خۆر بون (ڕەزامەندی خوایان لێ بیت) وەکو ئەبو میحجن السقفی، تەنها لەکاتی جیهادا ئاشکرا دەبوو کە مەشروبی دەخوارد، بەڵام لەبەر ئەوەی کە مەبەستی نەبوو کە ئاشکرا بێت چەندین جار جەڵدی لێدراوە، بەڵام مەبەستی نەبووە بانگەشەی بۆ بکات و خەڵکی بەرەو ئەو کارە ڕابکێشێت، موجاهیدیش بووە و هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، یاخود ئەو کەسەی کە لە ماڵەکەی خۆیدا مەشروبی دەخواردەوە و ئیمامی عومەر (ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت) چاودێری کرد و بەسەر دیواردا چووە ماڵەکەی، کەسە مەشروب خۆرەکە تانەی دا لەو کارەی و وتی من لەماڵی خۆمدا مەشروب دەخۆمەوە و ئازادم کەچی دەکەم لەماڵی خۆم، کارە خراپەکانی تۆش ئەوەیە کە جاسوسیت کردووە بەسەر منەوە، هەروەها بەبێ مۆڵەتیش هاتوویتە ماڵەکەم، بۆیە ئیمامی عومەر دەستبەجێ داوای لێبوردنی لێ کرد و چووە دەرەوە.
گەورەیی ئازادی لە بیروباوەڕ دایە.
سەسیل: دەست خۆش ڕوون بوویەوە بۆم.

شێخ برقان: ماکوان هەوڵبدە کەمتر بەتەنها بیت، لەهەموو حاڵەتەکاندا ئێمە و شەیتانەکانیش دەتوانین لە تەنهایدا بێینە لات، لە وجوودی خەڵکدا هەرگیز ناتوانین بێینە لات، بەتایبەتیش لە حزوری خەڵکی موسوڵماندا لەگەڵتا بێت ئەوا شەیتان و جنۆکە خراپەکان دوور دەکەونەوە.
ماکوان: ڕاستە یاشێخ، بەڵام خۆشت دەزانی تەنهایی زۆر جار پێویستە بۆ ئێمەو مانان، تەنانەت بۆ ساف کردنی مێشك و ئارامی دڵ و دەرونمان.
شێخ برقان: تەنهایی و خەڵوەت لەگەڵ خوای خۆت بۆ عیبادەت و بەندایەتیەکان هیچ کێشەی نیە، مەبەستم تەنهایی مرۆڤ زۆر جار بەرەو تاوان دەبات، خۆت ئەوە باش دەزانی وایە؟
ماکوان: ڕاستە، بەڵام من پروام بە قەزاو قەدەری خوایش هەیە.
حەزقیل: توخوا منیش دەمەوێت لەو قەزاو قەدەرە تێبگەم؟
ماکوان: هەموو موسوڵمانێك چیرۆکی پێغەمبەر موسا - سەلامی خوای لێبیت - لەگەڵ بەندەیەکی چاکە خواز کە ناسراوە لەناو کوردا بە خەیری زینە یاخود خدری زیندە لە دیندا ناسراوە بە خضر سەلامی خوا لەویش بێت دەزانن، تۆش دەزانی حەزە گیان؟
حەزقیل : ئەی چۆن نازانم، هەموو جومعەیەك دەیخوێنم.
ماکوان: باشە بارك الله فیکم خوا قوبوڵی بکات لێت، کەسێك لە موسای پرسی زیرەکترین مرۆڤی سەر زەوی کێیە؟
پێغەمبەر موسا فەرمووی: منم!
لەدواییدا خوای گەورە بە پێغەمبەر موسای فەرموو: لە تۆ زیرەکتر هەیە بەندەیەکە لە بەندە چاکەکانمان، خوای پەروەردگار لە جێگایەکدا مەوعیدی بۆ دانان کە یەکتری ببینن.
موسا و هاوکارەکەی کە ناوی یوشعی کوڕی نونە کەوتنە ڕێ و ئەو بەندە چاکە خوازەیان بینی.
بوونە هاوڕێ و کەوتنە ڕێ.
لە ڕێگادا خضر بەلەمێکی کونکرد لە کاتێکدا بە خۆڕایی هەڵیگرتبوون، پاشان زلەیەکی دا لە منداڵێك و کوشتی.
دوای ئەوە چوونە دێیەك کەس میوانداری نەکردن و نانیان نەدانێ، کەچی کەوتە قوڕ شێلان بە پێغەمبەر موسا سەلامی خوای لێبێت.
بۆ؟
حەزقیل: منیش دەڵێم بۆ؟
ماکوان: ویستی پێی بسەلمێنیت کە قەدەری خوای گەورە لەگەڵ یاساکانی گەردوندا یەکانگیرە.
بیری خستەوە بە کونکردنی بەلەمەکە کە تۆ لەناو تابوتێکدا ژیانت و چۆتە ماڵی فیرعەون، لەکاتێکدا یوکابدی دایکت و مەریمی خوشکت وایان دەزانی دەخنکێیت، عیمرانی باوکیشی ئەو شەوە لە سەرە حەرەسی بوو لە ماڵی فیرعەون.

پاشان زلەیەكت دا لە پیاوێك و كوشتت، ئەویش تەفسیری ئەوەت بۆ دەكات قەدەری ئەو منداڵە بەو ویستی خوای گەورە كۆتای هاتووە لەبەر چاكە خوازی دایك و باوكی، ئەگەر ئەو كابرایەی تر كە بەزلەیەك كوشتت بمایە فیتنەی زیاتری دروست دەكرد، پاشان چویتە مەدیەن و ئەو شێخە پێی ووتی كە پارێزراوی لە دەستی خراپەكاران، تۆ واتزانی خراپەتكردووە بە چاكە بۆت شكایەوە پلەی پێغەمبەرایەتیت بەدەست هێنا لەوێ.
ئەو دیوارەش كە هەڵیساندەوە پێت هەر قەدەری چاكە و باشەیە، موسا پێغەمبەر قەدەری چووە لای ئەو دوو ئافرەتەی كە ئاوی مەڕەكانی بۆ دان هەمان قەدەرە بۆ ئەو دوو منداڵە دیواری ماڵە ڕوخاوەكەی بۆ هەڵساندنەوە تا گەنجینەكەیان دەست كەوێتەوە.
كورت و پوخت ئەوە وەڵامی قەزاو قەدەری خوایە بۆ هەموو مرۆڤێك.
چونكە خوای گەورە خاوەنی سیستەمێكی بەدیعە، مرۆڤ هەرچی بەسەر بێت دڵنیابن لە چاكەیە و خوای گەورە زوڵم لەكەس ناكات، بەڵام كێشەكە لەوەدایە مرۆڤ پەی پێنابات بۆیە ئارامگرتن لەسەر قەزاو قەدەر خێرت دەست دەكەوێت.
كەواتە هەركات ناڕەحەتیت بەسەردا هات بزانە پەروەردگارت تۆی لەبیر نەكردووە.
شێخ برقان: دەستەكانت خۆش و دەمت و ئەقڵت پڕ بەرەكەت، لە قسە كردن و زانیاریەكانتدا ماكوان گیان، بارك الله فیكم.
گەشتیتە بەردەرگای ماڵەوەتان و ئیمەش دەڕۆین و تۆش ماندوویت ئاگات لە خۆت بێت، لە دوورەوە چاودێرین لەگەڵتا و خوای گەورە چاودێری هەموومانە و ئاگادارە.
ماكوان: ئەو تەڕەماشە ناوی چی بوو ناوەكەیم بیرچووەوە؟
شیخ برقان: وەرماش

كۆتایی پەرتوكی سێیەم و
دەستپێكی كتێبی چوارەم
ڕووداوەكان چڕ تر دەبێتەوە

لەكۆتاییدا:

لە دونیای ئەمڕۆدا بەتایبەت لە هەرێمی ئێمەدا کاری جادوو بازی لەپەنای جادووبازیشدا هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی کارێك و دیاردەیەکی بەرچاوە، بە دەیان بەرنامەی تەلەفزیۆنی لەسەر ئامادەکراوە، ئەم کارە ماڵی زۆر خەڵکی وێران کردووە. کۆمەڵێك ساحیری بەرچاو پەیدا بوون لە پیاوان و لە ژنان لە هەرێمی کوردستاندا خەریکی ئەو کارە قێزەونەن، کە لەدوای هاوبەش دانان بۆ خوای پەروەردگار گەورەترین تاوانە، حوکمەکەی لە ئیسلامدا کوشتنە و هەندێك دەڵێن: پاك بوونەوەشی نیە.

لەم پەرتوکەدا باسی جۆری جادوو پاشان بەتاڵ کردنەوەی بەشێکیمان کردووە، لە بەشی داهاتوودا بە پشتیوانی خوا زیاتر باسی دەکەینەوە، لەم دواییانەدا یاسایەکی نوێ سەبارەت بەو پرسە دەرچوو لە هەرێمی کوردستاندا کە لە ڕاستیدا کارێکی زۆر باش بوو، ئەو کەسانەی کە لە بواری جادووبازیدا کار دەکەن بە پیاو و ژنیانەوە خەڵکی بەدڕەوشتن و داوێن پیسن، مەرجی ساحیر و جادووباز ئەوەیە کە دەبێت داوێن پیس بێت و درۆزن و خراپەکار بێت، خودای گەورەش وای کردووە کە بەزووترین کات بناسرێنەوە لە ناو کۆمەڵگەدا، ئەگەر چی مەرجی ساحیر و جادووبازەکان کە لەگەڵ شەیتانەکان دەست دەکەن بەو کارە دەبیت نهێنی بێت، چونکە شەیتانیش ئەوەندە گەمژە نیە دەستی خۆی بۆ هەموو کەس ئاشکرا بکات.

هەر کەس ئەوکارە ئەنجام بدات و بیکات کافرە و لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە پەنا بەخوای گەورە، ئەگەر بە هەڵەش کردبووی و نەیزانیبوو، دەبێت تۆبەی لەسەر بکات و جارێکی تر شایەتومان بهێنێتەوە و بێتەوە ناو ئیسلام، چونکە لە ئیسلام و موسوڵمانیەتی دەرچووە.

هەموو سیحر و جادوێك بە دوو شێوەی سەرەکی دەکرێت، هەر شێوەیەکیش لەو دوو بەشە لقی تری لێدەبێتەوە، ئەویش نوسراو، کە چەند لقێکی لێدەبێتەوە، بە دەرمان و بەهارات و مۆم و بوغورد و خواردن و لەبەر کردنی جلوبەرگ سیحرەکە دەکرێت.

بەشی دووەم لەڕێگای جنۆکە و شەیتانەکانە کە دەست دەوەشێنن، یاخود دەچنە ناو لاشەی مرۆڤەکان و کاریگەری لەسەر مێشك و هەڵسوکەوتیان دروست دەکەن بەرەو ئاراستەی خراپ.

ئەگەر مرۆڤ خواناس و دەم بەزیکر و بەندایەتیەکانی بە باشی بکات، ئەوا بەدڵنیاییەوە بەهیچ جۆرە جادوو جنۆکە و شەیتانیش کاری لێناکات، چونکە تەرەفی خوای پەروەردگارە. هەرکەسیش تەرەفی خوای پەروەردگار بوو نە شەیتان دەتوانێت زەفەری پێ بەرێت نە سیحر و طلیسمەکانیش کاریان بۆ دەکرێت.

هۆکاری ئەم هەموو دەردو وەرهەمەی ناو جادووبازان دەگەڕێتەوە بۆ ناڕۆشنبیری خەڵکی موسوڵمان و ئاگا نەبوونیان لە ئاینەکەیان، بۆیە خەڵکی نەخوێندەوار دەتوانێت زەفەری پێ بەرێت، تەنانەت بە خەڵکی دانشمەند و

زانكۆ، تەنانەت پلە بەرزەكانی ناو كۆمەڵگەش. هۆكاری خوێندنەوەی سادەییانە بۆ ئیسلام و ئاگا نەبوونیانە لە ئاینی خوای پەروەردگار.
هەموو ئەو هۆكاری سیحر و جادووە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە نیعمەتەكانی خوای گەورە تێناگات و كوفری پێدەكات.
كوفری نیعمەت: ( كفران النعم )
مرۆڤ كاتێك خوای گەورە دروستیكردووە و پاش ئەوەی كە لەبەهەشتدا دەركرا بەهۆی درۆكردنی شەیتانەوە و قەدەری خوای گەورە وابوو كە بێتە سەر زەوی و ژیان لەسەر زەوی بەرێتە سەر، هەرچەندە كە وەك و سزایەك بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای تاك و تەنها هەموو شتێكی بۆ مرۆڤ ڕەخساندووە و لەزەویدا دایناوە تاوەكو بتوانێت سودی لێوەربگرێت بۆ ژیانی خۆی، نیعمەتەكانی خوای گەورە ببینێت و شوكرانەی لەسەربكات و ئەگەر شوكرانە بژێر بێت لەسەر نیعمەتەكانی خوا گەورە پاداشتی دەداتەوە بەباشتر و پاداشتەكەشی ئەوەیە كە خوای گەورە لێت ڕازی دەبێت و نیعمەتی بەهەشت دەكات بەخەڵاتی ئەو مرۆڤانەی كە شوكرانە بژێردەبن.
ئەگەر مرۆڤ شوكرانە بژێر نەبێت لەسەر نیعمەتەكانی خوای گەورە بێگومان سزا وەردەگرێت و مرۆڤیش وەكو فیترەتی خۆی خوادەناسێت و ڕوو لەخوایە، بەڵام زۆر هۆكار هەن كە پشت لەخوا دەكات و شوكرانە بژێرنابێت،
هۆكارەكانیش هەمووی هەڵەو تاوان و نەزانی مرۆڤە، خوای گەورە لە ئایەتێكی پیرۆزدا باسی دەكات و دەفەرموێت:
وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّا إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ الْإِنسَانُ كَفُورًا (٦٧)الإسراء
واتا : كاتێك كە مرۆڤ تەنگانە و ناخۆشیەكی بەسەردا دێت لەدەریادا ( كاتێك كە دەچێتە سەركەشتی وناودەریاوە و توشی شەپۆل و باوباران دێت ) تەنها ڕوو لەخوای تاك و تەنها دەكەن و دەپاڕێنەوە كە فریایانبكەوێت و ڕزگاریان بكات لەو تەنگانەیە و كاتێك ڕزگاریان دەبێت و دەگەن بە وشكانی خۆیان دەبن بە بەربەست لەبەردەم خۆیاندا بۆ بەردەوامبوونیان لە شوكرانەكردنی خوای گەورە و بێگومان مرۆڤ كوفری نیعمەتكارە، والله اعلم.
پاشان خوای پەروەردگار لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت : أَمْ أَمِنتُمْ أَنْ يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَى فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفاً مِنْ الرِّيحِ فَيُغْرِقَكُمْ بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لاَ تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِ تَبِيعاً (٦٩) الإسراء
واتا: ئایە دڵنیان لەوەی كە نەگەڕێنەوە بارودۆخێكی لەو جۆرەی كە پێشتر باسمانكرد ناڕەحەتی و ناخۆشیتان توش نەبێت، ئەو كاتە خوای گەورە توشی بایەكی توندتان بكات و نوقمبن لەناو دەریاكە و فریادڕەستان نەبێت بەهۆی ئەو كوفركردنەتانەوە كە شوكرانەی خوای گەورە و پاشان نیعمەتەكانی ناكەن؟
بێگومان مرۆڤ تا سەر لەخۆشیدا نابێت و هەموو كاتێش لە ناخۆشیدا ناژییێت، هەر بۆیە دەبێت لەكاتی خۆشیدا شوكرانە بژێربێت، تاوەكو لەكاتی ناخۆشیدا خوای گەورە بە هانایەوە بێت و فریادڕەس و ڕزگاركاربێت لە تەنگانە و ناخۆشی.

بۆیە خوای گەورە بەسەرهاتی قەومێکمان بۆ باس دەکات کاتێك لە خۆشیدابوون و ژیانیان پارێزراو بوو کە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندبووە سەریاندا و مەترسیان لەسەر نەبوو بەروبوومی دارودرەختی پێیان بەخشیبوو لە هەموو جۆرێك کە ئەوەی پێویستی ژیانیان بوو لەخاك و نیشتیمانی خۆیاندا لەبەردەستیان بۆیان ڕەخسێندرا بوو، کە خوای گەورە بۆیانی ڕەخساندبوو هەر وەکو لە ئایەتێکدا باسیان دەکات کە قەومی سبأ بون لە یەمەن، لەم ئایەتەشدا دەفەرموێت: (وَضَرَبَ اللهُ مَثَلا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللهِ فَأَذَاقَهَا اللهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ) (١١٢) النحل

خوای گەورە نموونەیەك باس دەکات خەڵکی گوندێك یان کۆمەڵگەیەکی جێنیشین کاتێك کە پارێزراوبوون و هیچ ترس و مەترسیان لەسەرنەبوو و دڵنەوابوون لەهەموو مەترسیەك، ڕزق و ڕۆزییان بۆ دەهاتە بەرهەم لە هەموو لایەکیانەوە بەدەوری خۆیاندا.

لێرەدا بە باشی دەزانم کەمێك ڕوونکردنەوەی ئەم باسە بکەین تاوەکو باشتر لێی تیبگەین: خەڵکی ئەم دێیە کە خوای گەورە باسی دەکات بۆمان و دەفەرموێت (يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِنْ كُلِّ مَكَانٍ ) مەبەست لەم ڕزق و ڕۆزیە ئەوەیە کە وەکو ئیبن کثیر لە تەفسیرەکەیدا باسی دەکات و دەفەرموێت، گوندێك بوون لە سبأ و لەسەر ڕووبارێك دەژیان کە چوار دەوریان دارودرەختی میوە بوو، بەردەوام بەهۆی شوێنەکەیانەوە و ڕووبارەکە دارودرەختەکانیان زۆر بەبەرهەمبوون و بەروبومیان زۆربوو کە سود و پێداویستی ژیانیان لێ وەردەگرت، بەڵام ئەم خەڵکە شوکرانەی خوایان نەدەکرد لەسەری بۆیە دەفەرموێت (فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللهِ ) کوفریان دەکرد بەو نیعمەتانەی خوای گەورە کە بۆیانی ڕەخساندبوو واتا شوکرانە بژێرنەبوون لەسەر نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار.

ئێمە وەکو باسمان کرد هەر کەسێك شوکرانە بژێربێت خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە و هەر کەسێکیش کوفری نیعمەتەکانی بکات سزای بۆ داناوە.

بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین لەپاداشت و سزادا هەردوو جۆرەکە خوای گەورە بۆی هەیە کە لەدونیادا پاداشت و سزاکە بداتەوە و بۆیشی هەیە کە دوایبخات بۆ قیامەت، هەروەها خۆی خاوەن بڕیار و توانا و دەسەڵاتە لەوانەیە لە هەردوو دونیادا بەجێی بهێنێت.

بەڵام نمونەی بەرچاومان هەیە کە زۆرینەی کوفرکردنی نیعمەت هەر لەدونیادا دەیهێنێتە دی و سزاکەی یان پاداشتەکەی دەردەکەوێت هەر بۆیە دەبێت زۆر ئاگاداری ئەوە بین کە توشی کوفری نیعمەت نەبین.

پاشان خوای گەورە باسەکەمان بۆ تەواو دەکات و سزای ئەو گوندەی چۆن داوە لەسەر ئەوەی کە کوفری نیعمەتیانکردووە، هەر وەکو لەسەرەتای ئایەتەکەوە باسی نیعمەتەکانی دەکات کە پێیانی بەخشیبوو لەگەڵ ئەو بەروبوم و میوە و خواردن و ئاوی سازگارەی بۆیانی ڕەخساندبوو پاشان

باسی نیعمەتێکی زۆر خۆشتر دەکات لەگەڵ ئەوەدا کە دەفەرموێت: (كَانَتْ آمِنَةً مُطْمَئِنَّةً ) ئەوان پارێزراو و دڵنەوابوون لەهەموو مەترسیەك، بەڕاستی نیعمەتێکی زۆر گەورەیە کە کۆمەڵێك لە شوێنێك بژین و ئارامی و ئاسایش لەناویاندا بەرقەرار بێت و مەترسییان لەسەر نەبێت.
بەڵام کاتێك کە کوفری نیعمەت دەکەن خوای گەورە چییان لێدەکات و سزاکەی چۆنە و چییان بەسەردێت؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ( فَأَذَاقَهَا اللهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ)
واتا: پێیانی چێژت لە بەرگی برسێتی پۆشی بەبەریاندا و لەهەمانکاتیشدا ترسی خستە ناویان بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد و ئەنجامیان دەدا.
تەماشا بکەین دوو نیعمەتی گەورەی پێیان بەخشیبوو کە خواردن وخواردنەوەی حەڵاڵ و ئاسیشی بێ مەترسی، بەڵام کاتێك کە قەدری عافیەت و ئەو نیعمەتانەیان نەگرت و نەزانی خوای گەورەش سزایدان بە دوو شتی پێچەوانەی ئەوەی کە هەیانبوو، ئەویش پۆشاك و برسێتی و نەهێشتنی ئەمن وئاسایش بوو لە نێوانیاندا کە دوو شتی زۆر ناخۆشە خوای گەورە لە مەترسی ئەو دوو شتە ناخۆشە بمانپارێزێت خۆمان وگەلەکەمان.
هەربۆیە وەکو تەواوکردنێکی ئەم باسە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: (لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَنْ يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِنْ رِزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ) (١٥) سبأ
واتا: لە ژیان و گوزەرانی خەڵکی سبأ نیشانەیەك هەبوو کە بە هەردوو تەنیشتی ڕوبارەکەدا باخ و باخاتێکی باش و بەروبوماوی هەبوو کە خوای گەورە پێیانی بەخشیبوو بۆ ئەوەی کە لەبەروبومەکەی بخۆن و شوکرانە بژێری خوای بەدیهێنەری ئەو نیعمەتانە بکەن کە بۆتانی بەدی هێناوە، شوێن و دانیشگایەکی ژیانی باش و خوایەکی لێبووردەتان هەیە، والله تعالی أعلم.
قال تعالی: وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٥٥) النور
واتا: خوا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بە ڕاستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دین و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی ڕازیە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامی و هێمنی، ئەو کاتە ئیتر بە تەواوی هەر من دەپەرستن و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەداریە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە تاوانبارو لە سنوور دەرچوون.

پاشان خوای گەورە مژدە دەدات بەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کاروکردەوەی چاك ئەنجام دەدەن کە دەفەرموێت: ( وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ) مژدەکەی چییە؟

ئەوەیە کە دەفەرموێت: ( لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى )

جێنیشینیان دەکات لە خاك و وڵاتی خۆیاندا هەروەکو قەوم وگەلانی پێشوتر جێنیشین بوونە و ئەو دینەی کە خوای گەورە بۆیانی ناردووە کە دینی ئیسلامە و خۆی تەنها بەو دینە ڕازیە، پاشتر دەفەرموێت: (وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا) هەرچی ترس و مەترسی هەیە لە سەریان بۆیان دەگۆڕێت بە ئاسایش و دڵنەوایی ئەم گۆڕینەش بۆچییە؟ بێگومان مەرجی لەسەرداناوە و دەبێت مەرجەکانی بەدیبهێنین مەرجەکەشی تەنها یەك شتە و زۆر ئاسانە کە دەفەرموێت:

( يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ) بەتەنهایی من، مەبەست خودا-یە بپەرستن و هیچ هاوەڵێکم بۆ دروست نەکەن، بەڵام ئەگەر مەرجەکە بەدینەهێنین ئەوا هەڕەشەی لەسەرکردووە و دەبێت لە هەڕەشەی خوای تاکو تەنها زۆر بترسین و نزیکی نەکەوینەوە کە دەفەرموێت: ( وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ) لەپاشاندا هەرکەسێك کوفر بکات ئەوە دەرچووە لە دینی خودا، بێگومان لەجیاتی پاداشت سزا وەردەگرێت والله أعلم.

سزاشەکەش زۆر سەختە وەکو لە ئایەتێکیتردا باسی دەکات و دەفەرموێت:
( أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ (٢٨) جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ الْقَرَارُ (٢٩) ابراهيم

واتا: ئەوانەی کە کوفریان کرد بەنیعمەتی خواو بوونە هۆکاری ئەوەی کە قەوم و گەلەکەیان بخەنە خانەیماڵوێرانیەوە.

هەروەها لە باسی بەنو ئیسرائیلیشدا باسی کردووە کە لە ئایەتێکدا هاتووە و دەفەرموێت: {سَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَمْ آتَيْنَاهُمْ مِنْ آيَةٍ بَيِّنَةٍ وَمَنْ يُبَدِّلْ نِعْمَةَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ} پرسیار لە نەوەکانی ئیسرائیل بکەن چەند ئایەت و نیشانەی ئاشکرا و ڕوونمان بەسەریاندا کە هەرکەسێك شوکرانەی نیعمەتی خوای گەورە نەکات پاش ئەوەی کە بۆیان ڕوونبووەوە کە ئەو شتانەی پێیان دەبەخشێت خوای گەورە لەسەر ئەو ناشوکریە و کوفری نیعمەتانە سزای زۆر سەختی هەیە و سزایان پێدەدات لەسەر کوفری نیعمەت، والله أعلم.

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە دەڵێت: کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە فەرموویەتی: سێ کەس لە بەنو ئیسرائیل یەکێکیان گەڕبووبوو، ئەویتریان کەچەڵ بوو، ئەویتریان کوێربوو، خوای گەورە ویستی وابوو کە تاقیان بکاتەوە مەلائیکەیەکی بۆ لایان نارد، چوو بۆ لای گەڕەکە ئەوەی کە پێستی وشك دەبووەوە و توشی گەڕی هاتبوو ووتی: خۆشترین شت لای تۆ چییە؟

ووتی: ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوان، ئەوەی کە خەڵکی منی پێ عەیبدار نەمێنێت، مەلائیکەکە دەستی بە گیانیدا هێنا و گەڕیەکەی هیچ پێوە

ئەما و چاك و جوان بووەوە، پاشان پرسیاری لێکرد حەزت لە چی ماڵ و سەروەتێکە.
ووتی: وشتر، وشترێکی ئاوسی پێدا.
مەلائیکەکە ووتی: خوای گەورە بەرەکەتی تێبکات بۆت.
پاشان هات بۆ لای کەچەڵەکە و ووتی: چی شتێك لای تۆ خۆشەویستە و حەزت لێیە؟
ووتی: قژە سەرێکی جوان، ئەوەی کە خەڵکی گاڵتەم پێدەکەن نەمێنێت، دەستی بەسەریا هێنا و قژێکی جوانی بۆ ڕواو پرسیاری لێکرد ووتی حەزت لە چی ماڵ وسەروەتێکە؟
ووتی: مانگا، مانگایەکی ئاوسی پێدا و ووتی: خوا بەرەکەتی تێبکات بۆت.
پاشان چوو بۆلای کوێرەکە و پرسیاری لێکرد حەز بە چی دەکەیت؟ ئەویش ووتی: حەزدەکەم خوا چاوم بۆ بگەڕێنێتەوە و خەلقی خوای پێ ببینم، ئەویش دەستی بەسەر چاویا هێنا و بینایی بۆ گەڕایەوە و پرسیاری لێکرد حەز بەچی ماڵ و سەروەتێك دەکەیت؟
ووتی: مەڕ، مەڕێکی ئاوسی پێدا.
پاشان لە بەروبوومی ئەو شتانەی کە دای پێیان ئەویان دۆڵێك وشتری هەبوو ئەویتریان دۆڵێك مانگای هەبوو ئەمیشیان دۆڵێك مەڕی هەبوو.
پاشان هات بە لای کابرای کە پێشتر گەڕبوو لەشێوەی پێشتری خۆیدا وەکو کابرایەکی گەڕ ووتی: کەسێکی فەقیرم و لێقەوماوم، پەکم کەوتووە لە سەفەرەکەم و لەڕێگام و ناگەمەوە شوێنی خۆم، داوات لێدەکەم بەو کەسەی کە ڕەنگی جوانی پێت بەخشیووە و پێستی جوانی داوە پێت و ماڵ و سەروەتی وشتری داوە پێت وشترێکم بدەرێ تاوەکو پێی بگەمەوە شوێن و جێگای خۆم.
وتی: خەڵکی فەقیر زۆرە.
مەلائیکەتەکە ووتی: وادەزانم ئەوناسم، ئەی تۆ گەڕ نەبویت خوای گەورە چاکتی کردەوە و ماڵ وسەروەتی پێبەخشی، ئەویش ووتی: نەخێر من ئەم ماڵ و سەروەتەم لە باوك و باپیرمەوە بۆ ماوەتەوە.
مەلائیکەتەکە ووتی: ئەگەر درۆ دەکەیت داوام لەخوا ئەوەیە کە بتگەڕێنێتەوە بۆ دۆخەکەی جارانت کە هیچت نەبوو گەڕبووی.
پاشان چوو بۆ لای کەچەڵەکە و لە شێوەی پێشووتری خۆیدا و هەمان شتی پێوت و داوایکرد کە یارمەتی بدات و ئەویش بەهەمان شێوە وەڵامی دایەوە، مەلائیکەتەکە وتی : ئەگەر درۆ دەکەیت ئەوا داوام لەخوا ئەوەیە کە بتگەڕێنێتەوە سەر دۆخی جارانت.
پاشان چوو بۆ لای کوێرەکە و لە شێوەی شێوەی پێشووتری و هەمان پرسیاری کرد، کە لە سەفەردام و ڕێگام بڕاوە و هیچم پێنەماوە، کەس ناناسم شتێکم بدەرێ تاوەکو بتوانم بگەمەوە ڕێگا و جێگای خۆم.

ئەویش ووتی: من کابرایەك بووم وەکو تۆ کوێر بووم، خوای گەورە بینایی پێم بەخشیەوە و ماڵ و سەروەتی پێمداوە، ئەوەی کە تۆ داوای دەکەیت، سوێند بەخوا لەدەستت نایگێڕمەوە و دەستت ناگرم چیت پێویستە و چی دەبەی بیبە لەپێناو خوای تاك و تەنهادا.

پاشان مەلائیکەتەکە ووتی: دەست بە ماڵەکەی خۆتەوە بگرە، خوای گەورە ویستی وابوو کە تاقیتان بکاتەوە و خۆت و هەردوو هاوڕێکەت، خوای گەورە لەتۆ ڕازیبوو لەهەردوو هاوڕێکەت تورەبوو. [٩]

---

[٩] عن ابي هريرة قال: انه سمع النبي يقول: ان ثلاثة من بني إسرائيل : ابرص واقرع واعمي، اراد الله ان يبتليهم فبعث اليهم ملكا، فاتى الابرص فقال:أي شيء احب اليك؟
قال: لون حسن، وجلد حسن، ويذهب عني الذي قد قذرني الناس، فمسحه فذهب عنه قذره، واعطي لونا حسنا.فقال: فاي المال احب اليك؟
فقال:الابل، فاعطى ناقة عشراء (أي حامل)
فقال:
بارك الله لك فيها.
فاتى الاقرع، فقال :
أي شيء احب اليك؟
قال: شيعر حسن، ويذهب عني هذا الذي قذرني الناس، فمسحه فذهب عنه، واعطى شيعرا حسنا.
قال: فاي المال احب اليك؟
٩ قال البقر، فاعطي بقرة حاملا: وقال بارك الله لك فيها.
فاتى الاعمى فقال: أي شيء احب اليك؟
قال: ان يرد الله بصري فابصر الناس فمسحه، فرد الله اليه بصره.
قال: فاي المال احب اليك؟
قال : الغنم، فاعطى شاة والدا، فانتج هذان، وولدان، فكان لهذا واد من الابل ولهذا واد من البقر، ولهذا واد من الغنم.
ثم انه اتى الابرص في صورته وهيئته، فقال:
رجل مسكين، قد انقطعت بي الجبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم الا بالله ثم بك، اسالك بالذي اعطاك اللون الحسن، والجلد الحسن، والمال، بعيرا اتبلغ به في سفري.
فقال : الحقوق كثيرة. قال كاني اعرفك، الم تكن ابرص يقذرك الناس؟فقيرا فاعطاك الله؟ فقال: انما ورثت هذا المال كابرا عن كابر.
(أي ابا عن جد .
فقال: ان كنت كاذبا فصيرك الله الى ما كنت.
واتى الاقرع في صورته وهيئته فقال له مثل ما قال لهذا، ورد عليه مثل ما رد هذا.
فقال: ان كنت كاذبا فصيرك الله الى ما كنت.
واتى الاعمى في صورته وهيئته فقال:
رجل مسكين، قد انقطعت بي الجبال في سفري، فلا بلاغ لي اليوم الا بالله ثم بك، اسالك بالله ثم بك، اسالك بالذي رد عليك بصرك شاة اتبلغ به في سفري؟

هەروەکو شاعیری کوردی وتوویەتی:

مەڵێ فەقیرم کوفری نیعمەتە ... لەش ساغی بۆ تۆ موڵك و سەروەتە

باخۆمان بپارێزین لە کوفری نیعمەت و ناشکوری کردنی خوای گەورە و هەست بە نیعمەتەکانی بکەین بەسەرمانەوە، کە خاك و شوێنی نیشتەجێبوونمانی کردۆتە ئەم خاکە موبارەکەوە، ئاسایش و دڵنەوایی پێمان بەخشیووە و ڕزق و ڕۆزوی باش و پاکی پێماندواوە و نیعمەتی ئەوەندە بەسەرمانەوەیە کە لە ژمارە نایەت، دەبێت دەستی پێوەبگرین و قەدری بزانین و ئاگاداربین وەکو گەلانی پێشووترمان لێنەیەت کە گەورە و دەستەڵاتدارەکانیان بوون بەهۆکاری ئەوەی کە توشی کوفرکردن و ناشوکری ببن، هەروەکو ئێستا زۆرێك هەیە کە لەسەر ئەم هەموو نازو نیعمەتانەی کە خوای گەورە پێمانی بەخشیووە کوفر دەکەن و بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدان کە خەڵکەکەش توشی کوفربن و ناشوکری خوابکەن، نابێت بەوانە ڕازیبین و دەبێت پێمان ناخۆش بێت و خۆمان لەوانە بەری بکەین و هەوڵیش بدەین کە ئەوانە واز لەو کوفر و خراپەکاریە بهێنن، تاوەکو ئیمەش بە ئاگری ئەوانەوە نەسوتێین و پۆشاکی برسێتی و ترس نەدرێت بەسەرماندا، هەروەکو خوای گەورە لەو بەڵا و موسیبەتانە ڕزگارمانی کردووە کە سەردەمانێك هەبوو کورد لە سێبەرەکەی خۆیشی دەترسا و گومانی ناپاکی لێهەبوو سەردەمانێك بەسەرماندا هاتووە کە خەڵکی هەرچی هەبوو دەیفرۆشت بۆ ئەوەی بژێوی ماڵ و منداڵەکانی بەدەست بهێنێت و لەبرسێتی ڕزگاری ببێت.

ئەگەر بمانەوێت شوکرانە بژێری خوای گەورەبین دەبێت بەردەوام لە بەندایەتی کردندابین بۆ خوای تاك و تەنها و هاوەڵی بۆ پڕیارنەدەین و شوکرانە بژێری نیعمەتەکانیبین بەدڵ و بەگیان، بێگومان شتێکی زۆر گرنگم بیرکەوتەوە کە نیعمەت تەنها بە خواردن و پۆشاك و ماڵ و سامان لێکنەدەینەوە، بێگومان هەرچی لەژیاندا هەیە هەمووی نیعمەتی خودای گەورەیە بۆ مرۆڤەکان، ژیانمان چۆن هەڵدەسورێت بە چواردەورەکەمانەوە هەمووی نیعمەتی خوای گەورەیە بەسەرمانەوە نابێت ناشوکوری نیعمەتەکانی بکەین.

یەکێك لە نیعمەتە گەورەکانی خوای گەورە کە بەبەرچاومانەوە دیارە و هەستی پێناکەین ئەوەیە کە خودای گەورە ئەم ژیانە خۆش و جوانەی پێبەخشیوین بەهۆی ئەوەی کە موشکیلە و نەهامەتی و بەڵا و موسیبەت زۆربووە ئەوە بەنیعمەت نازانین، بەڵکو هەندێك هەن لەوانەیە بە نیقمەتیشی بزانن و ئەوەش خۆی لە خۆیدا کوفری نیعمەتە و دەبێت قەدری ئەو نیعمەتە

---

فقال: قد كنت اعمى فرد الله الي بصري، فخذ ما شئت ودع ما شئت، فوالله لا اجهدك (لا اشق عليك في رد شيء تطلبه مني) اليوم بشيء اخذته لله عز وجل.
فقال : امسك مالك، فانما ابتليتم، فقد رضي الله عنك، وسخط على صاحبيك"

گەورەیە بگرین کە خوای گەورە تەمەنێکی پێمان بەخشیووە تاوەکو کار و کردەوەی جوانی تیا ئەنجامبدەین و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی تیادا بکەین.
خاڵێکیتر لە نیعمەتەکانی خوای گەورە ئەوەیە کە هەستی پێناکەین، برادەر و هاوڕێی چاك کاتێك خوای گەورە فەزڵێکمان پێدەبەخشێت بەهەر جۆرێك لە جۆرەکان بێت و کۆمەڵێك خەڵکی باش و چاك و دڵسۆزمان بۆ دەڕەخسێنێت، دەبن بە برا و دۆست و کەس و هاوڕێ و هاوسێمان ئامادەن کە بەهەموو جۆرێك هاوکارمانبن و دڵسۆزمانبن و یاریدەدەرمانبن، ئەوەش نیعمەتێکی زۆر گەورەیە و نابێت بەئاسانی لەدەستی بدەین، دەبێت قەدریان بگرین و لەگەڵ هەست و نەست و ئازارەکانیاندا بەشداربین، کەسی وا هەیە کە ئەگەر یەك هەڵە یاخود هەڵسوکەوتێك بەدڵی ئەو نەبێت و لە قسەی ئەودا نەبێت یان بەگوێرەی هەواو ئارەزووی ئەو نەبێت سەدو هەشتا پلە دەگەڕێتەوە بەرەو دواوە و هەموو دۆستایەتی و برایەتی و کەسایەتی ئەو کەسە زەڕبی سفر دەکات و هیچی پێوە ناهێڵێت و بەڵکو نەك تەنها واز لە دۆستایەتی دەهێنێت تەنانەت دوژمنایەتیشی دەکات و دەیگەیەنێتە ئەو پەڕی دوژمنایەتی، بەڵکو کەسی وا هەیە کە نەك تەنها دژایەتی دەکات بەڵکو دەکەوێتە ئەوەی کە زمان درێژیش دەکات بەسەر ناموسیەوە و بوهتانی زۆر ناشیاوی بۆ هەڵدەبەستێت و دەست دەکات بە جنێودان و قسەی ناشرین، لەم بارەیەوەش ئەو کەسانە ئاگادار دەکەینەوە کە لە چەند فەرمودەدا هاتووە.[١٠]

جا ئەگەر بیری لێبکەینەوە کە خوای گەورە ئەو نیعمەتە پیرۆزەی پێبەخشیوین ئێمە هەستین بیکەین بە نیقمەتێك و بەڵکو دژایەتیشی بکەین و بەوەشەوە نەوەستین کە جنێوی ناشرینی پێبدەین و بوهتانی بۆ دروست بکەین، توخوا ئەمە چەندجار دەکاتە کوفری نیعمەت و چەند بە پێچەوانەی نیعمەتەوە دەوەستینەوە و لەگەڵ ئەوەشدا چەند جار توشی ئەو کوفرە گەورەیە هاتوین و (ربا) سوترین سومان ئەنجامداوە و سوش دەزانین کە چەند تاوانە و وەکو لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە درهەمێکی سوو بەقەدەر ئەوە تاوانە کە زینا لەگەڵ دایکی خۆیدا بکات خوای گەورە پەنامان بدات یارب ، قال رسول ( الربا سبعون حوبا أيسرها أن ينكح الرجل أمه )) * حديث صحيح.

---

١٠ حدثنا ابن المنادي ، نا يحيى بن معين ، نا أبو اليمان ، عن شعيب بن أبي حمزة ، عن ابن أبي حسين ، عن نوفل بن مساحق ، عن سعيد بن زيد ، أن النبي  قال : « أربى الربا شتم الأعراض»
أربى الربا شتم الأعراض هذه اللفظة صححها الألباني(١) واتا : سوترین سوو جنێودانە بە ناموسی یەکتری.

واتا : سوو حەفتا بەشە، کەمەکەیان ئەوەیە کە پیاو لەگەڵ دایکی خۆیدا زینا بکات.
جا توخوا تاکەی بیر لەم شتانە نەکەینەوە و ئەم هەموو تاوانانە بەئاسان بزانین و گوێی پێنەدەین ئەوەش تەنها لەبەر ئەوەی کە ڕقمان لە کەسێکە هەستاوە و خۆشمان نازانین بۆچی، ئەگەر پرسیاریشمان لێبکەن ئەوا چەندین بیانووی نابەجێ دەهێنینەوە و بەڵکو خۆشمان بەهەق دەزانین و ئەو بەناهەق، لەکاتێکدا بەڵگەکان هەمووی بەسەر خۆماندا دەشکێتەوە و خۆمانی پێ تاوانبار دەکەین و خۆمان ماڵ وێران دەبین لە هەموو ڕوویەکەوە .
کەواتە باهەندێك بیربکەینەوە و بزانین کە کاروکردەوەکانمان چۆنە و بەرەو کوێمان دەبات و بائاگاداری ئەوەبین کە نەکەوینە ناو کوفری نیعمەتەوە و بەڵکو چەندین تاوانیتر بۆ خۆمان دروستبکەین و بەلاشمانەوە ئاسایی بێت، هەڕەشەکەی خوای گەورەمان بیرنەچێت کە ئەوەی کوفری نیعمەت بکات خوای گەورە پۆشاکی ترس و برسێتی دەپۆشێت بەسەریدا هەروەکو ڕۆژانە لە ژیانی خۆماندا کەم تا زۆر دەیبینینەوە و هەستی پێدەکەین، بەڵام عیبرەتی لێ وەرناگرین.
خوای گەورە بەڕەحمی خۆی ڕەحمان پێبکات و لەو کردار و تاوانانە بمانپارێزێت و توشی کوفری نیعمەتمان نەکات و بەدوورمانخات و بەرگ و پۆشاکی برسێتی و ترسمان نەدا بەسەردا و لە تاوانەکانمان ببوورێت و لێمان خۆش بێت، انه ولي ذلك والقدر عليه.

به پایان هات ئەم کتێبەش، بەڵام ڕووداوەکان بەردەوامن!

# پێرست